چاپی دووەم

# شرحی ابن عقیل

## بە کوردی

لەگەڵ لێکدانەوەو إعراب کردنی سەرجەم دەقەکانی قورئان و فەرمودەکان، و ڕاڤەکردنی سەرجەم دێرەکانی ئەلفیە بە کوردی

بەرگی دووەم

لەبابەتی (کان واخواتها) تا (المنصوبات)

ئامادەکردنی

سەریەست جەباری

# شرح ابن عقيل

# بە کوردی

لەگەڵ لێکدانەوە و إعراب کردنی سەرجەم دەقەکانی قورئان و فەرمودەکان ، و ڕاڤەکردنی سەرجەم دێرەکانی ئەلفیە بە کوردی

بەرگی دووەم

لە بابەتی (کان أخواتها) تا (المنصوبات)

ئامادەکردنی

سەربەست جەباری


ساڵی ١٤٣٤ك چاپی یەکەم ٢٠١٣ز

# شرحي ابن عقيل به كوردي

ئامادەكردنی : سەربەست جەباری

تیراژ: ١٠٠٠ دانه

چاپخانەی : ڕێ نوێ

ژمارەی سپاردن : لـە بەڕێوبەرایـەتی كتێبخانـە گـشتییەكان ژمـارەی سپاردنی ( ١٢٤٤ ) ی ساڵی ( ٢٠١٢ ) ی پێدراوە.

## نواسخ الابتداء [1]

## كان وأخواتها [2]

١٤٣-تَرْفَعُ كَانَ الْمُبْتَدَا اسْمًا، وَالْخَبَرْ تَنْصِبُـهُ كَـكَانَ سَيِّدًا عُمَـرْ

١٤٤-كَكَانَ ظَلَّ بَاتَ أَضْحَى أَصْبَحَا أَمْسَى وَصَارَ لَيْسَ زَالَ بَرِحَا

١٤٥-فَتِئَ وَانْفَكَّ، وَهَذِي الأَرْبَعَهْ لِشِبْهِ نَفْيٍ أَوْ لِنَفْيٍ مُتْبَعَهْ

١٤٦- وَمِثْلُ كَانَ دَامَ مَسْبُوقًا بِـ ((مَا)) كَأَعْطِ مَا دُمْتَ مُصِيبًا دِرْهَمَا [3]

---

[1] زانایانی نحو عادەتیان وایە دوای باسکردنی بابەتی مبتداو خبر باسی بابەتی (نواسخ الابتداء)دەکەن واتا ئەو شتانەی دەچنە سەر جملەی اسمی و مبتدا لادەبەن ، بویە پێیان دەوترێت نواسخ چونکە مبتداکە لادەدەن ،ووشەی نواسخ کۆ(جمع)ی (ناسخ)ەوبەواتای لابەر وهەڵگر دێت ،واتا ئەم شتانە مبتدا هەڵدەگرن ونایهێڵن،جا لە رێزمانی زمانی عەرەبیدا نواسخ شەشن کە ئەمانەن : (كان واخواتها ،إنّ واخواتها ، كادواخواتها،لاالنافيه للجنس ،ليس واخواتها،ظنّ واخواتها).

[2] لە زمانی عەرەبیدا فعل چەند دابەشبوونێکی هەیە،یەکێکیان بریتیە لە دابەش بوون بۆ:فعلی تەواو(التام)،وفعلی ناتەواو(الناقص)،جا هۆی ناونانی ئەم فعلانە بە ناتەواو دووشتە:أ-لە بەر ئەوەی بەتەنهالەگەڵ مرفوعەکەیدا مانا نادات بەڵکو پێویستی بە ناوێکی تریشە- کە خبرەکەیە -بۆ تەواو کردنی ماناکەی. ب-ئەوەیە کە ئەم فعلانە تەنها دەلالەت لەسەر کات (الزمن)دەکەن ،بەپێچەوانەی فعلی تەواو کە دەلالەت لەسەر کات ورووداو(الزمن والحدث) دەکەن . وە ووشەی (أخوات)واتا هاوشێوە .

[3] مانای ئەم چوار دێرەی ئەلفیە بەم شێوەیە:١٤٣- كان مرفوع دەکات مبتدا و دەیکاتە اسمی خۆی،وە خبریش منصوب دەکات،وەکو نموونەی عمر گەورەوسەرداربوو،ئەم رستەیەوهاوشێوەکانی بەم شێوەیەإعراب دەکرێن:كان:فعل ماضي ناقص.عمرُ:اسم كان مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة.سيّدا:خبر كان منصوب وعلامة نصبة الفتحة الظاهرة . ١٤٤-وەکو كان وایە ئەم فعلانەش (ظلّ،بات،أضحى،أصبح،امسى،صار،ليس،زال،برحَ..).١٤٥-فتئ ،انفكّ،جا ئەم چوارە،واتا(زال وبرح وفتئ وانفكّ)دەبێت بێن بەدوای نفی یان هاوێنەی نفی دا.-

کاتێك لێبۆیەوە دانەر لەباسی مبتداوخبر دەستی کرد بە باسکردنی نواسخی مبتدا ،نواسخیش دوو جۆرە:هەندێکیان فعلن،وە هەندێکیان حەرفن.فعلەکان بریتین لە:کان وهاوشێوەکانی،وئەفعالی مقاربە،وظنّ وهاوشێوەکانی.[1] حەرفەکانیش:(ما)وهاوشێوەکانی،(لا)ی نافیە للجنس،وانّ وهاوشێوەکانی .

جا دانەر دەستی کرد بەباسکردنی کان وهاوشێوەکانی،کە هەموویان فعلن بە یەکدەنگی زانایان،جگە لە( لیس)[2]،زۆربەی زانایان پێیان وایە فعلە ، بەڵام شێخی فارسی–لەیەکێك لە دوو بۆچوونەکەیدا_وهەروەها أبو بكری کوڕی شُقَیریش پێیان وایە کە( لیس)حرفەوفعل نیە.

جا ئەم فعلانە[3]مرفوع دەکەن مبتدا،ومنصوبیش دەکەن خبر ،جا مرفوع کراو دەبێتە ناویان،ومنصوبەکەش دەبێتە خبریان.

هەروەها ئەم فعلانە دەبنە دوو جۆر:هەندێکیان ئەم عملە[4] دەکەن بەبێ مەرج،ئەوانیش بریتین لە:کان، وظلّ،وبات ،وأضحى،وأصبح، وأمسى، وصار،ولیس. وەهەندێکیان ئەم عملە نا کەن بە مەرج نەبێت ،ئەمانیش دوو جۆرن :*یەکێکیان* مەرجە بۆ عمل کردنیان نفی لە پێشیانەوە بێت( لفظا)یان (تقدیرا)[5]،یان هاوێنەی نفی[6] لە پێشیانەوە بێت، ئەوانیش چوارن :

---

-١٤٦-هەروەها وەکو کان وایە فعلی ( دام)بە مەرجێك لەپێشێوە بێت (ما)ی مصدری ،وەکوببەخشە مادام بووی بەخاوەن درهەم .

[1] دواتر لە باسەکانی داهاتوودا ،باسی ئەم بابەتانە دەکەین .إنشاالله .

[2] واتا:ئەفعالی ناقصە هەموویان فعلن جگە لە لیس کە زانایان خلافیان هەیە دەربارەی ئەوەی کە فعلە یان حرفە وەکو باسی دەکەین إنشا الله.

[3] مەبەست افعالی ناقصەیە(کان واخواتها).

[4] واتا:مرفوع کردنی مبتداومنصوب کردنی خبر.

[5] مەبەست لە (لفظا)ئەوەیە کە دەنوسرێت ودەخوێنرێتەوە.بەپێچەوانەی (تقدیرا).

[6] مەبەست لە هاوێنەی نفی نهی و دوعایە.

زال،وبرح،وفتئ،وانفكّ،جا نموونەی نفی لە پێشەوە بوون بە( لفظا):(مازال زید قائما)[1]،وەنموومەی نفی بە تقدیری فەرموودەی خوای گەورە﴿قالوا تالله تفتؤ تذکریوسف﴾[2]واتا:لاتفتأ[3]).جا دروست نیە ئەم نفیە حذف کرێت بە پێی یاسا مەگەر لە دوای سوێندەوە وەکو ئایەتە پیرۆزەکە(٤)،وە هاتووە حذف کردنی بەبێ سوێند وەکو ووتەی شاعیر:

ش٦٠/ وَأَبْرَحُ مَا أَدَامَ اللهُ قَوْمِي    بِحَمْدِ اللهِ مُنْتَطِقًا مُجِيدًا.[5]

واتا :بەردەوام سوارچاك دەبم وسەخی دەبم،مادام خوای گەورە گەلەکەم بۆ بهێڵێت،مەبە ستی ئەوەیە بەردەوام بێنیازە تا گەلەکەی مابێت،ئەمەش

---

[1] إعرابی تەواوی ئم ڕستەیە:مازال:فعل ماضي ناقص. زید:اسم مازال مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة . قائما:خبر مازال منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة.

[2] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە (٨٥)سورەتی یوسف.کورتەی ماناکەی:ووتیان-کوڕەکانی یعقوب_سوێندبەخوا وازناهێنی هەریری یوسف دەکەیتەوە....إعرابیەکەشی بەم شێوەیە:قالوا:فعل ماضي مبني علی الضم. وواوالجماعة:ضمیر متصل مبني في محل رفع فاعل . تالله:ت:حرف جرللقسم .الله:اسم مجرور. تفتؤ:فعل ماضي ناقص.واسمه ضمیر مستتر تقدیره(انت). تذکرُ:فعل مضارع مرفوع .وفاعله ضمیر مستتر تقدیره (انت). یوسفَ:مفعول به منصوب ، والجملة الفعلیة(تذکر یوسف)في محل نصب خبر تفتؤ.لەم ئایەتە پیرۆزەدا (تفتؤ)کە مضارعی فتئ یە بەکار هاتووە ونفی لەپێشەوە نیە بە لفظ بەلاَم بە مقدری نفی لێیە وتقدیرەکەش (لاتفتؤ)ە.

[3] واتا:(لا)یەکی نافیە مقدرە .

[4] مەبەست ئایەتی ژمارە ٨٥ی سورەتی یوسفە کە باسکرا.

[5] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:بەردەوام بە چاکی دەمێنمەوەوباسی چاکەی گەلەکەم دەکەم وستایشیان دەکەم وهەمیشە قسەی چاك دەکەم،تا خوای گەورە قەوم وگەلەکەم بۆ بهێڵێت.. بەلگەکەی :ووتەی (ابرح)کە مضارعی (برح)یە،بێ ئەوەی نفی یان هاوونەی نفی لە پێشێوە بێت،لەکاتێکدا سوێند(القسم)یش لەپێشێوە نەهاتووە .

جوانترین مانیە بۆ ئەم دێڕە.[١].هەروەها نموونەی هاووێنەی نفی _کە مەبەست (نهی)ە_وەکو (لاتزل قائمًا)[٢]،وە وەکو ووتەی:

ش٦١/.صَاحِ شَمِّرْ وَلاَ تَزَلْ ذَاكِرَالْمَو تِ فَنِسْيَانُهُ ضَلاَلٌ مُبِينُ. [٣]

وە نموونەی دوعا[٤] وەکە:(لايزال اللهُ مُحسنا إليك )[٥].وە وەکو ووتەی شاعر:

ش٦٢/أَلاَ يَا اسْلَمِي يا دَارَ مَيَّ عَلَى الْبِلَى وَلاَ زَالَ مُنْهَلاً بِجَرْعَائِكِ الْقَطْرُ [٦].

جا ئەمە بوو دانەرئاماژەی بۆ کرد بەووتەی:(وهذه الاربعة_ تا کۆتای دێڕەکە).

جۆری دووەم:مەرجە بۆ عمل کردنیان کە (ما)ی مصدری ظرفي[٧] لە پێشێوە بێت،ئەویش بریتیە لە فعلی (دام)،وەکو:(أعطِ مادُمتَ مُصيبا

---

[١] مەبەستی ابن عقیل ئەوەیە ئەم دێڕە شعرە بە چەند شێوەیەك مانا کراوە،چونکە ووشەی(منتطفا)و(مُجیدا) چەند مانایەکیان هەیەلەڕووی زمانەوانیەوە.

[٢]إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە/ لا:ناهیە جازمە. تزل:فعل مضارع (ناقص)مجزوم وعلامة جزمه السكون ،واسمه ضمیر مستتر تقدیره (أنت). قائما: خبر لاتزل منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئەی برا هەوڵدەو تێبکۆشە،هەمیشە بیری مردنت هەبێت ،چونکە لەبیرکردنی مردن گومڕاییەکی ئاشکرایە. بەڵگەکەی:(ولاتزل ذاكر الموت ) لێرەدا تزل مضارعي( زال)یەو نهی لەپێشەوە هاتووە.

[٤] کە ئەویش هاو وێنەی نفیە.

[٥] إعرابی تەواوی ئە ڕستەیە بەم شێوەیە/ لا:نافية غير عاملة.يزال:فعل مضارع (ناقص)مرفوع . الله:اسم يزال مرفوع .محسنا:خبر يزال منصوب .

[٦]یاخوا سەلامەت بیّ ولاّتی خۆشەویستەکەم ودوور بیت لەهەموو تیاچوونێك، بەردەوام بارانی رەحمەت بڕژیّ بەسەریدا. بەڵگەکەی: (ولا زال )عەملی کردووە لەبەر ئەوەی دوعای لەپێشەوە هاتووە.

[٧] مەبەست لە (ما)ی مصدری ئەوەیە کە لەگەڵ دوای خۆیدا دەکرێتە مصدرێك، وە مەبەست لە ظرفي ئەوەیە کە بۆ (ماوە وکات) بەکار دێت.وەکو لەنموونەکاندا ڕوون دەبێتەوە.

درهما)[١]،واتا:ببەخشە ماوەی ئەوەی خاوەن درهەمی.وەوەکو فەرمودەی خوای گەورە﴿وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا﴾[٢]،واتا:کات وماوەی زیندوو بوونم.

جا مانای [٣]ظلّ:وەصفکردنی خبر لێدراوە[٤] بە خبرەکە لە ڕۆژدا [٥]،وە مانای باتَ :وەصفکردنی خبر لێدراوە بەخبرەکە لە شەودا،واضحی: وەصفکردنی خبر لێدراوە بە خبر لە چێشتەنگاودا، وأصبح : وەصفکردنێتی لە بەیانیاندا، وامسی :وەصفکردنێتی لە ئێواراندا، وە مانای صارَ :گواستنە وەیە لە صیفە تێکەوە بۆ صیفە تێکی تر ،وە مانای لیس:نەفی کردنە ،جا لیس ئەگەر بە ڕەها(مطلق)ی بە کار بێت ئەوە بۆ نەفی

---

[١] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە/ اعطِ: فعل امر مبني على حذف حرف العلة. وفاعله ضمير مستتر تقديره أنت. ما:مصدرية ظرفية .دُمتَ:دُم:فعل ماضي ناقص مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك. تَ:ضمير متصل مبني في محل رفع اسم دام. مصيبا: خبر دام منصوب. درهما:مفعول به ثان ل(أعط)،ومفعوله الاول محذوف.

[٢]ئایەتی ژمارە ٣١ی سورەی مریم، کورتەی ماناکەی:{....-پێغەمبەر عیسی فەرمووی- خوای گەورە فەرمانی پێداوم بە نوێژکردن وبە زەکات دان هەتا لە ژیاندام وزیندووم.}.

اعرابەکەشی بەم شێوەیە/ و:حرف عطف. اوصاني:فعل ماضي مبني على الفتحة المقدرة على الالف منع من ظهورها التعذر .ن: نون الوقلية. ي:ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. وفاعله ضمير مستتر تقديره هو. بالصلاة:جارومجرور متعلقان بالفعل أوصى. والزكاة :معطوفة على الصلاة مجرورة مثلها. مادُمتُ: فعل ماضي ناقص،والتاء اسمها . حيّاً:خبر مادام منصوب.

[٣] لێرەوە ابن عقیل دێتە سەر مانای فعلە ناقصەکان.

[٤] خبر لێدراو واتا: مبتداکە

[٥] ئەمە ئەگەر ظلّ فعلی ناقص بێت ،بەڵام ئەگەر فعلی تام بێت ئەوە بە مانای مانەوە بە ڕۆژ دێت.

کردنی حاله ،وەکو:((لیس زیدٌ قائماً))واتا:ئێستا به پێوه نیه. به لأم ئەگەر کاتی لە گەڵدا باس کرێت ئەوه به پێی کاتەکەیەتی ،وەکو:(لیس زیدٌ قائماًغداً). وەمانای مازال و هاووێنەکانی[1] :بەردەوامبوون وپەیوەست بوونی خبرەکەیە بە خبر لێدراو بە پێی حاڵەتەکە وەکو:(مازالَ زیدٌ ضاحکاً،ومازالَ عمروٌ أزرق العینینِ) وەمانای دام:بەردەوام بوون ومانەوه .

١٤٧– وَغَیْرُ مَاضٍ مِثْلَهُ قَدْ عَمِلاَ إِنْ کَانَ غَیْرُ الْمَاضِ مِنْه اسْتُعْمِلاَ.[2]

ئەم فعلانە [3] دوو جۆرن:جۆرێکیان گۆڕانکاری دێتە سەریان[4] ودەست کاری دەکرێن،ئەوانیش جگه لە (لیس و دام )ن.

جۆری دووەم:ئەوانەن کە نەگۆڕن ودەسکاری ناکرێن،ئەوانیش بریتین لە(لیس ودام)[5]،جا دانەر ئاگاداری کردینەوه بەم دێڕه لەوەی ئەم فعلانە ئەوانەیان کە (متصرف)ن غەیری ماضیەکەشیان هە مان عملی ماضیيەکە دەکەن ،ئەوانیش بریتین لە فعلی مضارع،وەکو:(یکونُ زیدٌ قائماً)،خوای گەورە دەفەرمێ:﴿ویکونَ الرسولُ علیکمْ شهیداً﴾[6]،وەئەمر وەکو

---

[1] مەبەست لە هاو وێنە کانی {ما برح،مافتئ،ما انفك}

[2] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە بەکورتی بەم شێوەیە:جگە لە ماضي لەم فعلە ناقصانە وەکو ماضي عمل دەکەن.ئەگەر غەیری ماضیان هەبوو.

[3] واتا:ئەفعالی ناقصە.

[4] مەبەست لە گۆڕانکاری ئەوەیە بکرێنە مضارع وامرو اسمی فاعل واسمی مفعول و......هتد.واتا( متصرف)ن.

[5] واتا:لیس و دام فعلی جامد(نەگۆڕ)ن .تەنها ماضییان هەیە .

[6] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە ١٤٣ی سورەتی البقرە .کورتەی ماناکەی:{....وە پێغەمبەریش چاودێر بێت بەسەر ئێوەوە...} . إعرابەکەشی بەم شێوەیە/ یکونَ:فعل مضارع ناقص،منصوب لانه معطوف علی فعل منصوب قبله .الرسولُ:اسم یکون مرفوع. علیکم:جارومجرورمتعلقان بخبر یکون. شهیداً:خبر یکون منصوب. الشاهد في هذه الآية:عمل مضارع من( کان) عمل ماضیه.

﴿كُونُواْ قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ﴾[1]،هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت :﴿قُلْ كُونُوا حِجَارَةً أَوْ حَدِيداً﴾[2]،وە اسمی فاعل وەکو:(زيدٌ كائنٌ أخاكَ)[3]، هەروەها شاعر دەڵێت:

٦٣ش/وَمَا كُلُّ مَنْ يُبْدِي الْبَشَاشَةَ كَائِنًا أَخَاكَ إِذَا لَمْ تُلْفِهِ لَكَ مُنْجِدَا.[4]

هەروەها مصدەریش وایە [5]،جا زانایان خلافیان هەیە لە فعلی (كان)ی ناتەواو:ئایە مصدری هەیە یان نا؟ڕای ڕاست وتەواو ئەوەیە کە مصدری هەیە،وەکو ووتەی شاعر:

٦٤/ببذْلٍ وحِلْمٍ سادَ في قومه الفتى وكونُكَ إيّاهُ عليكَ يسيرُ.[6]

---

[1] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە١٣٥ی سورەتی( النساء)یە،کورتەی ماناکەی {:بەردەوام زۆر دادگەر بن...} .إعرابەکەشی بەم شێوەیە/ كونوا:فعل امرناقص من (كان) مبني على حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة. واوالجماعة في محل رفع فاعل. قوّامين:خبر (كونوا) منصوب وعلامة نصبه الياء لانه جمع مذكر السالم. بالقسط:جارومجرور متعلقان ب(قوّامين). الشاهد فيها:عمل الأمر من (كان)عمل ماضيه.

[2] ئایەتی ژمارە(٥٠) ی سورەتی (الاسراء)یە،کورتەی ماناکەی {-ئەی ﷺ پێیان بڵێ-ئێوەبن بە بەرد یان ئاسن ..}. إعرابەکەی / قل:فعل امر مبنى على السكون . وفاعله ضمير مستتر تقديره (انت). كونوا:فعل امر ناقص مبني على حذف النون لانه من الافعل الخمسة. وواو الجماعة في محل رفع فاعل. حجارة:خبر كونوا منصوب. أو:حرف عطف. حديدا:اسم معطوف منصوب .الشاهد في هذه الآية مثل التي قبلها.

[3] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە: زيدٌ:مبتد مرفوع. كائنٌ:خبر مرفوع،واسمه ضمير مستتر تقديره (هو). أخاك: خبر (كائن) منصوب وعلامة نصبه الالف لانه من الأسماء الخمسة.

[4] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە:ئەو کەسەی ڕووخۆشیت نیشان دەدات براو دۆستی تۆ نیە ،ئەگەر لەتەنگانەدا فریات نەکەوێت. بەڵگەکەی: عمل كردنی اسمی فاعلی (كان)یە کە بریتیە لە (كائن)،اسمێکی نادیاری هەیەو خبرەکەشی (أخاك)یە.

[5] واتا: مصدریش هەمان عملی فعلەکەی دەکات.

[6]ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: هەموو کەسێك بە هۆی ماڵ بەخشین ولەسەر خۆی وهێدیی دەبێتە سەرگەورەی گەلەکەی،ئەمەش بۆتۆ ئاسانە ئەگەر بتەوێت. بەڵگەکەی: ووتەی-

وه ئەوانـــەی دەســـكاری نـــاكرێن ونـــەگۆر(غیرمتـــصرف)ن_بـــریتین لـــە دام ولـــیس_،وەئەوانـــەی كەمـــەرجن نفـــی یـــان هاووێنـــەی نفـــی لەپێـــشیانەوە بێت_كەبریتی بوون لە فعلی زال وهاووێنەكانی[1]_فعلی ئەمر و مصدریان نیە.

١٤٨-وَفِي جَمِيعِهَا تَوَسُّطَ الْخَبَرْ أَجِــزْ وَكُلٌّ سَبْقَهُ دَامَ حَظَرْ.[2]

مەبەستی دانـەر ئەوەیـە كـەخبری ئـەم فعلانـە[3]_ئەگـەر واجـب نـەبێت پێـشكەوتنیان بەسـەرناوەكانیاندا،وەدواكـەوتنیان لێیـان_ئـەوە دروسـتە بكەونە نێوان فعلەكەو ناوەكە،جانموونەی پێشكەوتنییان بەسەر ناوەكەدا بەواجبی:(كان في الدار صاحبها)[4]،لێرەدا دروست نیە پێشكەوتنی ناوەكە بەسـەر خبرەكـەدا،بـۆ ئـەوەی نەگەڕێتـەوە جێناوەكـە[5]بـۆ شـتێك كـە دواكەوتووە لە لفظ وپلەدا[6]،وەنموونەی واجب بوونی دواكەوتنی خبر لە ناوەكەی:(كان أخي رفيقي)لێرەدا دروست نیە پێشكەوتنی رفيقي_وبكرێتە

---

= (وكونك إياهُ)ووشەی (كون) مـصدری فعلـی (كـان)یەوهـەمان عەمـەلی فعلەكـەی كـردووە،اسمێكـی مرفـوع كـردووە كـە بریتیـە لـە جێنـاوی(ك)،وخەبـەرێكی منـصوب كردووە كەبریتیە لە جێناوی(إياهُ).

[1] واتا: برح وفتئ وما انفك .

[2] مانی ئەم دێرەی ئەلفیە بەم شێوەیە: هـەمموو ئەو فعلانەی باسكران _واتا كان وأخواتها_دروستە خبرەكەیان بێتە نێوان فعلەكەو اسمەكەی،وەهەمموو زانایانی نحو رێگەیان نەداوە خبری دام پێشی كەوێت.

[3]مەبەست (كان وأخواتها )یە.

[4] إعرابـی تـەواوی ئـەم ڕسـتەیەبەم شـێوەیە: كـان:فعـل ماضـي نـاقص .في الدار:جارومجرور متعلقان بمحذوف خبرمقدم وجوبا. صاحبُ:اسم كان مؤخر مرفوع. وهو مضاف .ها:ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه.

[5] واتا:جێناوی لكاو بە ووشەی (صاحبها).

[6] پێشتر لە شەرحی دێری ١٢٣ی ئەلفیەدا باس ئەم بابەتەمان كرد.

خـبر_چـونکە نازانرێـت کـەخبرە،لەبـەر ئـەوەی إعرابەکـەی ئاشـکراودیار نیە[1]،وەنموونەی خبر کەوتنە نێوان فعل واسمەکە:(کان قائماً زیدٌ)،خوای گـەورە دەفـەرموێت :﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾[2]،هـەروەها هـەموو فعلـەکانی تـریش بـەم شـێوەیەن_ئەوانـەی (متـصرف)ن،یـان متـصرف نـین_دروسـتە خبرەکـەیان پێـشکەوێت بـەو مەرجـەی باسـکرابێ،هـەروەها خـاوەنی کتـێبی (الارشـاد)[3]باسـی خـلاف زانایـانی کـردووە دەربـارەی دروسـتێتی پێـشکەوتنی خـبری( لـیس)بەسـەر اسمەکەیـدا،وەڕای بـەهێز ئەوەی دروستە،وەکو شاعر دەڵێ:

ش٦٥/ سَلِي إنْ جَهِلْتِ النَّاسَ عَنَّا وعَنْهُمُ   فَلَيْسَ سَــــوَاءً عَالِمٌ وَجَهُولُ.[4]

هـەروەها (ابن معط)باسـی ئـەوەی کردووە کـە خـبری (دام)پـێش اسمەکـەی ناکەوێت،وناڵێیت:(لاأُصاحبكَ مادام قائماً زيدٌ) بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە کە دروستە، شاعریش دەڵێت:

---

[1] چونکە ناوی رفیقی واخـی هەردووکیان کۆتاییـان حـەرفی بزوێن(علە)یەوإعرابیان بەمقدر(نادیاری) دەکرێت.

[2] ئەم ڕستەیە بەشێکە لـە ئایـەتی ژمارە(٤٧)ی سورەتی (الـروم). کورتـەی ماناکـەی {خۆسەرخستن ویارمەتی دانی بڕواداران مافێکە لەسـەر خۆمـان پێویستمان کـردووە بۆیان} .إعرابەکەشی بەم شێوەیە/ و:حسب ماقبله. كان:فعل ماضي ناقص. حقا:خبر كان المقدم منصوب .علينا:جارومجرور متعلقان ب(حقاً). نصرُ:اسم كان مرفوع ، وهو مضاف .المؤمنين:مضاف إليه مجرور وعلامة خره الياء لانه جمع مذكر سالم. الشاهد في هذه الآية : حقا خبر كان وقد جاز توسطها بين الفعل (كان) واسمها(نصرُ).

[3] ناوی عبدالله ی کوڕی جعفرەو ناسراوە بە ابن درستويه نحوی .

[4] مانـای ئـەم دێـڕە بـەم شێوەیە:پرسـیار بکـە_گـەر نـەتزانی_لەخـەڵکی دەربـارەی ئێمەوئـەوان ،بێگومـان یەکـسان نـین زانـاو نـەزان. بەڵگـەی ئـەم دێـڕە: خـبری لـیس پێشکەوتووە کەبریتیـە لـە(سـواءً) بەسـەر اسمەکەیداکـە بریتیـە لـە(عـالمٌ)، ئەمـەش دروست ورەوایە.

ش٦٦/لا طِيبَ لِلْعَيْش مَادَامَتْ مُنَغَّصَةً      لَذَّاتُهُ بِادِّكَارِ الْمَوْتِ وَالْهَرَمِ [١]

هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی (وكلٌّ سبقهُ دام حظر) بۆ ئەوەی کە بێگومان هەموو عەرەب یان هەموو زانایانی نحو بەدروستی نازانن پێشکەوتنی خبری (دام) بەسەریدا،ئەمەش[٢] ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە رێگەیان نەدابێت پێشکەوتنی خبری دام بەسەر (ما)ی لکاوە بە (دام)ەوە وەکو:(لاأصحبُكَ قائماً مادام زيدٌ)ئەوە ڕاست وتەواوە، بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە رێگەیان نەداوە پێشکەوتنی خبر بەسەر(دام) کەبەتەنها ،وەکو:(لاأصحبكَ ماقائماً دام زيدٌ) _کوڕەکەشی[٣] بەم شێوەیە راڤەی کردووە لەسەرحەکەیدا_ئەوە قسەوباس هەڵدەگرێت،ئوەشی دیارو ئاشکرا بێت ئەوەیە کە نادروست نیە پێشکەوتنی خبری دام بەسەر فعلی (دام)بەتەنها،دەڵێیت:(لاأصحبُكَ ما قائماً دامَ زيدٌ) هەر وەکو دەڵێی(لاأصحبكَ مازيداً كلّمتَ).[٤]

---

[١] واتا:خۆشی نیە لەم ژیانە مادام تێك چێت خۆشییەکانی بە باس وهاتنی پیری و مردن. بەڵگەکەی:پێشکەوتنی خبری دام کە بریتیە لە،(منغصةً)بەسەر اسمەکەیدا کەبریتیە لە(لذّاتهُ).

[٢] واتا:ئەوەی کە دروست نیە پێشکەوتنی خبری دام بەسەریدا.

[٣] واتا کوڕی ابن مالك کە ناوی محمدەو ناسراوە بە کوڕی دانەر(ابن الناظم) شەرحی ئەلفیەکەی باوکی کردووە بەناوی (شرح ابن الناظم على ألفية ابن مالك).

[٤] مەبەست ئەوەیە کە لەڕستەی (لاأصحبكَ مازيداً كلّمتَ)زيدا هاتۆتە نێوان (ما)ی مصدری وفعلەکەی ئەمەش دروستە کەواتا ڕستەی :(لاأصحبُكَ ما قائماً دامَ زيدٌ) بەهەمان شێوە دروستە.

١٤٩-كَذَاكَ سَبْــقُ خَبَرٍ مَا النَّـافِيَهْ     فَجِـئْ بِــهَا مَتْـلُوَّةً لا تَالِيَــهْ.[١]

واتا دروست نيه خبرى (مـا)ى نافيـه[٢]پێشى كـەوێت ،ئەمـەش دوو جۆر لى خـۆ دەگرێـت:يـەكێكيان:ئەوفعلانـەن كـە مەرجـە نـەڤ لەپێـشيانەوە بێـت ئەوانيش بريتين لە (زال)وهاوشێوەكانى[٣]،دروست نيه بڵێيت:(قائماً مـازال زيـدٌ)بـەلاّم هـەر يـەك لـە پێشەوا (ابن كيسان والنحّاس) ئەمـە بـە دروسـت دەزانن .دووەم:ئەو فعله ناتەواوانەن كه نەڤ مەرج نيه بۆ عملەكەيان ،وەكـو (ماكان قائماً زيدٌ)دروست نيه بڵێيت:(قائماًماكان زيدٌ)،وەهەنـدێ لـە زانايـان ئەمەيان بەدروست زانيوە.

جا ناوەڕۆكى قسەكەى ابن مالك ئەوەيە كه ئەگەر نەفيەكه بەغـەيرى (مـا)بـێ ئـەوە دروسـتە خـبرى فعلەكـە پـێش كـەوێت،دەڵێيـت:(قائمـالمْ يـزلْ زيـدٌ، ومُنطلقـاً لم يكـن عمـروٌ)وهەنـدێكيان ئەمـە بـە دروسـت نـازانن. هـەروەها ناوەڕۆكى قسەكەى[٤] ئەوەيە كه دروستە خبر بەتـەنها پێش فعلەكـە كـەوێت ئەگـەر نەفيەكـە بـە (مـا)ى نافيـەش بێـت،وەكـە:(ماقائمـاً زال زيـدٌ)وە وەكو(ماقائما كان زيد) هەرچەندە هەندێكيان ئەمەش بەدروست نازانن.

١٥٠- وَمَنْعُ سَبْقِ خَبَرِ لَيْسَ اصْطُفِي     وَذُو تَمَامٍ مَـــا بِرَفْــعٍ يَكْتَفِي

١٥١- وَمَا سِوَاهُ نَاقِصٌ وَالنَّقْصُ فِـي     فَتِئَ لَيْسَ زَالَ دَائِـمًا قُفِـي.[٥]

---

[١] ماناى ئەم دێڕەى ئەلفيه بەم شێوەيە:هەروەها ڕێگەيان نەداوە زانايان پێشكەوتنى خبرى (ما)ى نافيه بەسەريدا ،(ما)ى نافيه دەبێت شتى بەدوادا بێت نەوەك بە دواى شتدا بێت .

[٢] (ما)ى نافيه لە زمانى عەرەبيدا دوو جۆرە :أ-نافيـه غير عامله لەڕووى ماناوە نفى شتەكە دەكات بـەلاّم عمل ناكات،ئەم جۆرەش دەچێتە سـەر فعلى ماضي ومضارع . ب-*نافيه عامله* ئەم جۆرەش دەچێتە سەر جملەى اسمى و ئەمەش مەبەستە لێرەدا.

[٣] كه بريتى بوون لە{زال وبرح وفتئ وانفك}.

[٤] واتا قسەى ابن مالك كه بريتى بوو لە دێڕى ژمارە ١٤٩.

[٥] ماناى ئەم دوو دێڕەى ئەلفيه: ١٥٠/نادروستێتى خبرى (ليس)هەڵبژێراوە لاى من_واتالاى ابن مالك_.وەفعلى تەواويش لە(كان)وهاوشێوەكانى ئەوانەن كه لەگەڵ ناوێكى مرفوع مانايا:

زانايانی نحو رايان جيايه دەربارەی پێشكەوتنی خبری (ليس)،كوفيێكان ومبردوزجاج وابن السراج وزۆرێك له زانايانی پاشين(المتأخرين)_لەوانيش دانەر _ پێيان وايه دروست نيه پێشكەوتنی،بەلاّم هەر يەك له ابو علی فارسی وابن برهان پێيان وايه دروسته،دەڵێت:(قائماًليس زيدٌ)،هەروەها خلاف هەيه لەگێڕانەوە له بۆچوونی پێشەوا سيبويه،هەندێك ووتويانه پێشەوا سيبويه بەدروستی دەزانێت[1]،وهەندێكيان ووتويانه بەدروستی نازانێت،وەلەزمانی عەرەبيدا نەهاتووه پێشكەوتنی خبری(ليس) بەسەريدا،بەڵكو لەزمانی عەرەبيدا تەنهاپێشكەوتنی معمولی خبرەكەی[2] هاتووه،وەكوفەرموودەی خوای گەورە:﴿أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ﴾[3] ئەم ئايەتەيان كردۆتە بەڵگە ئەوانەی كە بەدروستی دەزانن پێشكەوتنی خبری (ليس)،ڕاڤەی ئايەتەكەش ئەوەيە كە(يوم

---

=تەواوبێت وپێويستيان به شتێكی تر نەبێت. ١٥١/جگە لە فعلی تەواويش ناتەواون،ئەم سێ فعلەش (فتئ،ليس،زال)هەموو كاتێك ناتەواون و بە تەواو(تام)ی بەكار نايەن،واتا غەيری ئەم سێ فعله دەكرێت به تەواوی وبەناتەواوی بەكار بێن.

[1] واتا:پێشكەوتنی خبری ليس.

[2] مەبەست ئەوەيە كاتێك خبری ليس اسمی فاعل يان اسمی مفعول يان صفەی مشبهه بێت لەم كاتەدا پێويستی بەمعمول هەيه چونكه ئەمانه عاملن وەكو پێشتر لەباسەكانی ڕابردوودا باسمان كرد.

[3] بەشێكه لە ئايەتی ژمارە(٨)ی سورەتی هود.كورتەی ماناكەی:{بێداربن كەئەو ڕۆژەی سزايان بۆدێ ،بەهيچ شێوەيەك لێيان لانادرێ وكەسيش ناتوانێت قوتار بێت..} .إعرابی تەواوی ئەم ڕستەيه بەم شێوەيە: ألا:حرف استفتاح مبني على السكون. يومَ:ظرف زمان لـ(مصروفا)منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة. يأتيهم:فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرةعلى الياء للثقل، وفاعله :ضمير مستتر تقديره(هو)، وهم:ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. وجملة(يأتيهم)في محل جر بإضافة(يوم) إليها. مصروفا: خبر ليس منصوب. عنهم: جارومجرورمتعلقان بـ(مصروفا). الشاهد في هذه الاية:تقديم معمول خبر ليس عليها.

یــأتیهم)معمــولی خــبری (لــیس)یەکەبریتیــە لــە (مــصروفا)و پــێش (لـیس)کـەوتووە،وەووتویانـە معمـول ناکرێـت پێـشکەوێت مەگـەر کاتێـك عاملەکەی پێشکەوێت[١].

هــەروەها ووتــەی:(وذو تمــام_تاکۆتــای) واتائــەم فعلانــە[٢]دەبنــە دووبەشـەوە:یـەکێکیان:بەتـەواو(تـام)ی بـە ناتـەواو(نـاقص)ی بـەکاردێت، دووەمیـان:تـەنها ناتـەواوە، مەبەستیش لـە تـەواو ئەوەیە:کەبەتـەنهاناوێکی مرفـوع[٣]مانـای تـەواو دەبێـت و ڕسـتەیەکی تـەواو دروسـت دەکـات، وەمەبەست لە ناتەواو:ئەوەیە کە بەتـەنها لەگەڵ نـاوێکی (مرفـوع)دا مانـای تەواو نابێت وپێویستی بە ناوێکی منصوبیشە[٤].

جاهـەموو ئـەم فعلانـە دروسـتە بـە تـەواو(تـام)ی بـەکار بـێن جگـە لـە(فتـئ)، و(زال)کە مضارعەکەی (یزال)ە،نەوەك ئەوەی مضارعەکەی (یـزولُ)ە چونکە ئەمەیان تەواو(تام)ە،وەکو:(زالتِ الـشمسُ)[٥]،و(لـیس) ئـەم سیانە[٦] هـەموو کات ناتەواون.

---

[١] واتا:کەدروست بێت پێشکەوتنی معمولی خبر ئەوە بێگومان پێشکەوتنی خبر لە پێشترە.

[٢] مەبەست (کان وأخواتها)یە.

[٣] کە دەبێتە فاعلی فعلەکە.

[٤] کە دەبێتە خبری ،واتا فعلی ناقص پێویست بە اسمێکی مرفوع و خبرێکی منصوبە وەکو پێشتر باسمان کرد.

[٥] فعلی(زال)کە فعلێکی ماضیە ،بەدوو شێوە دەکرێتە مضارع:أ-(یزال) کە بە واتـای بـەردەوامی دێـت و فعلێکـی ناقـصە وهـیچ کاتێـك تـام نیـە. ب-(یـزول)کـە بـەواتای لادەچێت یان نامێنێت دێت و فعلێکی( تام)ە وناقص نیە.

[٦] واتا :فتئ وزال و لیس.

جا نموونەی فعلی تەواو فەرموودەی خوای گەورە:﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾[1]،هەروەها فەرموودەی خوای گەورە:﴿خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ﴾[2]، وەفەرموودەی خوای گەورە﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ﴾[3]

---

[1] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٢٨٠)ی سورەتی البقرە، کورتەی ماناکەی :{ئەگەر قەرزدار نەدار بوو ئەوە با مۆڵەتی بدرێ تا دەوڵەمەند دەبێت.} . إعرابەکەی: و:حسب ماقبله . إن:حرف شرط جازم مبني على السكون. كان:فعل ماضي تام مبني في محل جزم . ذو: فاعل مرفوع وعلامة رفعه الواو لانه من الاسماء الخمسة، ويجوز أن يكون(ذو) في محل رفع نائب فاعل إذا كان (كان) بمعنى وُجِدَ،وهو مضاف. عسرة:مضاف إليه مجرور. ف:واقعة في جواب الشرط. نظرةٌ:خبر لمبتدأ محذوف. إلى ميسرة: جارومجرور متعلقان بـ(نظرة). وجملة (فنظرة إلى ميسرة ) في محل جواب شرط. الشاهد في هذه الآية/ (كان) التامة بمعنى حدث او بمعنى وُجِد.

[2] ئایەتی ژمارە (١٠٧)ی سورەتی (هود)ە، کورتەی ماناکەی:{تیایدا دەمێننەوە_ واتابەهەشتیەکان ودۆزەخیەکان_تا ئاسمانەکان و زەوی بمێنێت_واتا بەهەمیشەیی_} . إعرابی تەواوی بەم شێوەیە: خالدين: حال من الضميرفي (شقوا) منصوب وعلامة نصبه الياء لانه جمع مذكر السالم. ما:مصدرية ظرفية. دامتْ:فعل ماضي تام بمعنى بقي مبني على الفتح ، والتاء :تاء التأنيث الساكنة. السمواتُ:فاعل مرفوع. والارضُ: اسم معطوف مرفوع._الشاهد في هذه الآية : (دام) جاء بمعنى بقي وهو فعل تام، ولم يعمل عمل كان وأخواتها.

[3] ئایەتی ژمارە (١٧)ی سورەتی (الروم)،کورتەی ماناکەی:{ئەنجا پاك وبێگەردی بلێن كاتێ ئێوارەتان لێدێت وکاتێك بەیانیانتان لێدێت.} إعرابەکەشی بەم شێوەیە/ فـ: حسب ماقبلها. سبحان:مفعول مطلق لفعل محذزف.،منصوب وعلامة نصبه الفتحة وهو مضاف. اللهِ: مضاف إليه. حينَ: ظرف زمان منصوب ،وشبه الجملة متعلق بـ(سبحان). تمسون: فعل مضارع تام مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الافعال الخمسة. والواو:ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. وجملة (تمسون)في محل جر بإضافة الظرف إليها. وإعراب( حين تصبحون) مثل (حين تمسون). الشاهدفي هذه الآية: تمسون وتصبحون حيث جاء الفعلان تامين لأنهما بمعنى تدخلون في المساء وتدخلون في الصباح.

١٥٢- وَلاَ يَلِي العَامِلَ مَعْمُولُ الْخَبَرْ إِلاَّ إِذَا ظَرْفاً أَتَى أَوْ حَرْفَ جَرْ.[(١)]

واتـا دروسـت نيـه لـەدواى (كـان وأخواتهـا) معمـولى خـبر بێـت[(٢)] ئەگـەر معمولەكـە ظرف وجـارومجرور نەبێت،ئەمـەش دوو حاڵـەت لـەخۆدەگرێت:

يـەكێكيان:معمـولى خبرەكـە بەتـەنها پـێش اسمەكـە بكـەوێت وخبرەكـەش لەدواى اسمەكەوە بێت،وەكو:(كان طعامَك زيـدٌ آكلاً)[(٣)] ،ئەمـەش دروست نيە لاى بەصرێكان، بەڵام كوفێكان بەدروستى دەزانن.

دووەميان: ئەوەيە كەمعمولى خبرەكەوخبرەكەش هەردووكيان پێش اسمەكە بكەون، وەمعمولى خبرەكەش پێش خبرەكەى بكەوێت، وەكو:(كـان طعامَـك آكـلاً زيـدٌ)،ئەمـەش لاى سيبويە دروست نيە،بەڵام هەندێ لە بەصرێكان بەدروستى دەزانن.

هـەروەها وەردەگيرێـت لـە قـسەى دانـەر كـە خـبر ومعمولەكـەى ئەگـەر پـێش اسمەكـە بكـەون وخبرەكـەش پـێش معمولەكـەى بكـەوێت ئـەوە دروسـتە، چونكە لـەم حاڵەتـەدا معمـول بـەدواى (كـان)دا نـەهاتووە،دەڵێيت:(كـان آكـلاً طعامَك زيدٌ)وەبەصرێكانيش بەنادروستى نازانن. جائەگەر معمولەكە ظرف يـان جارومجروربووئـەوە دروسـتە بـەدواى(كـان)دا بێـت لاى بەصـرێكان وكوفێكان،وەكو:(كان عندك زيدٌمقيماً[(٤)]، وكان فيك زيدٌ راغباً[(٥)])

---

[(١)] ماناى ئەم دێرەى ئەلفيە :دروست نيە معمولى خبر_كاتێك خبر عامل بێت_ بكەوێتە دواى عاملى خبرەكە واتا بكەوێتە دواى فعلى (كان وأخواتها)، مەگەر ئەو معموله ظرف يان جارومجرور بێت، واتائەگەر معمولى خبرەكە ظـرف وجارو مجرور بێت دروسته بكەوێتە دواى فعلەكە وپێش خبرەكەى كەوێت.

[(٢)] واتا پێش خبر كەوێت.

[(٣)] لەم ڕستەيەدا (طعامك) معمولي (آكلا)ە،چونكە آكل اسمى فاعله و عمل دەكات .

[(٤)] لەم ڕستەيەدا(مُقيماً)خبرى كانەيەوعامله چونكه اسمى فاعله،وەمعمولەكەى(عندك)يە كە ظرفەوپێش اسمى كان كەوتووە.ئەمەش بەبێ خلاف دروستە.

[(٥)] لـەم ڕستەيەشـدا(راغبـاً) خـبرى كانەيـە واسمـى فاعلـەوعمل دەكـات ومعمولەكەشـى (فيك)يە وجارومجرورەوپێش اسمەكە كەوتووە،ئەمەش لاى هەموو زانايان دروستە.

١٥٣–وَمُضْمَرالشَّأْنِ اسْمًا انْوِ إنْ وَقَعْ مُوهِمُ مَا اسْتَبَانَ أَنَّه امْتَنَعْ.[١]

واتا ئەگەر لەزمانی عەرەبیدا هات شتێك كە ظاهرەكەی وابوو كە معمولی خبری كان پێش اسمی (كان)كە كەوتبێ ئەوە واراڤەی بكە كە لە( كان)كەدا جێناوێكی نادیار هەیە كە پێی دەوترێت(ضمیر الشأن)[٢] هەیە وئەو جێناوە دەبێتە اسمی (كان)ە،ئەمەش وەكو ووتەی شاعر:

ش٦٧/ قَنَافِذُ هَدَّاجُونَ حَوْلَ بُيُوتِهِمْ بِمَا كَانَ إِيَّاهُمْ عَطِيَّةُ عَـــوَّدَا.[٣]

جا ئەم دێڕە وادەردەكەوێت كە وەكوڕستەی(كان طعامك زيدٌ آكلاً)[٤] وابێت، بەڵام وادادەنرێت كە اسمی (كان) جێناوێكی نادیار بێت.

هەروەها یەكێكی تر لەو نموونانەی كە وادەردەكەوێت وەكوڕستەی(كان طعامك آكلاً زيدٌ) وابێت ووتەی :

ش٦٨/ فَأَصْبَحُوا وَالنَّوَى عَالِي مُعَرَّسِهِمْ وَلَيْسَ كُلُّ النَّوَى تُلْقِي الْمَسَاكِينُ.[٥]

---

[١] ئەم دێڕەی ئەلفیە تەواوكەری دێڕی پێشووەو ماناكەی: جێناوێكی نادیار مقدر كە ئەگەر شتێك_ڕستەیەك_هات لەزمانی عەربیدا كە بە ظاهر معمولی خبری (كان) پێش اسمەكە كەوتبێ وئەو جێناوە نادیارە بكە بە اسمی (كان)كە .

[٢] پێشتر مانای (ضمير الشأن)مان كرد.

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە بەم شێوەیە: ئەوان وەكو ژیژك وان بەشەودا دەگەڕێن ومۆتەمۆت دەكەن بۆ دزی وخراپە كاری،چونكە باوكیان فێریانی كردووە. *بەڵگەی ئەم دێڕە:* لەم دێڕەدا وا دەردەكەوێت كە معمولی خبری كان كەبریتیە لە(إيّاهم) پێش اسمەكەی كەوتبێت كە بریتیە لە(عطية)،ئەمەش لای زۆربەی زانایان دروست نیە،بۆیە دەڵێن اسمی (كان)كە لێرەدا بریتیە لە جێناوێكی نادیار(ضمير الشأن)و خبرەكەشی دەبێتە ڕستەی(عطية عودهم).

[٤] واتا :لەم ڕستەیەدا (طعامـــك)معمولی خبری (كان)یە وپێش اسم وخبرەكەی كەوتووە، بەڵام ئەمە لای زۆربەی زانایان دروست نیە ودەڵێن لەم حاڵەتەدا اسمی (كان) جێناوێكی نادیارەو پێی دەوترێت (ضمير الشأن).

[٥] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش : كاتێك _میوانەكان _بەیانیان كردەوە ناوكی خورما كەڵەكە ببو لەجێگەكەیان_واتا خورمایان زۆر خواردبوو_،وەمەرجیش نیە هەموو-

_ئەگەر ووشەی(تلقی)بە(یلقی) نەخوێندرێتەوە[١]، کەواتائەو دوو دێڕەی ڕابورد[٢]،لەهەردووکیاندا اسمی (کان) نادیارەولەیەکەمیاندا دەبێتە(بماکان هو)واتا:حالْ وایە[٣]، وەناوی (عطیة)[٤]:دەبێتە مبتدا و(عوّد)ش دەبێتە خبری و(إیاهم)یش دەبێتە مفعولی (عوّد)وئەم ڕستە اسمیەش[٥] دەبێتە خبری (کان)،کەواتە معمولی خبری (کان)نەکەوتۆتە نێوان (کان)واسمەکەی،چونکە اسمی کان جێناوێکی نادیارەولەپێش معمولەکەوەیە.هەروەها لەڕستەی دووەمدا[٦]،دەبێتە(لیس هو) واتا:حالْ وایە،کەواتە (ضمیرالشان)کە دەبێتە اسمی (لیس)،وەووشەی (کلّ) دەبێتە معمولی (تلقی)و(تلقی المساکین)یش دەبێتە فعل وفاعل،سەرجەم ڕستەکەش دەبێتە خبری(لیس)،ئەمە هەندێکە لەوەی ووتراوە دەربارەی ئەم دوو دێڕە.[٧]

---

-ناوکی خورماکانیان فڕێدابێت ودەکرێ هەندێکیان قووت دابێت، واتا زۆرخۆربوون.

<u>*بەڵگەی ئەم دێڕە:*</u> وادەردەکەوێت کە معمولی خبری(لیس) کەبریتیە لە (کلّ)پێش اسم وخبرەکەی کەوتبێت، بەلاّم وا دادەنرێت کە اسمی (لیس) جیناوێکی نادیاربێت.

[١] چونکە ئەگەر بە (یلقی)بخوێندرێتەوە ئەوە بەبێ خلاف اسمی (لیس) دەبێتە جێناوێکی نادیار.

[٢] واتا: شاهدی ژمارە ٦٧و٦٨.

[٣] واتا ئەو جێناوە ناگەڕێتەوە بۆ کەسێکی دیاری کراو،چونکە (ضمیرالشأن) ناگەڕێتەوە بۆ کەس وشتێکی دیاری کراو.

[٤] کە لە شاهدی ژمارە ٦٧دا هاتبوو.

[٥] واتا:ڕستەی (عطیة إیاهم عود).

[٦] واتا:شاهدی ژمارە٦٨.

[٧] واتا زانایان ڕاڤەو لێکدانەوەی جۆراوجۆریان کردووە دەربارەی هەردوو شاهدی ژمارە٦٧و٦٨،ئەوەی ابن عقیل باسی کرد هەندێکی بوو.

## باسی(كان )ی زيادكراو:

١٥٤–وَقَدْ تُزَادُ كَانَ فِي حَشْوٍ كَمَا  كَـــانَ أَصَحَّ عِلْمَ مَنْ تَقَدَّمَا.[١]

فعلـی(كـان) سـێ جـۆره:يـەكێكيان:ناتـەواو(الناقـصة)، دووەميـان: تـەواو(التامـة)،پێـشتر باسـی ئـەم دوو جۆرەيـان كـرا، جـۆری سێيەم:زيادكراوە(الزائدة)،كەمەبەستی ئەم دێڕەيە[٢]،ابن عصفور باسی ئـەوەی كـردووە كـە (كـان) زيـاد دەكـرێ لـەنێوان دوو شـتی پەيوەسـت بەيەك،وەكو مبتداوخبر،وەكو:

(زيدٌكان قـائمٌ)[٣]،وەكوفعل و مرفوعەكەی،نموونـەی:(لم يوجدكان مثلُكَ)[٤] ،هـەروەها دەكەوێتـە نێـوان( صـلةو موصـول)[٥]، وەكـو:( جـاء الـذي كـان اكرمتــه)[٦]، هــەروەها دەكەوێتــە نێــوان صــفەو وەســفكراو(الموصــوف)، وەكو:(مررْتُ برجلٍ كان قائمٍ)[٧]،ئەمەش[٨]وەردەگيرێت لە ووتەی دانەر (زياد

---

[١] مانـای ئـەم دێـڕەی ئەلفيـە بـەم شـێوەيە:هەنـدێ جـار زيـاد دەكـرێ(كـان) لـە ناوەڕاسـتدا،واتا لەناوەڕاسـتی دوو ووشـەی پەيوەسـت بەيـەك، وەكـو نموونـەی:(ماكَـانَ أَصَحَّ عِلْمَ مَنْ تَقَدَّمَا)،واتا:زۆر ڕاست وبەسوودە علم وزانستی پێشينان.

[٢] واتا:دێڕی ژمارە(١٥٤)ی ئەلفيە.

[٣] لەم ڕستەيەدا:زيدٌ/ مبتدايە وكان زائدەيەو قائمٌ خبری (زيد)ـە.

[٤] إعربی تەواوی ئەم ڕستەيە بەم شێوەيە/ لم:حرف نفي وجزم وقلب . يُوجدْ:فعل مضارع (مبني للمجهول)مجزوم بـ(لم) وعلامة جزمه السكون. كان: فعل ماضي زائد. مثلُ: نائب فاعل مرفوع،وهومضاف (كَ):ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه.

[٥] پێشتر باسی صلەوموصولمان كرد.

[٦] لەم ڕستەيەشدا (كان) زيادكراوە لە نێوان اسمێكی موصول كە(الـذي)،وصلەكەی كەڕستەی (اكرمْتُهُ)ـە.

[٧] لە ڕستەيەشدا (كان) كەوتۆتە نێوان (رجل) كە موصوفە و(قائم) كە صفەيە.

[٨] واتا ئەوەی كە (كان) دەكەوێتە نێوان دوو شتی پەيوەست بەيەك.

دەکرێ(کان) لە ناوەڕاستدا)، جا زیاد کردنی (کان) قیاسیە[1] لەنێوان (ما)ی سەرسوڕمان(التعجب)وفعلە تعجبەکە،وەکو:(ماکان أصحّ علم من تقدّما)[2]،بەلاّم لەجگە لەنێوان (ما)ی سەرسوڕمان(التعجب)وفعلە تعجبەکە زیاد ناکرێ مەگەر بەبێ یاسا (سماعی).

هەروەها بیستراوە زیادکردنی(کان) لەنێوان فعل ومرفوعەکەی،وەکو ووتەی عەرەب: وَلَدَتْ فاطمةُ بنتُ الْخُرْشُبِ الأَنْمَارِيَّةُ الكَمَلَةَ مَنْ بَنِي عَبْسٍ لَمْ يُوجَدْ كَانَ أَفْضَلُ مِنْهُمْ [3].

هەروەها بیستراوە زیادکردنی(کان) لەنێوان صفەو وەصفکراو،وەکو ووتەی شاعیر:

ش٦٩- فَكَيْفَ إِذَا مَرَرْتُ بِدَارِ قَوْمٍ     وَجِيرَانٍ لَنَا كَانُوا كِرَامِ.[4]

هەروەها بەشازی[5]هاتووە زیادکردنی (کان) لەنێوان حەرفی جر واسمە مجرورەکەی، وەکو ووتەی شاعیر:

---

[1] قیاسی واتا:یاسای دیاری کراوی هەیە.بە پێچەوانەی(سماعی) کە یاسای دیاری کراوی نیە.

[2] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە: ﴿ما﴾ تعجبية في محل رفع مبتدأ. ﴿كان﴾ زائدة. ﴿أصح﴾ فعل ماضي للتعجب مبني على الفتح. ، وفاعله ضمير مستتر فيه جوازا تقديره هو ﴿علمَ﴾ مفعول به منصوب ، وجملة الفعل والفاعل في محل رفع خبر المبتدا ،﴿علم﴾ مضاف ، و﴿من﴾ اسم موصول في محل جر بالإضافة ﴿تقدما﴾فعل ماض و﴿الألف﴾ للاطلاق ، وفاعله مستتر فيه جوازا تقديره هو وجملة الفعل والفاعل صلة الموصول.

[3]ئەم ووتەیە ووتەی قەیسی کوڕی غالبە دەربارەی فاطمەی کچی خورشب کە ئافرەتێکی ناودار بووەوخاوەنی چوار کوڕی ئازاو جوامێر بووە، مانای ووتەکەش بەم شێوەیە: فاطمەی کچی خورشبی ئەنماری کوڕێکی بووە لە نەوەی عەبس لەو باشتر نیە لەو نەوەیەدا.

[4]مانای ئەم دێڕە شیعرە بەم شێوەیە: دەبێ حاڵ چەندە خۆش بێت کاتێك تێپەڕ بووم بەلای ماڵی کەسان ودراوسێیەك کە بەڕێزن . بەڵگەی ئەم دێڕە :زیادکردنی (کانوا) لەنێوان صفەیەك کەووشەی(کرامِ)ـەو وەصفکراوێك کە ووشەی(جیران)ـە.

[5] شاذ واتا پێچەوانەی یاسا.

ش٧٠/ سَرَاةُ بَنِي أَبِي بَكْرٍ تَسَامَى    عَلَى كَانَ الْمُسَوَّمَةِ العِرَابِ.[١]

دیارە زۆرتر وایە (کان) بەڕابردوو(ماض)ی زیاد دەکرێت، بەڵام بەشاذی هاتووە زیادکردنی بە ڕانەبردوو(المضارع)ی،لەووتەی دایکی عەقیلی کوڕی ئەبی طالب[٢]:

ش٧١/ انْتَ تَكُونُ مَاجِدٌ نَبِيلُ    إِذَا تَهُبُّ شَمْأَلٌ بَلِيلُ .[٣]

## باسی حذف کردنی (کان)وناو(اسم)ـەکەی:

١٥٥- وَيَحْذِفُونَهَا وَيُبْقُونَ الْخَبَرْ    وَبَعْدَ إِنْ وَلَوْ كَثِيرًا ذَا اشْتَهَرْ.[٤]

حذف دەکرێت (کان)لەگەڵ اسمەکەی، وخبرەکەی دەمێنێتەوە بەزۆری لەدوای (إنْ)[٥]

ش٧٢/قَدْ قِيلَ ما قِيلَ إنْ صِدْقًا وإنْ كَذِبًا    فَمَا اعْتِذَارُكَ مِنْ قَولٍ إِذَا قِيلاَ؟.[٦]

---

[١] واتا:پیاوە نەجیبەکانی نەوەی ئەبو بەکر دەردەکەون لەسەر ئەسپە ناوازە ونیشانکراوەکان. بەڵگەی ئەم دێڕە :زیادکردنی (کان) لەنێوان حەرفی جر کە(علی)ـیە واسمە مجرورەکەی کە(المسوّمة)ـیە.

[٢] کەناوی فاطمەی کچی ئەسەدەو یەکێك بووە لەئافرەتە باوەڕدارە پێشینەکان._ڕەزای خوای لیٚ بیٚت_

[٣] واتا:بێگومان تۆ دەبیتە کەسێکی نەجیب وبەڕێز، کاتێك کە هەڵکات شنەبای تەڕوفێنك،واتا بەردەوام وادەبیت. بەڵگەی ئەم دێڕە: زیادکردنی (تکون) کە مضارعي(کان)ـیە لەنێوان مبتدا وخبر کە بریتین لە (انت ماجدٌ).

[٤] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە :حذف دەکەن (کان)واسمەکەی وتەنها خبرەکەی دەهێڵنەوە، ئەمەش زۆرباوە لەدوای هەردوو حەرفی(إنْ و لَوْ).

[٥] واتا (إنْ)ي مەرج(شرطية).

[٦] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە بەم شێوەیە:بێگومان ووترا ئەوقسەیەی ووترا ئەگەر ڕاست بێت یان درۆ،جا بیانووت چییە لە قسەیەك کە ووترا. بەڵگەی ئەم دێڕە: ووتەی (إن صدقاً،وإن کذباً) (کان)واسمەکەی حذف کراوەوخبرەکەی کە بریتیە

تەقدیروڕاڤـەی ڕسـتەكە دەبێتـە(إن كـان المقـولُ صـدقا،وإن كـان المقـولُ كـذبا)،هـەروەها لـەدوای حـەرفی (لَـوْ)[١]، وەكـو:(ائـتني بدابّـةٍ ولـو حماراً)[٢]،واتا:(تەنانەت ئەگەر ئەوەی دەیهێنی گوێدرێژێكیش بێت).
هەروەهابە شاذي هاتووەحذف كردنی[٣]لەدوای (لدُن)[٤]،وەكو ووتەی:
ش٧٣/ مِنْ لَدُ شَوْلاً فَإلَى إتْلاَئِهَا [٥]
تەقدیرو ڕاڤەكەی دەبێتە: {من لد ان كانت شولا}.[٦]

---

لە(صدقا)و(كذبا)وتقدیرەكەشی دەبێتە(إن كان المقولُ صدقاً)و(إن كان المقولُ كذبا)، ئەمش دروستە لە زمانی عەرەبیدا.
[١] حەرفی (لو)لەزمانی عەرەبیدا بۆ پێنج ماناومەبەست بەكار دێت: ١-حرف وصل للتقليل (حەرفی گەیاندن وبۆ كەمێتی). ٢-حرف تمنّ(حەرفی ئاواتە خواستن) ٣-حرف امتناع لامتناع(ڕوونەدانی وەلاّم(جواب)لەبەر نەهاتنەدی مەرج(الشرط) . ٤-حرف عـرض(هـەڵنان وهانـدان). ٥-حـرف مـصدري (لەگـەڵ دوای خـۆی دەكرێتـە جاووگ(المصدر)). جا ئەوەی لێرەدا باسدەكرێت لە جۆری یەكەمە.
[٢] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە: ائتِ/فعل امر مبني على حذف حرف علةلأنه معتل الآخر،وفاعله ضمير مستتر وجوبا تقديره(انتَ). ن/نون الوقاية. ي/ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. بدابّةٍ/جارومجرور متعلق بـ(ائتني). و/حرف عطف. لوْ/حرف وصل للتقليل. حماراً/ خبر لـ(كان)المحذوفة مع اسمها،والتقدير(ولو كان المأتيُّ به حماراً).
[٣] واتا:حذفكردنی (كان)واسمەكەی.
[٤] لـدُن: ناوێكی نەگۆڕ(جامد)ـە بەكار دێدێت بۆ ئاوەڵفرمان(ظرف)ـی كاتی یان شوێنی(الزمان والمكان).
[٥] ئـەم نیـو دێـڕە وەكـو پەنـد بەكار دێـت ،وماناكـەی:لەكاتی بەكـەڵ بـوونی ووشتر تاوەكودانانی سكەكەی، سواری مەبن وباری لێ مەدەن. *بەڵگەی ئەم نیو دێڕە*: حذف كردنـی (كـان)واسمەكـەی ومانـەوەی خبرەكـەی لـە دوای (لـدُن) ئەمـەش شـاذە و پێچەوانەی یاسایە.
[٦] اسمی (كان)ـە بریتیە لە جێناوێكی نادیاروتقدیرەكەی(هی)یەوبۆ (الناقة) دەگەڕێتەوە.

١٥٦- وَبَعْدَ أَنْ تَعْوِيضُ مَا عَنْهَا ارْتُكِبْ كَمِثْلِ أَمَّا أَنْتَ بَرًّا فَاقْتَرِب.[١]

لەم دێڕەدا باسی ئەوە دەكات كە دروستە(كان) حذف كرێت لە دوای (أن)ـی مصدەریەوەو لەبریدا(ما)بهێنرێت واسم وخبرەكەشی بمێنێتەوە،وەكو: (أَمَّا أَنْتَ بَرًّا فَاقْتَرِب)[٢]،ئەصڵی ئەم ڕستەیە (أَن كُنْتَ بَرًّا فَاقْتَرِب) فعلی(كان) حذفكراوەو جێناوە لكاوەكەی[٣]بووە بە سەربەخۆ(المنفصل)ودواتر ڕستەكە بووە بە (انْ انتَ براً)وپاشان (ما)ی زیادكراو لەبری (كان) حذفكراوەكە هێنراوەو بووە بە (أن انت برّا)،پاشان نونەكە[٤]لەگەڵ میمەكە تێهەڵكێشكراوەو،بووە بە(أَمَّا أَنْتَ بَرًّا)، هەروەها وەكو ئەمە وایە ووتەی شاعیر :

ش٧٤/ أَبَا خُرَاشَةَ أَمَّا أَنْتَ ذَا نَفَرٍ فَإِنَّ قَومِي لَمْ تَأْكُلْهُمُ الضَّبُعُ.[٥]

لێرەدا(أن): مصدریەو،(ما): زیادكراوەولەبری(كان)دا،و(أنت):اسمی (كان) حذفكراوەكەیە، وذانفر:خبری(كان)ـیە،دروست نیە(كان) حذفكراوەكەو(ما)زیادكراوەكە پێكەوە بێن،چونكە دروست نیە

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: لەدوای (أن)ـی مصدریەوە (كان) حذف دەكرێت و لە بریدا (ما)ـی زیادكراو دەهێنرێت،وەكو نموونەی(ئەگەر تۆ چاكەكاری هەوڵدە بەردەوام لەخوا نزیك بەرەوە).

[٢] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە:أنْ/مصدرية. ما/زائدة. انتَ/ في محل رفع اسم (كان)المحذوفة. برّاً/ خبر كان المحذوفة. فـ/ تعليلية. اقتربْ/ فعل امر مبني على السكون،وفاعله ضميرمستتر تقديره (انت).

[٣] واتا: جێناوی (تَ) كە لكاوە بە (كان)ـەوە.

[٤] واتا:نونی (أن)ـەكە.

[٥] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە بەم شێوەیە: هۆ باوكی خوراشە خۆ ئەگەر تۆ خاوەن كەس وكاری زۆری وشانازیيان پێوە دەكەیت، ئەوە منیش خاوەن كەس و كارم وكەسەكانی منیش تیا نەچوون بەهۆی برسێتی وگرانی.بەڵگەی ئەم دێڕە:( أَمَّا أَنْتَ ذَا نَفَرٍ لێرەدا (كان) ) حذفكراوەو(ما)ـی زائدە لە بریدا هاتووەوئەصلەكەی(أن كنت ذانفر).ئەمەش دروستە لە زمانی عەرەبیدا.

بـری(العـوض)ولەبریـداهاتوو(المعـوض) پێکـەوە بـێن ،بـەڵام شـێخی مُـبرّد بەدروستی دەزانێت،ودەڵێت(امّا کُنتَ مُنطلقا انطلقتُ)[١].

هـەروەها نەبیـستراوە لـە زمـانی عـەرەبی حـذفکردنـی(کـان)وهێنـانی(مـا) لەبریداوهێشتنەوەی اسم وخبرەکـەی مەگـەر لەکاتێکدا اسمەکـەی جێنـاوی دوێنـدراو(مخاطب)بێـت هـەروەکو دانـەر نموونـەی هێنایـەوە[٢]، وەنەبیـستراوە لەگەڵ جێناوی کەسی یەکەم(المتکلم)،وەکو:(أمّاأنا منطلقاً انطلقْتَ) ئەصلی ئەم ڕستەیەش[٣]بریتیـە لـە(أن کُنـتُ مُنطلقـا)[٤]،هـەروەها نەبیـستراوە لەگـەڵ ناوی دیار(الظاهر)[٥]،وەکو:(أمّا زیـد ذاهبـاً انطلقْـتُ)،هەرچەند بەپێی یاسا دروسـتە[٦]،ئەصڵەکەشـی بریتیـە لـە:(أنْ کـان زیـدٌ ذاهبـاً)،وەشـێخی سیبویە_رەحمەتی خوای لێبێت_ لەکێبەکەیدا نموونەی بە(أمّا زیـد ذاهبـاً) هێناوەتەوە.

---

[١] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە: امّا/ أصله:أنْ+ما، أنْ/ مصدریة. مـا/ زائـدة .کُنْتَ/کنْ: فعل ماضي ناقص مبني علی السکون لاتصاله بضمیر رفع متحرك. تَ/ضمیر متصل مبني علی الفتح في محل رفع اسم کان. منطلقاً/خبر کان منصوب. اطلقتُ/ فعل وفاعل.

[٢] مەبەست لە نموونەی (أَمَّا أَنْتَ بَرًّا فَاقْتَرِب)ـە.

[٣] واتا:ڕستەی(:(أمّاأنا منطلقاً انطلقْتَ).

[٤] واتا:کاتێك (کان) حذف دەکەین جێناوەك لکاوەکەی (تُ) دەبێتە سەربەخۆ(انا).

[٥] مەبەست لە ناوی دیار غەیری جێناو(الضمیر)ـە.

[٦] واتا : حذفکردنی(کان) لەکاتێکدا اسمەکـەی جێنـاوی کەسـی یەکەم(المتکلم)بێت، یان ناوی دیار(الظاهر) بێت.

## *باسی مضارعی( کان )کاتێك مجزوم بێت

١٥٧_ وَمِنْ مُضَارِعٍ لِكَانَ مُنْجَزِمْ تُحْذَفُ نُونٌ وَهْوَ حَذْفٌ مَا الْتُزِمْ.[١]

کاتێك فعلـي مـضارعي (کـان) مجـزوم بێـت دەوترێـت:لمْ يَكُـنْ، ئەصـڵەکەشـی (يكُونُ)ـە،حەرفە جازمەکە[٢] ضمەی سەر نونەکەی لادا[٣]،پاشـان دوو حـەرفی سـاکن دەگـەن بەيـەك[٤]،ئـەوکات واوەکـە حـذف دەکـەين لەبـەر گەشـتنی دووحەرفی ساکن به یەك،دەبێتە(لَـمْ يَكُـنْ)جا بەپێی یاسا(القیاس) دەبێت شتێکی تـری لـێ حـذف نەکرێت،بـەڵام لـەزمانی عەرەبیـدا حـذفی نونەکـەش دەکرێـت لەبەرزۆربـەکارهێنان ،دەڵـێن(لم يـكُ) ئـەم حـذف کردنـەش دروسـت(جـائز)ـەوپێویـست(لازم) نیـە، جاڕاووبۆچـوونی سـيبويەوئەوانەی شـوێنی کـەوتوون وايـە کەئـەم نونـە حـذف نابێـت لەکاتێکـدا حـەرفی سـاکن لەدوایـەوە بێـت[٥]،کەواتـە ناڵێیـت:(لم يـكُ الرجـلُ قائمـا)،بـەڵام پێشەوا(یـونس)[٦] بەدروسـتی دەزانێـت، هـەروەها بەشـازی خوێندراوەتـەوە

[١] کورتەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە: مـضارعي کان کاتێك مجـزوم بیٚ _واتا ئەداتی جزم چووبێتە سەری_ دروستە نونەکەی_واتا نونی (کان)ـەکە _حـذف کرێت، ئەم حـذفکردنـەش دروسـت(جـائز)ـەو واجب نیـە،واتا دەتـوانی حـذفي کـەيت ودەتـوانی بیهێڵیتەوە.

[٢] واتا: لَمْ.

[٣] چونکە ووشەی جزم لەزمانی عەرەبیدا واتا(قطع)بڕین چونکە حەرەکەی کۆتای فعلەکە دەبڕێت،کەواتە (يكونُ) کاتێك (لم) دەچێتە سەری دەبێتە يكُونْ .

[٤] واتا: حەرفی(واو)ـەو(نون)ـەکە لە فعلی يكون.

[٥] واتا:کاتێك ووشەکەی دوای (يكن) یەکەم حەرفی ساکن بێت.

[٦] پيشەوا یونس :ناوی تـەواوی( يـونس بن حبيب)ـە وسـاڵی ٩٤ی کۆچی لەعێراق لـەدایك بـووەو یەکێکـە لـە گـەورە زانايـانی ڕێزمـانی عـەرەبی مامۆسـتای هەريـەك لەپێشەوا(سيبويەوفەڕاوکسائی)بووە،ساڵی ١٨٢ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە﴿لَمْ یَكُ الذین كفروا...﴾[١]، بەلأم ئەگەر لەدوای نونەکەوە حەرفی بزواو(متحرك)هات ئەوە ئەو حەرفە متحرکە یان جێناوی لکاوە،یان نا، جائەگەر جێناوی لکاوبوو ئەوە نونەکە حذف ناکرێت بەیەکدەنگی زانایان،وەکووفەرموودەی پێغەمبەر-صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- بۆ پێشەوا عومەر_ڕەزای خوای لێ بێ_دەربارەی ابن صیاد[٢]:( إنْ يَكُنْهُ فلنْ تُسَلَّطَ عليه ، وإلاّ يَكُنْهُ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ)[٣]، لێرەدا دروست نیە حذفکردنی نونەکە[٤]، دروست نیە بڵێی:(إنْ یکهُ، وإلاّ یکهُ)،بەلأم ئەگەر ناوەکەی دوای (یکن) جێناوی لکاو نەبوو ئەوە دروستە نونەکە بهێڵیتەوە یان حذفی کەیت،

---

[١] ئایەتی (١)ی سورەتی البیّنة. پوختەی ماناکەی:{ئەوانەی کەبێ بڕوا بوون .....} .إعرابی تەواوی بەم شێوەیە: لَمْ/حرف نفي وجزم وقلب. يكُ/فعل مضارع ناقص مجزوم بـ(لم)وعلامة جزمه السكون على النون المحذوفة للتخفيف في قراءة شاذة. الّذين/اسم موصول مبني على الفتح في محل رفع اسم(يك). كفروا/فعل ماضي مبني على الضم لاتصاله بواوالجماعة، والواو/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. وجملة(كفروا)لامحل لها من الاعراب لأنها صلةالموصول. وخبر(يك)(منفكين) في آخرالاية. الشاهد في هذه الاية:(يك)حيث حذف منه النون جوازا، في قراءة شاذة وذلك لانّ مابعد النون ساكن.

[٢] ابن صیاد یەکێك بووە لە جوولەکەکانی مەدینەولەسەردەمی پێغەمبەردا_ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ_ ژیاوەوزۆرێك لە نیشانەکانی( دجّال)ـی تێدابووە، زانایان لەهاوەلأن ودوای ئەوانیش ڕایان جیایە دەربارەی ئەوەی کە ئایە مسوڵمان بووە یان نا؟ وەئایە دجّالە یان نا؟ وەئایە دجّالی گەورە یە یان دجّالی بچووك؟ بۆیە ئیمامی عومەر داوای کردووە لە پێغەمبەر_ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ_ کە مۆڵەتی بدا بیکوژێت، پێغەمبەریش پێی فەرموو:ئەگەر ئەو دجّال بێت ئەوە تۆ ناتوانی بیکوژی_چونکە دجّال لەلایەن پێغەمبەرعیسی_علیه السلام_دەکوژرێت، خۆئەگەر دجّالیش نەبێت ئەوە خێرت ناگابیکوژی.

[٣] لێرەدا دروست نیە نونی (یکُن) حذفکرێ چونکە جێناوی لکاوی پێوەیە،وەکو ابن عقیل فەرموویەتی.

[٤] واتا:نونی(یکُن).

وەکو:( لَمْ یکُنْ زیدٌ قائماً، ولَمْ یكُ زیدٌ قائماً)، جا قسەی دانەر وادەخوازێ کە جیاوازی نیە لە نێوان(کان)ـی ناتەواو(الناقصة)وتەواو(التامة)، وەخوێندراوەتەوە.ئەم ئایەتە﴿وَإِنْ تَكُ حَسَنَةٌ يُضَاعِفْهَا﴾[1]، بەخوێندنەوەی(حسنةٌ) بەمرفوعی، لەم کاتەدا (تكُ) تەواو(تامە) دەبێت.[2].

---

[1] ئایەتی ژمارە(٤٠)ـی سورەتی( النساء)، کورتەی ماناکەی:{ئەگەر چاکەیەی بچووك هەبوو ئەوە خوای گەورە بەرەکەتی بەسەردا دەڕێژێ وچەند بەرامبەر پاداشتی دەداتەوە} . إعرابی تەواوی بەم شێوەیە: و/حرف عطف. إنْ/ حرف شرط جازم مبني على السكون. تَكُ/فعل مضارع تام مجزوم ب(إنْ)وعلامة جزمه السكون على النون المحذوفة للتخفيف، وهو فعل الشرط. حسنةٌ/فاعل (تكُ)التامة مرفوع، إذا قرئ حسنةٌ مرفوعاً ، وإذا قرئ (حسنةً)بالنصب فهو خبر (تك)الناقصة، واسمها ضمير مستترتقديره(هي). يضاعفْها/ فعل مضارع مجزوم بـ(إنْ) وعلامة جزمه السكون،وهوجواب الشرط، وفاعله: ضمير مستتر تقديره(هو). وها/ ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. الشاهدفي هذه الاية/ حذف نون(تكُ) وهي هنا تامة على قراءة من قرأ (حسنةٌ) بالرفع.

[2] پێشتر باسمان کردلە دێڕی ژمارە(١٥١)ـی ئەلفیە، کەفعلی (کان) دەکرێت فعلێکی ناتەواو(ناقص)بێت، وەدەکرێت فعلێکی تەواو(تامة)بێت، جا لەم ئایەتەدا ئەگەر (تكُ)– کە مضارعی(کان)ـیە– فعلێکی ناتەواوبێت ئەوە(حسنةً) منصوب دەبێ، بەلاّم ئەگەر (تك)فعلێکی تەواوبێت ئەوە(حسنةٌ) مرفوع دەبێ.

## باسی( ما،ولا،ولاتَ،وإنْ )ـی هاوشێوەی لیس

١٥٨- إعْمَالَ لَيْسَ أُعْمِلَتْ مَا دُونَ إنْ     مَـــعَ بَقَا النَّفْي وَتَرْتِيبٍ زُكِنْ
١٥٩- وَسَبْقَ حَرْفِ جَرّ اوْ ظَرْفٍ كَمَا     بِـي انْتَ مَعْنِياً اجَازَ العُلَمَا.[1]

پێشتر لەسەرەتای بابەتی (كان)وهاوشێوەكانی باسمان كرد كە نواسخی ابتدا دابەش دەبێت بۆ فعل وحەرف، وەباسی(كان)وهاوشێوەكانی كرا،كەهەموویان فعلی ناسخ[2] بوون، دواتریش باسی فعلە ناسخەكانی تر دەكەین، وەلەم بەشەدا دانەر باسی هەندێ لەوحەرفە ناسخانە دەكات كە هەمان عملی(كان) دەكەن،ئەوانیش بریتین لە:ما، ولا،ولات، وإن.
جا حەرفی (ما)[3]،لای نەوەی تمیم[4] هیچ عمل ناكات[5]، دەڵێت: (مازیدٌقائمٌ) لێرەدا زیدٌ مرفوعە بەهۆی ئەوەی مبتدایە،وقائمٌ: خبرە بۆ زیدٌ، حەرفی (ما) عملی لە هیچ كامیاندا نەكردووە، لەبەر ئەوەی(ما)حەرفێكی

(١) مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:١٥٨-هەمان عملی لیس دەكات(ما) بەسێ مەرج:١-ئەبێ(إن) لەدوایەوە نەیات،٢- وە نەفێكەی مابێ وبەهۆی (إلاّ)ەوە هەڵنەوەشێتەوە، ٣-هەروەها خبرەكەی پێش ناوەكەی نەكەوێ. ١٥٩-بەڵام زانایان بەدروستی دەزانن پێشكەوتنی(جارومجروروظرف) بەسەر اسمی(ما)، وەكوڕستەی:(مابِي أنْتَ مَعْنِياً)واتا:تۆ گرنگیت بە من نەداوە.

(٢) لەباسی بابەتی (كان وأخواتها)دا باسی مانای (نواسخ)مان كرد.

(٣) لە زمانی عەرەبیدا(ما) بۆ (١١)مانابەكار دێت،كەبریتین لەمانە:{١-اسم شرط. ٢- اسم موصول. ٣-اسم استفهام. ٤-ما التعجبية. ٥-حرف مصدري. ٦- حرف زائد. ٧-حرف نفي لاعمل لها. ٨-عاملة عمل ليس (ماالحجازية). ٩-حرف كاف ، ١٠- ما الواقعة بعد نعمَ . ١١- ماالنكرة التامة التي توصف بها النكرة.} .جا ئەوەی لێرەدا باسی دەكەین بریتیە لە جۆری هەشتەم، كە دووناوی هەیە، (عاملة عمل ليس)و(ما الحجازية).

(٤) پێشتر باسی نەوەی تمیم(بنوتمیم)مان كرد.

(٥) واتا لای نەوەی تمیم ئەم حەرفی (ما)یە تەنها بۆ نەفی كردنەوعمل لەدوای خۆی ناكات.

تایبـەت(مخـتص)[1]نیـە، چـونکە دەچـێتە سـەرناو وەکـو:( مازیـدُ قـائمٌ)، وەدەچێتە سەر فعلیش وەکو:(مـایقومُ زیـدٌ)، جاهـەر حـەرفێکیش تایبـەت نەبێ شایەنی عمل کردن نیەوناتوانێ عمل بکات، بەڵام لای حجازییەکان[2]، هـەمان عملـی( لـیس) دەکـات چـونکە هاوشـێوەی (لـیس)یـە لـەو ڕووەوەی هەردووکیان بۆ نەفی کردنی ئێستا(الحال)دێن بەڕەهایی، بۆیـە حجازییـەکان اسمـی پـێ مرفـوع دەکـەن وخبریـشی پـێ منـصوب دەکـەن، وەکـو:(مازیـدٌ قائما)، خوای گەورە دەفەرموێ﴿مَا هَذَا بَشَرًا﴾[3]، هەروەها دەفـەرموێ:﴿مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ﴾[4]، هەروەها شاعریش دەڵێ:

---

[1] مەبەست لەحەرف تایبەت ئەوانەن کە تەنها لەدوایانەوە اسم یان فعل دێت، پێشتر لەبسی (المعرب والمبنی) باسمان کرد.

[2] مەبەست لە حجازییەکان ئەو زانایانەن کە پاڵدراون بۆ لای ناوچەی حجاز، حجاز یەکێکە لە هەرێمە کانی وولاتـی عەرەبستانی سعودی، وە زمانی حجازییەکانیش بە زمانی قورەیش دادەنرێت.

[3] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٣١)ی سورەتی(یوسف)ـە، قسەی ئەو ئافرەتانەیـە کـە زلێخـا کۆیـانی کـردەوە بـۆ گێڕانـەوەی ئـابڕوی خـۆی وبـۆ ئـەوەی بەوانیشی بسەلمێنێ کە لەو کارەدا نەحەقی نەبووە، وئەوانیش وەکو ئەو بیبینن، جا کاتێـك کـە پێغەمبـەر یوسـفیان_علیـە الـسلام_بـینی و...ووتیـان{بێگومـان ئـەم لاوە ئادەمی نیە}. إعرابەکەشی بەم شێوەیە: ما/ نافية عاملة عمل ليس. هذا/ اسم إشارة مبني في محل رفع اسم ما. بشراً/ خبر ما منصوب.

[4] ئەم ڕستەیەش بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٢)ـی سورەتی(المجادلة)، باسی ئەو پیاوانە دەکات کە بە خێزانەکانیان دەڵێن ئێوە وەکو دایکمانن واتا(ظهـار) دەکـەن، جا خـوای گـەورە دەفـەرموێت:{ئەوانـە_واتـا خێزانـەکانیان_ دایکیـان نـین}. إعرابەکەشـی بـەم شێوەیە: ما/ نـافية عاملة عمل ليس. هُنّ/ ضمير منفصل مبني في محل رفـع اسم مـا. أمّهـاتِ/ خبر ما منصوب وعلامة نصبه الكسرة بدل الفتحة لأنه جمع مؤنث الـسالم، وهـو مـضاف ، هـم/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه.

ش٧٥/اَبْنَاؤُهَا مُتَكَنِّفُونَ اَبَاهُــــمْ حَنِقُو الصُّدُورِ وَمَا هُمُ اَوْلاَدَهَا.[١]

بەڵام (ما)لای حجازییەکان ئەم عملە[٢] ناکات مەگەر بە شەش مەرج نەبێ، دانەر[٣] چواریانی باس کرد:

یەکەم: نابێت لەدوایەوە(إن) زیادکرێ، ئەگەر( إن )ـی زیادکراو بەدوایدا هات ئەوە ئەو کات عملی نامێنێت، وەکو:(ماإن زید قائم) بەمرفوع کردنی(قائم)، ودروست نیە منصوب کرێت، بەڵام هەندێ لە زانایان بەدروستی دەزانن.

دووەم: نابێت ماناکەی کە نەفیە هەڵوەشێتەوە بە(إلاّ)[٤]، وەکو:(مازید إلاّقائمٌ)، لێرەدا دروست نیە(قائم) منصوب کرێ، وەوەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿مَا أَنْتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُنَا﴾[٥]، هەروەها وەکو فەرموودەی:﴿وَمَا أَنَا إِلاَّ نَذِيرٌ﴾[٦]، بەپێچەوانەی ئەوزانایانەی بەدروسی دەزانن.[٧]

---

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە بەم شێوەیە: پیاوانی ئەو هۆزە دەوری گەورەکەیان داوە، ودڵیان پڕە لەڕق وکینە بەرامبەر دوژمنەکانیان، لەکاتێکدا ئەوان کوڕی ڕاستەقینەی گەورەکەیان نین. بەڵگەکەی/ (ما)ـی نافیە عملی (لیس)ـەی کردووە، اسمەکەی بریتیە لە(هُم) لەمحلدا مرفوعەو خبرەکەشی بریتیە لە(أولادها) منصوبە.

[٢] واتا: مرفوع کردنی اسم ومنصوب کردنی خبر.

[٣] واتا ابن مالك.

[٤] لەزمانی عەرەبیدا ئەگەر لەدوای(النفی)ـیەوە حەرفی(إلاّ) هات ئەوە مانای نەفیەکە نامێنێت ودەبێتە جێگیر کردن(الاثبات)، وجۆرێك لەجۆرەکانی توکید، کە دواتر باس دەکرێت_إن شاء الله_.

[٥] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(١٥)ـی سورەتی(یاسین)، ڕاڤەکەی{-بێ باوەڕان بە پێغەمبەرەکانیان ووت- بێگومان ئێوەش وەکو ئێمە مرۆڤن} إعرابەکەشی بەم شێوەیە: ما/ نافیة مهملة. انتم/ ضمیر منفصل مبني في محل رفع مبتدا. إلاّ/ حرف استثناء ملغاة. بشرٌ/ خبر مرفوع .مثلُ/ صفة مرفوع وهو مضاف. نا/ ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف الیه.

[٦] ئەم ڕستە قورئانیەش بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٩)ـی سورەتی الاحقاف، کورتەی ماناکەی: {من_واتاپێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ_ تەنها ترسێنەروبێدارکەرەوەم}. إعرابەکەشی بەم شێوەیە: و/ حرف عطف. ما/ نافیة مهملة. أنا/ ضمیر منفصل مبني في محل رفع مبتدأ. إلاّ/ حرف استثناء ملغاة. نذیرٌ/ خبر مرفوع .

[٧] هەر یەك لە پێشەوا یونسی کوڕی حبیب_ کە مامۆستای سیبویەیە_وپێشەوا شەلەوبین پێیان وایە دروستە (ما) عمل بکات هەر چەندە(إلاّ)یشی لەگەڵ بێت.

سیٚ یەم/ نابێت خبرەکەی _کە ظرف وجارومجرور نەبیٚ_ پێش اسمەکەی بکەوێت ،ئەگەر خبرەکەی پێشکەوت ئەوە واجبە مرفوعی بکەیت[١]، وەکو:(ماقائمٌ زیدٌ)،نالٚێیت :(ماقائماً زیدٌ)، هەرچەندە لەمەشدا ڕاجیای(خلاف) هەیە.

جا ئەگەر خبرەکە ظرف یان جارومجرور بوو وەپێشت خست ووتت:(مافی الدار زیدٌ)، وە(ما عندك عمروٌ) لێرەدا زانایان ڕایان جودایە دەربارەی (ما): ئایە عملی کردووە یان نا؟ ئەوزانایانەی پێیان وایە عمل دەکات دەلٚێن: ظرف وجارومجرورەکە لە محلی نصبی خبری (ما) دان، وەئەوانەی پێیان وایە عملی نەکردووە دەلٚێن:ظرف وجارومجرورەکە لەمحلی رفعی خبر دان بۆ مبتداکەی دوای خۆیان، جا ئەم ڕای دووەمە قسەی ئاشکرای دانەرە، چونکە ئەوبەمەرجی گرت کە اسم وخبری (ما) بەو شێوەیە بن کە زانراوە، ئەمەشە مەبەست لەووتەی(وترتیب زُکن)واتا:بەو ڕیزبەندییەی کە زانراوە، مەبەست ئەوەیە کە مبتدا لەپێشەوە بێ وخبریش لە دواوە، ئەمەش وادەخوازیٚ هەر کاتێك خبر پێشکەوت ئەوە(ما) عمل ناکات،یەکسانە ئەوخبرە ظرف وجارومجرور بێت یان شتێکی تر بێت، دانەریش ئەمەی[٢] ڕاستەوخۆ باسکردووە لە غەیری ئەم کتێبە[٣] .

مەرجی چوارەم: نابیٚ معمولی خبرەکەش[٤] پێش اسمی (ما) بکەوێت، ئەگەر ئەو معمولە جگە لە ظرف وجارومجرور بوو، جا ئەگەر پێشکەوێت

---

[١] واتا: لەم کاتەدا (ما) عملی نامێنێت، بۆیە خبرەکەی منصوب دەکەین.

[٢] واتا ئەوەی کە (ما) عمل ناکات ئەگەر خبرەکەی پێشکەوێت، ظرف وجارومجرور بێت یان شتێکی تر.

[٣] مەبەست غەیری ئەلفیەیە.

[٤] پێشتر باسمان کرد کە ئەگەر خبر عامل بوو وەکو ئەوەی{اسمی فاعل ،یان اسمی مفعول، یان صفەی مُشبَّە، ....}ئەوکات خبرەکە پێویستی بە معمول_واتا کارتێکراوێك_ هەیە کە ماناکەی تەواو دەکات.

ئـەوە عملـی (مـا) نامێنێـت وهەڵدەوەشـێتەوە، وەكـو:(مـا طعامَـكَ زیـدٌ آكِلٌ)[١]،لێرەدا دروست نیه (آكلٌ) منصوب بێ، جا ئەو زانایانـەی بەدروسـتی دەزانـن عمل كردنـی (مـا) لـەكاتی پێشكەوتنی خبرەكـەی ئەوەبەدروسـتی دەزانـن عمـل كردنـی لـەكاتی پێشكەوتنی معمـولی خبرەكـەی بـەبێگومان، چونكه لـەم كاتـەدا[٢]خـبر دوا دەكـەوێت و لـەدوای اسمەكـەوە دێ، ئـەكرێت بوترێت ئەمـەش مـەرج نیـە، چونكه لـەعمل كردنـی(مـا)لەگـەڵ پێشكەوتنی معمـول بـەین(الفـصل) دەكەوێتـە نێـوان حەرفەكەومعمولەكـەی[٣] ئەمـەش لەكاتی پێشكەوتنی خبردا نیه.

هەروەهائەكــەر معمــولی خبرەكــە ظــرف وجــارومجرور بووئــەوە عملی(مـا)هەڵناوەشـێتەوە وەكـو:(مـا عنـدك زیـدٌ مُقیما،ومـا بـي أنـت مَعنیـا)[٤]،لەبـەر ئـەوەی ظـرف وجـارومـجرور لەشـتی تـر زۆرتـر بـەكار دێـن لەقسەكردندا. ئـەم مەرجـەش[٥] وەرگـیراوە لـەناوەڕۆكی قـسەی

---

[١] لەم ڕستەیەدا:زیدٌ اسمی (ما)یه، آكِلٌ خبرێتی و طعامَكَ معمولی (آكلٌ)ـه چونكه آكل اسمی فاعله وپێویستی به(فاعل)ـێكه لێرەدا جێناوێكی نادیاره وتقدیرەكەی (هو)ـیه، وه(طعامَكَ)ش مفعول به بۆی.

[٢] واتا:لەكاتی پێشكەوتنی معمولی خبر.

[٣] واتا:لەكاتی پێشكەوتنی معمولی خبر،معمولی حەرفەكه_واتامعمولی(ما)كەبریتیه له اسم وخبرەكەی_دوور دەكەوێتەوه له(ما)، بەڵام لەكاتی پێشكەوتنی خبری(ما) كه معمولی (ما)ـیه بەین ناكەوێته نێوان (ما)ومعمولەكەی.

[٤] لەم دوو ڕستەیەدا(مُقیماومَعْنِیا) خبری(ما)ن،هەردووكیان عاملن(مُقیما)اسمی فاعلەو(معنیا)اسمی مفعوله ئەصلەكەی(مَعْنُویا)بووەوواوەكەی كراوه به یاولەگەڵ یایەكەدا تێهەڵكێش كراوه، وەهەریەك له(عِنْدَ،وبِي)كه ظرف وجارومجرورن معمولی (مقیماومعنیا)ن.

[٥] مەبەست مەرجی چوارەمه.

دانەر[١]، چونکەئەو تایبەتی کرد دروستێتی پێشکەوتنی معمولی خبر بەوەی کە معمولەکە ظرف یان جارومجرور بێت.

*مەرجی پێنجەم:* نابێ (ما) لەڕستەکەدا دووبارە بێتەوە،جائەگەردووبارە بۆیەوە ئەوەعملی نامێنێت،وەکو:(ماما زیدٌ قائمٌ)،(ما)ی یەکەم نافیەیە،ودووەمیش نەفی نەفی کردووە کەواتە ڕستەکە نەفی تێدا نامێنێت ودەبێتە جێگیرکردن(الاثبات)، کەواتە دروست نیە منصوب کردنی قائم،وەهەندێ لەزانایان بەدروستی دەزانن.

مەرجی شەشەم:دەبێت خبری (ما) بری(البدل)ێکی جێگیر(مثبت)ی نەبێت،جائەگەرخبرەکەی بدلی هەبووئەوە عملی نامێنێت،وەکو:(مازیدٌ بشئٍ إلا شئٌ لایُعبأ بە)[٢]،لێرەدا(بشئٍ) کەجارومجرورە لەمحلّی رفعی خبری(زیدٌ)دایە،دروست نیە لەمحلّی نصبی خبری(ما)دا بێت،هەرچەندە هەندێ لەزانایان بەدروستی دەزانن، وەقسەی پێشەوا سیبویە_ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ_دەربارەی ئەم بابەتە[٣] هەردوو بۆچوونەکە هەڵدەگرێت _مەبەستم بۆچوونی ئەوانەیەکەدەڵێن مەرجە خبری(ما) بدلی نەبێت وبۆچوونی ئەوانەش کە دەڵێن مەرج نیە_،جاپێشەوا سیبویە فەرموویەتی دوای ئەوەی باسی نموونەباسکراوەکەی کردووە_کەبیریتی بوولە(مازید بشئٍ، تاکۆتای)_ :هەردوو بۆچوونەکە یەکسانە،واتا بۆچوونی حجازو بۆچوونی تمیم، جاڕاڤەکارانی کتێبەکەی سیبویە ڕایان جیایە دەربارەی ووتەی(هەردووبۆچوونەکە یەکسان) هەندێکیان ووتویانە دووبۆچوونەکە

---

[١] مەبەست دێری ژمارە(١٥٩)ی ئەلفیەیە.

[٢] واتای ڕستەکە: زید شتێك نیە مەگەر شتێك کە بایەخی پێنادرێت، لەم ڕستەیەدا(بشئ)نابێتە خبربۆ(ما)چونکە بدلی هەیە لەڕستەکەدا کە بریتیە لە(شئ)ی دوای حەرفی(إلاّ)کە.

[٣] واتا:دەربارەی مەرجی پێنجەم.

دەربارەی ناوەکەی پێش(إلاّ)کەیە کە(ما)عملی تێدا نەکردووە،کەواتە هەردوو بۆچوونەکە یەکسانن کەئەوناوە مرفوعە،ئەمانەش ئەوانەن کەبەمەرجیان گرتووە بۆعملی(ما) خبرەکەی بدلی نەبێ، هەندێکی تریشیان وتویانە دەگەرێتەوە بۆ ناوەکەی دوای(إلاّ)،کەمەبەست ئەوەیە مرفوعە جایەکسانە (ما)یەکە بکرێتە حجازی یان بکرێتە تمیمی،ئەمانەش ئەوانەن کە بەمەرجی ناگرن بۆ عملی(ما) خبرەکەی بدلی هەبێت، جا بەڵگەی ئەم دووبۆچوونەو پەسەندکردنی بۆچوونی هەڵبژێراو_کەبریتیە لە رای دووەم_ شایەنی باسکردنی ئەم کتێبە کورتە نیە[1] .

---

[1] مەبەستی ابن عقیل کتێبەکەی خۆیەتی_شرح ابن عقیل_ کەکورتە!

***باسی عطفکردنەوەی ناو بۆ سەر خبری( ما ):**

١٦٠- وَرَفْعَ مَعْطُوفٍ بِلَكِنْ أَوْ بِـبَـلْ   مِنْ بَعْدِ مَنْصُوبٍ بِمَا الْزَمْ حَيْثُ حَلْ.[١]

ئەگەر هات لەدوای خبری (ما) حەرفێکی عطف ئەوە بەدەرنیە لەوەی یان بۆ جێگیرکردن(اثبات)ی بڕیارەکەیە بۆ دوای حەرفەعطفەکە،یان نا.[٢]

جا ئەگەر ئەوعطفە جێگیرکردنی حوکم وبڕیارەکەی دەخواست بۆ دوای حەرفە عطفەکە ئەوە پێویستە مرفوع کرێت ناوەکەی دوای حەرفەکە_ ئەمەش وەکو هەردووحەرفی(لکن وبل)_دەڵێیت:(مازیدٌقائما لکن قاعدٌ)یان (بل قاعدٌ)، لێرەدا پێویستە اسمەکە[٣]مرفوع کرێت کەدەبێتە خبر بۆمبتدایەکی حذفکراو،تقدیرەکەشی دەبێتە(لکن هوقاعد، وبل هوقاعدٌ)، وەدروست نیە منصوب کرێت وبکرێتە عطف بۆ سەر خبری(ما)، چونکە (ما)عمل لەنەفی دەکات وعمل لە جێگیرکراوناکات.[٤]

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیە: پێویستە مرفوع کردنی اسمی عطفکراو بۆسەرخبری (ما) بەحەرفی عطفي (لکن وبل)، کاتێك ئەو خبرە جێگیر بووبێت ومانای تەواوبێت.

[٢] مەبەستی ئەوەیە حەرفە عطفەکان لەزمانی عەرەبیدا دوو جۆرن :جۆرێکیان حوکم وبڕیاری پێش حەرفەکە دەگەیێنێت بەدوای حەرفەکە لەڕووی إعراب وماناوە ئەوانیش بریتین لە{و، فـ، ثمّ، حتی، أم، أو} . جۆری دووەم:ئەوانەن کە حوکم وبڕیاری پێش خۆیان تەنها لە ڕووی إعرابیەوە دەگەیێننە دوای خۆیان نەوەك لەڕووی ماناوە، ئەوانیش بریتین لە{لا، لکن، بل }،جاحەرفی(لا) بۆ نەفی کردنی بڕیارەکەی پێش خۆیەتی لەدوای خۆی{نفي الحکم للمعطوف بعد ثبوته للمعطوف علیە}، بەڵام (لکن وبل) بۆ جێگیر کردنی بڕیارەکەیە بۆ دوای خۆیان دوای نەفی کردنی لە ناوەکەی پێش خۆیان ئەگەر حەرفی نفی لەسەرەتای ڕستەکەوە بێت {إیجاب(إثبات) الحکم للمعطوف بعد نفیە عن المعطوف علیە } .

[٣] واتا:اسمە معطوفەکە،(قاعد).

[٤] وەکو ووتمان حەرفی(لکن وبل) بۆجێگیرکردنە.

بـەلام ئەگـەر حەرفـە عطفـە کـە بـۆجێگیرکردن نـەبوو_وەکـو حـەرفی واو وهاوشـێوەی ئـەو_ئـەوە دروسـتە ناوەکـە[1] مرفـوع کـەیت ودروستیـشە منصوبی کەیت،وەرای هەڵبژێراو ئەوەیەکە منصوبی کەیت، وەکو:(مازیدٌ قائماولاقاعـدا)،دروسـتە مرفـوعی کـەیت،دەڵێیت:(ولاقاعـدٌ)لـەم کاتـەدا دەبێتەخبر بۆمبتدایەکی حذفکراو،وتقدیرەکشی(ولاهوقاعدٌ).

کەواتە زانرا لە تایبەت کردنی دانەر پێویست کردنی مرفوع کردنی ناوی دوای حەرفی(بل ولکن)،کەپێویست نیە مرفوعکردنی ناوەکە[2] ،لەدوای جگە لەودوو حەرفە.

* * *

## * باسی زیادکردنی حەرفی (بـ)ـی زیادکراو بۆسەرخبری(ما،ولیس)

١٦١-وَبَعْدَ مَا وَلَيْسَ جَرَّ الْبَا الْخَبَرْ     وَبَعْدَ لاَ وَنَفْيِ كَـــانَ قَدْ يُجَرّ.[3]

زیادئەکرێ حـەرفی(بـ)بەزۆری لـە خبری(لیس،ما)، وەکوفەرموودەی خـوای گـــەورە:﴿أَلَـيْسَ اللَّهُ بِكَـافٍ عَبْـدَهُ﴾[4]،وە وەکـــو﴿أَلَـيْسَ اللَّهُ بِعَزِيـزٍ ذِي انْتِقَامٍ﴾[5]،وە﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾[6]،وەوەکو:

---

[1] واتا:ناوی دوای حەرفەکە(الاسم المعطوف)،کە عطفکراوەتەوە بۆسەر خبری (ما).

[2] واتا:ناوی دوای حەرفەعطفەکە(الاسم المعطوف)،کە عطفکراوەتەوە بۆسەر خبری (ما).

[3] مانـای ئـەم دێـڕەی ئەلفیـە بـەکورتی:هەندێ جار مجرور دەبێت خبری(مـا،ولیس) بەحـەرفی جـڕی(بـــ)ـــی زیـادکراو، وەبەکـەمیش مجـرور دەبێـت خـبری(لا)ـــی هاوشێوەی(لیس)وخبری(کان)،کەنەفی لەپێشەوەبێت بەحەرفی(بـ)ـی زیادکراو.

[4] ئـەم ڕسـتەیە بەشـێکە لەئایـەتی ژمـارە(٣٦)ـــی،سورەتی(الزمـر)،پوختـەی ماناکـەی:{ئایـە خـوا بۆبەنـدەی خـۆی_پێغەمبـەر صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ_بـەس نیە؟} .إعرابەکەشی بەم شێوەیە: أ/ حرف استفهام للتقریر. لیس/فعل ماضٍ ناقص مبني-

على الفتح. اللهُ/لفظ الجلالة،اسم ليس مرفوع. بـ/حرف جر زائد. كافٍ/ اسم مجرورلفظا منصوب محلاً على انه خبر ليس. عبدهُ/مفعول به لاسم الفاعل(كاف)منصوب، وهومضاف. هُ/ضمير متصل مبني في محل جراسم مجرور. الشاهد في هذه الاية/ (بكافٍ) حيث زيدت الباء(باءالتقوية) على الخبر المنفي بليس، وهذا كثير في القرآن الكريم.

(٥) ئەم ڕستەیەش بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٣٧)ـی،سورەتی(الزمر)،کورتەی ماناکەی: {ئایا خوای گەورە زاڵی تۆڵە سێن نیە؟} إعرابەکەشی بەم شێوەیە: أ/حرف استفهام(للتقرير). ليس/فعل ماض ناقص. اللهُ/ لفظ الجلالة،اسم ليس مرفوع. بـ/حرف جر زائد. عزيزٍ/ اسم مجرورلفظا منصوب محلاً على انه خبر ليس. ذي/ نعت مجروروعلامة جره الياء لانه من الاسماء الخمسة، وهومضاف. انتقامٍ/مضاف اليه مجرور. . الشاهد في هذه الاية/ (بعزيزٍ) حيث زيدت الباء(باءالتقوية) على الخبر المنفي بليس.

(٦) ئەم ڕستەیەش بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٣٢)ـی،سورەتی(الانعام)،کورتەی ماناکەی: {پەروەردگارت لەوەی دەیکەن بێ ئاگا نی یە.} . إعرابەکەشی بەم شێوەیە: و/حسب ماقبلها.ما/نافية عاملة عمل ليس. ربُّ/ اسم ليس.وهومضاف ،كَ/ ضميرمتصل مبني في محل جر مضاف اليه.. بـ/حرف جر زائد. غافلٍ/ اسم مجرورلفظا منصوب محلاً على انه خبر ما. عن/حرف جر. ما/اسم موصول في محل مبني على السكون في محل جر اسم مجرور. يعملون/ فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الأفعال الخمسة. والواو/ ضمير متصل ممبني في محل رفع فاعل. وجملة(يعملون) صلةالموصول،لامحل له من الاعراب. . الشاهد في هذه الاية/ (بغافلٍ) حيث زيدت الباء(باءالتقوية) على الخبر المنفي بـ(ما).

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ﴾[١]،جازیادکردنی حەرفی(بـ) بۆخبری(ما) مەرج نیە ئەو(ما)یە حجازی بێت بەپێچەوانەی ڕای هەندێ لەزانایان[٢]،بەڵکو زیاد دەکرێ لەدوای خبری(ما)ی حجازی و(ما)ی تەمیمیش، هەریەك لەپێشەوا سیبویە وفەڕا_ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێبێ_ گێڕاویانەتەوە زیادکردنی حەرفی (بـ) لەدوای(ما)ی تمیمی، کەواتا قسەی ئەوانەی ڕێگەیان نەداوە[٣]هیچ جێی بایەخ نییە، لەکاتێکدا ئەمە[٤] هەیە لەهۆنراوەی تەمیمێکان.

هەروەها بۆچوونی پێشەوا فارسی لەم بارەوە ناجێگیرە،جارێك وتویەتی:حەرفی(بـ) زیادناکرێ مەگەر لەدوای(ما)ی حجازی،وەجارێکیش وتویەتی: حەرفی(بـ) زیاددەکرێ لەدوای خبری نەفی کراو[٥] .

هەروەها هاتووە زیادکردنی حەرفی(بـ) بەکەمی لەدوای خبری(لا)[٦]،وەکو وتەی شاعیر:

---

[١] ئەم ڕستەیەش بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٤٦)ی،سورەتی(فصلت)،کورتەی ماناکەی:{پەروەردگارت ستەم لەبەندەکانی ناکات} إعرابەکەشی بەم شێوەیە: و/حسب ماقبلها.ما/نافية عاملة عمل ليس. ربُ/ اسم ليس.وهومضاف ،كَ/ ضميرمتصل مبني في محل جر مضاف اليه.. بـ/حرف جر زائد. ظلأم/ اسم مجرورلفظا منصوب محلاً على انه خبر ما. للعبيد/جارومجرور متعلقان بـ(ظلامٍ). . *الشاهد في هذه الاية/* (بظلامٍ) حيث زيدت الباء(باءالتقوية) على الخبر المنفي بـ(ما).

[٢] واتا:هەندێ لەزانایان پێیان وایە زیادکردنی حەرفی(بـ)ی زیادکراو تایبەتە بۆ خبری (ما)حجازی.

[٣] واتا:ڕێگەیان نەداوە بە زیادکردنی حەرفی(بـ) لەدوای(ما)ی تمیمی.

[٤] واتا: زیادکردنی حەرفی(بـ) لەدوای(ما)ی تمیمی.

[٥] واتا: حەرفی(بـ) زیاد دەکرێت لەدوای هەموو نەفییەکەوە چ ئەونفییە بە(ما)ی حجازی یان بە(ما)ی غەیری حجازی.

[٦] مەبەست (لا)ی هاوشێوەی(لیس)ەیە.

٧٦- فَكُنْ لِي شَفِيعًا يَوْمَ لاَ ذُو شَفَاعَةٍ بِمُغْنٍ فَتِيلاً عَنْ سَوَادِ بنِ قَارِبِ.[1]

هەروەها هاتووە زیادکردنی حەرفی(بـ) بۆخبری فعلی مضارعی(کان) کەنەفی کرا بێت بە حەرفی(لم)،وەکو ووتەی:

ش٧٧/ وَإِنْ مُدَّتِ الأَيْدِي إِلى الزَّادِ لَمْ أَكُنْ بِأَعْجَلِهِمْ إِذْ أَجْشَعُ القَوْمِ أَعْجَلُ.[2]

***

١٦٢- فِـي النَّكِـرَاتِ أُعْمِلَـتْ كَلَـيْسَ لاَ وَقَـدْ تَلِـــي لاَتَ وَإِنْ ذَا الْعَمَـــلا

١٦٣- وَمَا لِلاَتَ فِي سِوَى حِينٍ عَمَلْ وَحَذْفُ ذِي الرَّفْعِ فَشَا وَالْعَكْسُ قَلّ.[3]

پێشتر باسکرا ئەوحەرفانەی کە عملی لیس دەکەن چوارن،وەباسی حەرفی (ما)کرا،ولێرەدا باسی(لا)و(لات)و(إنْ)ی کرد.

جـا حـەرفی(لا)[4]لای حجازییـەکان عمـل دەکـات وەکـو لیس،بـەلاّم لای تمیمیەکان عملی لیس ناکات وتەنها بۆنەفی کردن بەکاردێت.

---

[1] ئەم دێڕە هۆنراوەیە هۆنراوەی سەوادی کوڕی قاربە کە هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر_ صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ_بووەو هاتۆتە خزمەتی ئازیزو ئەم دێڕە شیعرەی هۆنیوەتەوە، ماناو بەڵگەی شیعرەکە بەم شێوەیە:تۆببە بەتکاکارم لەوڕۆژەدا کەهیچ تکاکار نیە سوودی ئەندازەی دەزووە باریکەی نوکی خورمایەکی هەبێت بۆ سەوادی کوڕی قارب. بەڵگەکەی:ووتەی (بِمُغْنٍ)کە حەرفی(ب) زیادکراوە بۆ خبری(لا)ی نافیە هەروەکو چۆن زیاد دەکرێت بۆ خبری(لیس).

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە بەم شێوەیە:کاتێك دەستان درێژکران بۆ خواردن من خێرا ناکەم،چونکە نەوسن ترین کەس ئەوکەسەیە کە پەلەدەکات. بەڵگەکەی:ووتەی(بِأَعْجَلِهِمْ) حەرفی (ب) زیادکراوە بۆ خبری فعلی مضارعی(کان) کەنەفی کراوە بەحەرفی(لم).

[3] مانای ئەم دوودێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیە:١٦٢-حەرفی(لا)عمل دەکات وەکولیس لەناوی نەناسراو(النکرە)،هەروەها هەردووحەرفی(لاتَ)و(إنْ) هەمان عمل دەکەن ، واتااسمێك مرفوع دەکەن وخبریش منصوب دەکەن. ١٦٣- حەرفی(لات)تەنها لە کاتدا عمل دەکات واتا اسمی (لات)دەبێت ناوێك بێت تەنها بۆ کات(الزمن) بەکاربێت، وەحذفکردنی اسمیەکەی زۆرەوپێچەوانەکەی_واتاحذفکردنی خبرەکەی_کەمە.

[4] لەزمانی عەرەبیدا حەرفی(لا)بۆ حەوت ماناومەبەست بەکاردێت کەئەمانەن:١{ناهیة. ٢-عاطفة. ٣-نافیة غیر عاملة. ٤-نافیة عاملة عمل لیس. ٥-نافیة للجنس. ٦-حرف جواب. ٧-زائدة.} جا ئەوەی لێرەدا مەبەستە جۆری چوارەمە.

هەروەها حەرفی (لا)لای حجازییەکان بەسیٚ مەرج عملی لیس دەکات:
یەکەمیان: دەبیٚت اسم وخبرەکەی نەناسراو(النكره)بن،وەکو:(لارَجُلٌ أفْضَلَ مِنْكَ)[1] ،هەروەها وەکو ووتەی :

ش٧٨/تَعَزَّ فَلاَ شَيءٌ عَلَى الأَرْضِ بَاقِيَاً    وَلاَ وَزَرٌ مِمَّا قَضَى اللهُ وَاقِـــــيَاً.[2]

هەروەها وەکو ووتەی:

ش٧٩/نَصَرْتُكَ إِذْ لا صَاحِبٌ غَيْرَ خَاذِلٍ    فَبُوِّئْتَ حِصْنًا بِالْكُمَاةِ حَصِينَــا.[3]

وەهەنـدیٚ لـەزانایان ووتویانـە حـەرفی (لا)لـە نـاوی ناسراویـشدا عمـل دەکات،ئەم هۆنراوەیەش پاڵدراوە بۆلای نابغە[4]:

ش٨٠/ بدت فعل ذي ود فلما تبعتها    تولت وبقت حاجتي في فؤاديا
وحلت سواد القلب لا انا باغيا    سواها ولا عن حبها متراخيـــا .[5]

---

[1] لەم ڕستەیەدا(رجل)اسمی(لا)یەونکرەیەو(أفضل)خبریٚتی وبەهەمان شیٚوە نکرەیە.

[2] ماناوبەڵگـەی ئـەم دیٚـڕە:خۆڕاگروپـشوودریٚژ بـە لەسـەرنارەحەتیەکان چـونکە هـیچ شـتیٚك لەسـەر زەوی نامیٚنیٚـت، وەهـیچ پەنایـەکیش نیـە پـاریٚزەر بیٚـت لەقـەزاوبڕیاری خوای گەروە. . بەڵگەکەی:(لاشَئٌ باقياً، ولاوزرٌ واقياً)، لیٚرەد دووجار حەرفی(لا)عملـی کردووەولەهەردووکیاندا اسم وخبرەکەی نەناسراوە.

[3] ماناوبەڵگەی ئەم دیٚڕەش: مـن تـۆم سەرخـست لەکاتیٚکـدا هـیچ هاوەڵیٚکـت نـەبوو سەرت خا،جا بووی بەخاوەنی پەناگەیـەکی قایم وپۆڵاین لای کەسیٚکی دلیٚرو ئازا. . بەڵگەکـەی:( لا صَاحِبٌ غَيْرَ) حـەرفی(لا)عملـی کـردووە لەاسـم وخبریٚـك هـەردووکیان نەناسراون.

[4] مەبەست نابغەی جعدیەوناوی قیسی کوڕی عبدالله یەویەکیٚك بووە لەو شاعرانەی زۆر ژیاوەوبەخزمـەت پیٚغەمبـەر_صـلى الله عليـه وسـلم_گەشـتووەوباوەڕی پیٚهیٚنـاوە وبـووە بەیـەکیٚك لـەهاوەڵان_ڕەزای خوایـان لـیٚبیٚ_،سـاڵی ٥٠ك کۆچـی دوای کـردووە، دەڵیٚن ١٨٠ژیاوە.

[5] ماناوبەڵگـــەی ئـــەم دوو دیٚـــرە: دەرکـــەوت خۆشەویـــست ونیـــشانیدا کـــاری خـــاوەن خۆشەویستی،کاتیٚك دوای کەوتم پشتی هەڵکرد،مایەوە پیٚویستی من لەدڵمدا، خۆشەویستی-

قسەی دانەریش جیایە دەربارەی ئەم دێڕە[1]وجارێك ووتویەتی:ئەم دێڕە تأویلكراوە[2]،وەجارێكیش ووتویەتی:ئەم دێرە دەكرێتە پێوەروبەڵگە.

مەرجی دووەم:نابێت خبرەكەی پێش اسمەكەی بكەوێت،كەواتادروست نیە بڵێیت(لا قائماً رجلٌ).

مەرجی سێیەم: نابێت نەفیكە هەڵبوەشێتەوە بەهۆی حەرف(إلاّ)ـەوە، كەواتا دروست نیە بڵێیت:(لارجلٌ إلاّ افضلَ من زیدٍ) و(افضلَ) منصوب كەیت، بەڵكو پێویستە مرفوع كرێت.

جا دانەر باسی ئەم دوو مەرجەی نەكرد.

هەروەها(إنْ)ـی نافیە[3]لای زۆربەی بەصرێكان وپێشەوا فەڕا هیچ عمل ناكات،وەلای كوفێكان_جگەلەفەڕا_ عملی لیس دەكات، لەبەصرێكانیش هەریەك لە(ابوالعباس المبرد،وأبوبكر بن السّرّاج،وأبوعلی الفارسیُّ، وأبوالفتح بن الجنّی) ئەم بۆچوونەیان هەیەودانەریش هەڵیبژاردووە، وەووتوویەتی[4] پێشەوا سیبویهی لە قسەكانیدا ئاماژەی بۆكردووە، هەروەها هاتووەوبیستراوە دەربارەی[5] ،شاعر ووتوویەتی:

---

=ئەوتێكەڵی ڕەشای دڵ بووەوجگەلەویش دوای كەسی تر ناكەوم ولەخۆشەویستی ئەویش درێغی ناكەم. بەڵگەكەی:( لا أنا باغیاً) لێرەدا حەرف(لا)عملی (لیس)ـەی كردووە لەگەڵ ئەوەی اسمەكەی ناسراو(المعرفه)یەكەبریتیە لەجێناوی(انا)، ئەمەش پێچەوانەی یاسایە(شاذ)ـە.

[1] واتا:هۆنراوەكەی نابغە.

[2] تأویلكراو واتا:لادان لەمانای ئاشكراودەرخستنی نهێنی قسەكەو چوون بۆ ماناوواتای دوور،لێرەدا مەبەست ئەوەیە ئەم دێڕە ناكرێتە بەڵگەوپێوەر(القیاس).

[3] لەزمانی عەرەبیدا حەرف(إنْ)بۆ پێنج ماناومەبەست بەكاردێت كەئەمانەن:١-شرطیة جازمة. ٢-شرطیة غیرجازمة. ٣-حرف نفي. ٤-زائدة. ٥-مخففة من (إنّ)الثقیلة. ئەوەی لێرەدا مەبەستە دیارە جۆری سێیەمە.

[4] واتا:دانەر(ابن مالك).

[5] واتا:دەربارەی عمل كردنی(إن).

ش٨١/ إنْ هُوَ مُسْتَوْلِيًا عَلَى أَحَدٍ إلاَّ عَلَى أَضْعَفِ الْمَجَانِينِ.[١]

هەروەها یەکێکی تر ووتوویەتی:

ش٨٢/ إنِ الْمَرْءُ مَيْتًا بِانْقِضَاءِ حَيَاتِهِ وَلَكِنْ بِأَنْ يُبْغَى عَلَيْهِ فَيُخْذَلاَ.[٢]

وەپیشەوا ابن جنی_لەکتێبی المحتسب دا_ گێراوێتیەوەکە سعیدی کوڕی جُبیر[٣] _ڕەزای خوای لێبێ_ خوێندویێتیەوە ئەم ئایەتە﴿إنِ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ عِبَاداً أَمْثَالُكُمْ ﴾[٤] بەمنصوب کردنی عباداً.

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: ئەو کەسە دەسەڵاتی نیە بەسەرکەسدا ،مەگەر بەسەر لاوازترین شێتەکان. . *بەڵگەکەی:*( إنْ هُوَ مُسْتَوْلِيًا) لێرەدا حەرفی (إن)عملی (لیس)ەی کردووەو ناوێکی مرفوع کردووە کەبریتیە لە جێناوی(هو)وخبرێکیشی منصوب کردووە بریتیە لە(مستولیاً).

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: مرۆڤ بەکۆتای هاتنی ژیانی نامرێت، بەڵکو بەوە دەمرێ کە دەست درێژی بکرێتە سەری وسەرشۆڕ کرێ. . *بەڵگەکەی:*( إنِ الْمَرْءُ مَيْتًا) حەرفی (إن)عملی (لیس)ەی کردووەو ناوێکی مرفوع کردووە کەبریتیە لە (المرءُ)وخبرێکیشی منصوب کردووە بریتیە لە(میتاً).

[٣] سعیدی کوڕی جُبیر یەکێکە لەزانا شوێنکەوتە(التابعین)کان وفەقێی هەریەك لە عبدالله ی کوڕی عباس وعبدالله ی کوڕی عمر بووە، یەکێك بووە لەوکۆیلە ئازادکراوەکان ولەبنەڕەتدا خەڵکی حبشە بووەوساڵی ٤٥ك لەدایك بووەو ساڵی ٩٥ك لەلایەن حجاجەوە شەهیدکراوە.

[٤] بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٩٤)ی سورەتی الاعراف، زۆربەی زاناکان بەم شێوەیە﴿إنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ﴾خوێندوویانەتەوە وماناکەی {بەڕاستی ئەوانەی کەئێوە هاوارودوایان لێدەکەن جگەلەخوا ئەوانیش چەند بەندەیەکن وەکو خۆتان.} ،بەڵام هەندێ لەخوێنەرانی قورئان(القُرّاء)لەوانەسعیدی کوڕی جبیر بەم شێوەیە﴿إنِ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ عِبَاداً أَمْثَالُكُمْ ﴾خوێندوویانەتەوەوماناکەی{ئەوانەی کەئێوە هاوارودوایان لێدەکەن جگەلەخوا ئەوانە بەندە نین وەکو ئێوە بەڵکو ئەوانە بەردن.} ،إعرابەکەی لەسەر خوێندنەوەی دووەم بەم شێوەیە: إنْ/ نافیة عاملة عمل -

هەروەها مەرج نیە بۆ عمل کردنی (إنْ) اسم وخبرەکەی نەناسراو(النکره)بن، بەڵکو عمل دەکات لەناوی ناسراوونەناسراو،دەڵێیت:((إنْ رجلٌ قائماً، وإنْ زیدٌ القائمَ، وإنْ زیدٌ قائماً)).

بەڵام حەرفی((لاتَ))بریتیە لە((لا))ی نافیە وتای تأنیثی مفتوحی بۆ زیادکراوە، جالای زۆربەی زانایان هەمان عملی لیس دەکات وناوێك مرفوع دەکات وخبریش منصوب دەکات، بەڵام تایبەتمەندی(لات)ئەوەیە کە اسم وخبرەکەی هەردووکیان باس ناکرێن ویەکێکیان حذف دەکرێ،زۆرتریش وایە لەزمانی عەرەبیدا اسمەکەی حذف کرێت وخبرەکەی بمێنێتەوە،وەکو فەرموودەی خوای گەورە لەم بارەوە﴿ وَلاتَ حِينَ مَنَاصٍ﴾[1] بەمنصوب بوونی ووشەی(حین)،لێرەدا اسمەکەی حذفکراوەوخبرەکەی ماوەتەوە، وتقدیرەکەشی((ولات الحینُ حین مناصٍ)) کەواتە الحینُ:اسمی (لات)ـیەو (حین مناصٍ)خبرێتی، وەخوێندراوەتەوە بە شاذی(ولات حینُ مناصٍ) بەمرفوع بوونی ووشەی(حینُ)کەدەبێتە اسمی (لات)ـەوخبرەکەی

---

-لیس،وحُرك بالکسرة لالتقاء الساکنین. الّذین/ اسم موصول مبني في محل رفع اسم(إنْ). تدعون/ فعل وفاعل (الجملة الفعلیة)صلةالموصول. منْ دُونِ /جارومجرور. اللهِ/ مضاف إلیه مجرور. عباداً/ خبر(إنْ) منصوب. امثالَکُم/ نعت لـ(عباداً) منصوب وهو مضاف. کُمْ/ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف الیه. *الشاهد في هذه الآیة:* إعمال(إنْ)النافیة عمل لیس.

[1] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٣)ی سورەتی(ص)،پوختەی ماناکەی: {_بێباوەڕان لەکاتی هاتنی سزای خوای گەورە هاواریان کرد_لەحاڵێکدا کاتی رزگاربوون نەمابوو} إعرابەکەشی بەشێوەیە: و/حسب ماقبلها. لاتَ/ حرف نفي من أخوات لیس مبني علی الفتح لامحل لها من الاعراب. واسمها محذوف تقدیره:لاتَ الحینُ حینَ مناصٍ. حینَ/خبر لات منصوب وعلامة نصبه الفتحة،وهو مضاف. مناصٍ/مضاف الیه مجرور. . *الشاهد في هذه الآیة:*عملت لات عمل لیس فرفعت الاسم ونصبت الخبر،واسمها محذوف.

محذوفـه،وتقديرەكەشـى دەبێتـه((ولاتَ حـينُ منـاصٍ لهُـم))واتـا:كـاتى ڕزگاربوونيان بۆ نيەونابێ، ئەمەشە مەبەست لەووتەى((وَحَذْفُ ذِي الرَّفْعِ- تاكۆتاى دێڕەكه)).

هەروەها ئامارژەى كرد بەووتەى :(( وَمَا لِلاَتَ فِي سِوَى حِينِ عَمَلْ)) بۆئەوەى كەباسى كردووەسيبويه كە(لات)عمل ناكات مەگەر لە كات(الحين)دا،جا زانايان لەم قسەيەدا[1]ڕايان جيايه،هەندێكيان ووتوويانە:مەبەست ئەوەيه كە(لات) تـەنها لەووشـەى(الحين)عمل دەكات،وەلـەهاوواتاكان(المرادف)ـى وەكـو ووشـەى(الـساعه)وهاووێنـەكانى[2]عمـل ناكات،وەهەنـدێكى تـر ووتوويانە:مەبەست ئەوەيـە كە(لات)تـەنها لەوناوانـەدا عمل دەكات كە بۆ كاتن،كـەواتا عمل دەكـات لەووشـەى(الحين)وهاوواتاكـانى، نموونـەى عمل كردنى لەهاوواتاى حين ووتەى شاعر:

ش٨٣/ نَدِم الْبُغَاةُ وَلاَتَ سَاعَةَ مَنْدَمِ     وَالْبَغْيُ مَرْتَـعُ مُبْتَغِيهِ وَخِيـمُ.[3]

جاقسەى دانەر[4]هەردوو بۆچوونەكە[5] هەڵدەگرێت،وەلەكتێبى (التسهيل)دا دانى ناوە بەبۆچوونى دووەمدا، هەروەها بۆچوونى پێشەوا ئەخفەش وايه كـە لات هـيچ كاتێك عمـل ناكات،وەئەگـەر بەدوايـدا نـاوێكى منـصوب هـات

---

[1] واتا:لەقسەكەى پێشەوا سيبويه.

[2] لەزمانى عەرەبيدا ئەم ووشانە هاوواتا(مترادف)ـى ووشەى(حين)ن{الساعة، الوقت، الزمن، بُرهة، عصر، مدة، فترة}.

[3] ماناوبەڵگەى ئەم دێڕە: پەشيمان بوونەوە ستەمكاران وەكاتى پەشيمان بوونەوە نەمابوو،وەبێگومان ستەم ودەستڕێژى سەرقاڵييەكە خوازيارى بەدبەخت ودۆڕاوە.
*بەڵگەكەى*:( وَلاَتَ سَاعَةَ مَنْدَمِ) لێرەدا لات عملى كردووە لە ووشەى(الساعه) كەبەماناى كات دێت وهاوواتاى ووشەى(الحين)ـە.

[4] واتا:قسەى ابن مالك دەربارەى عمل كردنى لات.

[5] واتا:ئەوبۆچوونەى دەڵێت لات تەنها عمل لەووشەى(الحين)دەكات وعمل لەهاوواتاكانى ناكات،وەئەوبۆچوونەشى دەڵێت عمل لەهاوواتاكانيشى دەكات.

ئـەوە بـەفعلێکی نادیـار(مـضمر)منـصوب بـووە نـەوەك بـە حـەرفی(لات)، تقدیرەکەشی دەبێتە((لات أری حین مناصٍ))وەئەگەر بەدوای دا نـــاوێکی مرفـــوع هـــاتبوو ئـــەوە دەبێتـــە مبتـــدا وخبرەکـــەی محـذوفە،تقدیرەکەشـی((لات حـینُ منـاصٍ کـائنٌ لهـم)) خـوای گـەورەش لەهەمووان زاناترە.

## باسی (أفعال المقاربة)[١]

١٦٤- كَكَانَ كَادَ وَعَسَى لَكِنْ نَدَرْ غَيْـــرُ مُضَارِعٍ لِهَذَيْنِ خَبَـرْ.[٢]

ئەمـە جـۆری دووەمـە لەوفعلانـەی هـەڵگر(نواسـخ)ـی مبتدان،ئـەویش بریتیـە لە((كاد))وهاوشێوەكانی، جادانەر باسی یانزە دانەی لەوفعلانە كرد،هیچ ڕاجیاییەك نیە لەوەی كەهەموویان فعلن،جگە لە(عسی)،پێشەوا زاهد[٣] گێراویێتیوە لەپێشەوا ثعلب[٤]كە حەرفە،وئەم بۆچوونە[٥] پاڵدراوە بۆ لای پێشەوا(ابن السّرّاج)[٦]، بەڵام بۆچوونی ڕاست ودروست ئەوەیە كە فعلەوحرف نیە،بەبەڵگەی ئەوەی جێناوی تای فاعل وهاوشێوەكانی[٧] پێوە دەلكێ،وەكو((عسیتُ ،وعسیتُم ،وعسیتُنّ))).

---

[١] ئەمە جۆری سێیەمە لەو شتانەی پێیان دەوترێت (نواسخ الابتدا)، جاماناومەبەست لەم فعلانە بریتیە لەنزیك بوونەوەی پەیدابوونی خبرەكە بۆ ناو(مبتدا)ـەكەو ڕوونەدانی.

[٢] مانای ئەم دێرەی ئەلفیە بەكورتی:وەكو(كان)وایە هەردووفعلی(كاد،وعسی)_ لەڕووەوەی كەناوێك مرفوع دەكەن وخبرێكیش منصوب دەكەن_،بەڵام كەمە خبری ئەم دووفعلە مضارع نەبێ،واتا:فعلی(كاد وعسی)بەزۆری وان كە خبرەكەیان جملەی فعلی بێت وفعلەكەش مضارع بێت.

[٣] ناوی محمدی كوڕی عبدالرحمن ویەكێكە لەزاناكانی تەفسیروڕاڤەكارانی قورئانی پیرۆز،ناسراوە بە زاهیدی بخاری،ساڵی ٥٤٥ك/١١٥٠ز كۆچی دوای كردووە.

[٤] ناوی ئەحمەدی كوڕی یحیایەوناسراوە بەثعلب ویەكێكە لەزاناوپێشەوا یانی كوفە،ساڵی ٢٩١ك/٩٠٣ز كۆچی دوای كردووە.

[٥] واتا:ئەو بۆچوونەی پێی وایە عسی حەرفەوفعل نیە.

[٦] ناوی محمدی كوڕی سەریەوناسراوە بە ابن السراج، یەكێكە لەزاناوپێشەوایانی زانستەكانی زمان وئەدەبی عەرەبی، ساڵی٣١٦ك/٩٢٩ز كۆچی دوای كردووە_خوای گەورە لە هەموویان خۆش بێ ودەرەجەیان عالی كات_.

[٧] مەبەست لە هاوشێوەكانی تای فاعل ئەوجێناوانەیە كە پێیان دەوترێت(ضمائر الرفع المتحركة)،كە سەرجەمیان ١٠جێناون ئەمانەن{تُ ،تَ ،تِ، نا ،تُما ، تُمْ ، تُنَّ ، ألف الاثنين ، واوالجماعة، نون النسوة}،پێشتر لە باسی جێناوەكاندا باسكران.

ئەم فعلانە پێیان دەوترێت(افعال المقاربه)،دیارە هەموویان بۆ نزیك بوون نین ،بەڵكو سێ بەشن:

بەشی یەكەمیان: بۆ نزیك بوونە[1] ،ئەونیش بریتین لە:كاد ،و كرب ،واوشك.

دووەم: بۆ هیواو ئومێدە(الرجاء) ،ئەوانیش بریتین لە: عسى ،وحرى ، واخلولق.

سێیەم:بۆ دەست پێكردن وچوونە ناو ئیش وكارێك(الانشاء) ئەوانیش بریتین لە: جعل، وطفق ،واخذ ،وعلِق، وانشأ.

كەواتا ناونانی ئەم فعلانە بە مقاربە لەبابەتی ناونانی گشتە بە بەش(تسمية الكل ببعض).

ئەم فعلانە هەموویان دەچنە سەر نیهادوگوزارە(المبتدأوالخبر)،مبتداكە مرفوع دەكەن ودەیكەنە ناو بۆخۆیان،وەخبرەكەش دەكەنە خبر بۆی ومنصوبی دەكەن یان لە محلی نصب دەبێت،ئەمەیە مەبەست لە ووتەی دانەر((ككان كاد وعسى))،بەڵام خبر لەم بابەتەدا[2] دەبێت تەنها فعلی مضارع بێت،وەكو:((كاد زيدٌ يقومُ ،وعسى زيدٌ أن يقومُ)).

وەبەكەمی هاتووە خبری عسى وكاد ناو بێت،وەكو ووتەی شاعر:

ش٨٤/أَكْثَرْتَ فِي العَذْلِ مُلِحّاً دَائِمًا لا تُكْثِرَنْ إنِّي عَسَيْتُ صَائِمًا.[3]

هەروەها وەكووتەی:

ش ٨٥/ فَأُبْتُ إِلَى فَهْمٍ وَمَا كِدْتُ آئِبًا وَكَمْ مِثْلِهَا فَارَقْتُهَا وَهْيَ تَصْفِرُ.[4]

---

[1] واتا:نزیك بوونی ماناو مەبەستی خبرەكە بۆ ناوەكە.

[2] واتا:لە افعالی مقاربە.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:زۆرت كرد لە ڕەخنەولۆمە كردنی بەردەوام ، ئیتر بە چونكە من هیوام وایە خۆم بگرمەوە لەقسەكردنت. بەڵگەكەی:( عَسَيْتُ صَائِمًا)،لێرەدا فعلی عسى اسمێكی هەیە كە بریتیە لە جێناوی(تُ)،وەخبرەكەشی ناوە كەبریتیە لە(صائماً) ئەمەش كەمە لەزمانی عەرەبیدا.

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش: گەڕامەوە بۆ لای هۆزەكەم _كەناوی (فهم)ە_ نزیك بوو كە نەگەڕێمەوە ،زۆر جار بووە هۆزو خەڵكیم جێ هێشتووەولێیان دابڕاوم لەكاتێكدا دەیان نوزان ودەگریان، واتا پێویستیان پێم بوو. بەڵگەكەی:( وَمَا كِدْتُ آئِبًا) لێرەدا فعلی كاد اسمێكی هەیە كە بریتیە لە جێناوی(تُ)،وەخبرەكەشی ناوە كەبریتیە لە(آئباً) ئەمەش كەمە لەزمانی عەرەبیدا.

ئەمە بوو مەبەستی دانەر لەووتەی:((لکن ندر–تاکۆتای ))،بەلأم لەوەی کە فەرمووی جگە لە مضارع(غیرمضارع) ناڕوونیەك هەیە،لەبەر ئەوەی جگە لە مضارع دەگرێتە خۆی:ناو،وئاوەڵفرمان(الظرف)، وجارومجرور،وجملەی اسمی،جملەی فعلی بەبێ فعلی مضارع،دیارە کەم نیە هاتنی ئەمانە بە خبر بۆ(عسی وکاد) بەڵکو ئەوەی کە کەم بێ بۆ خبری ئەم دووفعلە بریتیە لە ناو،بەلأم ئەوانی تر نەبیستراوە هاتبن بە خبر بۆیان.

١٦٥– وَكَوْنُهُ بِدُونِ أَنْ بَعْدَ عَسَى    نَزْرٌ وَكَادَ الأَمْرُ فِيهِ عُكِسَا.[1]

واتا لکاندنی (أن) بەخبری عسی زۆرە،بەلأم خالی بوونی لە(أن)کەمە، ئەمەش بۆچوونی پێشەوا سیبویهیە، وەبۆچوونی بەصریێکان وایە کەخالی بوونی خبری عسی لە(أن) دروست نیە مەگەر لەشعردا،وەلە قورئانی پیرۆزیشدا بە (أن)ـەوە هاتووە،خوای گەورە دەفەرمویٚ:﴿ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَ بِالْفَتْحِ﴾[2]،هەروەها دەفەرموێت:﴿عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يَرْحَمَكُمْ﴾[3]. وەنموونە بۆهاتنی بەبێ(أن) ووتەی شاعر:

---

[1] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە بەکورتی: کەمە خبری عسی بەبێ (أن)ـی مصدری ، بەلأم فعلی کاد بەپێچەوانەوەیە_ واتا خبری کاد بەزۆری وایە (أن)ی پێوە نەبێ _.

[2] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٥٢)ـی،سورەتی المائدە،ماناکەی:{نزیکە خوای گەورە سەرکەوتنی تەواوبنێرێت بۆ پێغەمبەر_ صلی الله علیە وسلم_} . إعرابەکەی بەم شێوەیە: فعسی/فـ/حسب ماقبلها. عسی/فعل ماضٍ ناقص مبني على الفتح المقدر. اللهُ/لفظ الجلالة، اسم عسی مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة. أنْ/ حرف نصب ومصدر واستقبال مبني على السكون. يأتيَ/ فعل مضارع منصوب بـ(أن) وعلامة نصبة الفتحة الظاهرة، وفاعله ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره هُو. والمصدر المؤول من(أن) ومابعدها في محل نصب خبر عسی. بالفتح/جارومجرور متعلقان بـ(يأتي). *الشاهد فيها*/اقتران خبر عسی بـ(أن)، وهذا كثير ولم يرد في القرآن إلاّ مقترنا بها.

[3] ئەم ڕستەیەش بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٨)ـی، سورەتی الاسراء، کورتەی ماناکەی: {ئومێد وایە پەروەردگارتان ڕەحمتان پێ بکات_ئەگەر بگەرێنەوە بۆ لای_} . إعرابەکەشی بەم شێوەیە: عسی/فعل ماضٍ ناقص مبني على الفتح المقدر. ربُّكم/ ربُّ/اسم عسی مرفوع، وهو مضاف ،كُمْ/ ضمير متصل–

ش٨٦/عَسَى الْكَرْبُ الَّذِي أَمْسَيْتَ فِيهِ   يَكُـونُ وَرَاءَهُ فَــــــرَجٌ قَرِيبُ.[١]

هەروەها وەکو ووتەی:

ش٨٧/ عَسَى فَرَجٌ يَأْتِي بِهِ اللهُ إِنَّهُ   لَهُ كُلَّ يومٍ فِي خَلِيقَتِهِ أَمْـــرُ.[٢]

بەڵام فعلی(کاد)ئەوە دانەر باسی کرد کەپێچەوانەی فعلی(عسی)ـیە،زۆرتر وایە خبرەکەی(أن)ـی پێوە نەلکێت وبەکەمیش هاتووە پێوە لکانی، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەی کە ئەندەلوسییەکان[٣] کە وتوویانە لکانی (أن)بەخبری (کاد)ـەوە تایبەتە بە شعر، جانموونەی خالی بوونی لە(أن)،فەرموودەی خوای گەورە﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ﴾[٤]، وەفەرموودەی﴿مِنْ بَعْدِ مَا

---

مبني في محل جر مضاف اليه. أنْ/ حرف نصب ومصدر واستقبال مبني على السكون. يرحم/ فعل مضارع منصوب بـ(أن) وعلامة نصبة الفتحة الظاهرة، وفاعله ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره هُو، وكُمْ/ ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. والمصدر المؤول من(أن) ومابعدها في محل نصب خبر عسي. الشاهد فيها/ اقتران خبر عسى بـ(أن)، وهذا كثير ولم يرد في القرآن إلاّ مقترنا بها.

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە بەم شێوەیە: نزیکە ئەو نارەحەتییەی کە تێیدای ،لە پاشی بێت رزگـار بـوون ودەرووکرانەوەیـەکی نزیـک . . بەڵگەکـەی:( يَكُـونُ وَرَاءَهُ...)لێـرەدا خبری عسی فعلێکی مضارعەو (أن)ـی پێوە نەلکاوە، ئەمەش کەمە لە زمانی عەرەبیدا.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش:نزیکە خوای گەورە دەرووکرانەوەودەربازبوونێك بێنێت، بێگومـان ئـەو هەیـەتی هـەموو رۆژێـك لـەناو دروسـتکراوەکانی بڕیاروفـەرمان. . بەڵگەکەی:( يَأْتِي بِهِ اللهُ..) لێرەدا خبری عسی فعلێکی مضارعەو (أن)ـی پێوە نەلکاوە، ئەمەش کەمە لە زمانی عەرەبیدا.

[٣] مەبەست لـەزانایانی ئەندەلـسە ،کە قوتابخانەیەکی سەربەخۆیان هەیە دەربارەی بابتەکانی رێزمانی زمانی عەرەبی.

[٤] ئـەم رسـتە قورئانیـە بەشـێکە لەئایـەتی ژمـارە(٧١)ـی،سورەتی(البقـرە)،کورتـەی ماناکەی: {پاشان سەریان بڕی_مەبەست ئەو مانگایەیە کەخوای گەورە فەرمانی بە نەوەی ئسرائیل کرد سەری بڕن_ وخـەریك بـوو ئەوسـەر بڕینـە نەکـەن} . إعرابەکەشی بـەم شـێوەیە: فـ/ حـرف عطـف. ذبحـ/فعل مـاضٍ مـبني علـى الـضم لاتـصاله بـواو الجماعة. و/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. ها/ضـمير متـصل مـبني في محل-

كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ﴾[١]، وەنموونەی پێوە لکانی (أن) بە خەبەری (کاد)ـەوە فەرموودەی پێغەمبەر ـ ﷺ ـ: ((مَا كِدْتُ أَنْ أُصَلِّيَ الْعَصْرَ حَتَّى كَادَتْ الشَّمْسُ أَنْ تَغْرُبَ ))[٢]،وەووتەی شاعر:

---

=نصب مفعول به. وما/و:حرف عطف ،ما/ حرف نفي غير عاملة. كادُوا/ فعل ماض ناقص مبني على الضم لاتصاله بواو الجماعة، وا/ / ضمير متصل مبني في محل اسم كاد.والالف :فارقة. يفعلون/ فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون ،الواو/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل، وجملة(يفعلون) في محل نصب خبر كاد. . الشاهد فيها: عدم اقتران خبر كاد بـ(ان)،وهذا كثير.

[١] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١١٧)ـی،سورەتی(التوبة)،کورتەی ماناکەی:{پاش ئەوەی نزیك بوو دڵی کۆمەڵێکیان لە هەق لابدات } إعرابەکەشی بەم شێوەیە: من بعدِ/ جارومجرور متعلقان بمحذوف حالٍ . ما/ الكافة لوقوعها بعد ظرف، ويجوز أن تكون اسم موصول في محل جر مضاف اليه. كادَ/ فعل ماض ناقص مبني على الفتح ، واسمها ضمير الشأن المحذوف. يزيغُ/ فعل مضارع مرفوع . قلوبُ/ فاعل مرفوع ، وهو مضاف ،فريقٍ/ مضاف اليه مجرور. منهم/جارومِجرور وهما في محل جر نعت لفريقٍ . وجملة (يزيغ قلوب فريق..) في محل نصب خبر كاد. . الشاهد فيها: تجرد خبر كاد من (أن) وهذا كثير .

[٢] ئەم فەرموودەیە ئیمامی بخاری ومسلم وغەیری ئەوانیش ڕیوایەتیان کردووە، ماناکەی:{نزیك بوو نوێژی عەسر نەکەم تا خۆر ئابوو–کاتێك پێغەمبەروهاوڵانی سەرقاڵی هەڵکەندنی خندق بوون لەجەنگی ئەحزابدا ونزیك بوو نوێژی عەسریان لەدەست چێت} إعرابەکەشی بەم شێوەیە: ما/نافية غير عاملة .كِدْ/ فعل ماض ناقص مبني على السكون لاتصاله بتاء الضمير ، تُ/ ضمير متصل مبني في محل رفع اسم كاد. أنْ/ حرف نصب ومصدر واستقبال . أُصليَ/ فعل مضارع منصوب بـ(أن)،وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة ، وفاعله ضمير مستتر فيه وجوباً تقديره(انا)، والمصدر المؤول من أنْ وما بعدها في محل نصب خبر(كِدْتُ). العصر/مفعول به منصوب. حتى/حرف عطف. كادَتْ/ فعل ماض ناقص مبني على الفتحة ،والتاء للتأنيث . الشمسُ/ اسم كاد مرفوع وعلامة رفعه الضمة . أنْ/ حرف نصب ومصدر واستقبال. تغربَ/فعل مضارع=

٨٨- كَادَتِ النَّفسُ أَنْ تَفِيضَ عَلَيْهِ     إِذْ غَدَا حَشْوَ رَيْطَةٍ وبُــــرُودِ.[١]

***

***باسى هەردووفعلى( حرى واخلولق ):**

١٦٦ -وكَعَسَى حَرَى وَلَكِــنْ جُعِلاَ     خَبَــرُهَا حَتْمًا بِأَنْ مُتَّصِــلاَ

١٦٧-وَأَلْزَمُوا اخْلَوْلَقَ أَنْ مِثْلَ حَرَى     وَبَعْدَ أَوْشَكَ انْتِفَا أَنْ نَــزُرَا.[٢]

واتا فعلى ((حرى))وەكو((عسى))وايە لەڕووەوەى بۆ بەڵگەبوونە لەسەر ئومێدوڕەجابوون،بـەلأم پێویـستە خبرەكـەى((أن))ـى پێـوە بلكێـت، وەكو((حرى زيدٌ أن يقوم))،وەهيچ كاتێك خبرى حرى بەبێ (أن) نەهاتووە نە لە شعروهۆنراوەداو نەلە غەيرى شعريشدا، هەروەها خبرى فعلى((اخلولق)) پێویستە (أن)ـى پێوە بلكێت ،وەكو((اخْلَوْلَقَتِ السَّمَاءُ أَنْ تُمْطِرَ)) ئەمەش لە نموونـەكانى پێشەوا سيبويه يـە ، هـەروەها فعلـى (أوشك) زۆرتـر وايـە

---

-منصوب بـ(أن)،وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة ، وفاعله ضمير مستتر فيه جوازا تقديره هي ، والمصدر المؤول من أنْ وما بعدها في محل نصب خبر كاد. الشاهد في هذا الحديث: اقتران خبر كاد بـ(أنْ) في الموضعين(أَنْ أُصَلِّيَ ، أَنْ تَغْرُبَ) ،ويصح ذلك ،وان كان الأفصح عند النحاة تجرده منها.

[١] مانـاى ئـەم دێڕە: نزيـك بـوو گيـانم بۆى دەرچێت وبۆى بمرم ، كاتێ خرايـە نـاو پۆشاكى مەرگەوە واتا كاتێك كفن كرا. *بەڵگەكەى*:(( أَنْ تَفِيضَ...)) خبرى كـاد فعلێكى مضارعەو(أن)ـى پێوە لكاوە ،ئەمەش كەمە لەزمانى عەرەبيدا.

[٢] كورتەى ماناى ئەم دوو دێڕەى ئەلفيە :١٦٦-فعلى (حرى) وەكو فعلى(عسى) وايـە لەڕووى ماناو ئيشكردنەوە،بەلأم خبرى حرى پێویستە هەميشە (أن)ـى پێوە بلكێت .١٦٧-هـەروەها بەپێویـستيان داناوە زانايـان لكانـدنى (أن) بـە خبرى فعلى(اخلولق) وەكو خبرى (حرى)، وەبەكەمى هەيە خبرى (أوشك) (أن)ـى پێوە نەبێت .

خبرەکەی (أن)ـی پێوە لکێت وکەمیشە پێوە نەبوونی ، جا نموونەی پێوە لکانی وتەی:

ش٨٩/وَلَوْ سُئِل النَّاسُ التُّرَابَ لأَوْشَكُوا إذا قِيلَ هَاتُوا أنْ يَمَلُّوا ويَمْنَعُوا.[1]

وەنموونەی پێوەنەبوونی (أن) بەخبرەکەیەوە ووتەی:

ش٩٠/ يُوشِكُ مَنْ فَرَّ مِنْ مَنِيَّتِهِ فِي بَعْضِ غِرَّاتِـــــــهِ يُوَافِقُهَا.[2]

***

## *باسی فعلی(کرب)،وبەکارنەهێنانی( أن )...

١٦٨- وَمِثْلُ كَـــادَ فِي الأَصَحِّ كَرَبَا وَتَرْكُ أَنْ مَعْ ذِي الشُّرُوعِ وَجَبَا
١٦٩-كَأَنْشَأَ السَّائِقُ يَحْدُو وَطَفِقْ كَـــذَا جَعَلْتُ وَأَخَذْتُ وَعَلِقْ .[3]

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: ئەگەر داوا کرێ لە خەڵکی گڵ ئەوە نزیکە _کاتێك بووترێ بێننی_ بێزار بن و نەیدەن .واتا سروشتی مرۆڤ وایە داوای بێ نرخترین شتی لێکرێت حەزناکات جێ بەجێی کات ورێگری دەکات (إلاّ مارحم ربّی). بەڵگەکەی:( أَنْ يَمَلُّوا..)لێرەدا خبری أوشك فعلێکی مضارعەو(أن)ـی پێوە لکاوە،ئەمەش زۆرە لەزمانی عەرەبیدا .

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش: نزیکە ئەو کەسەی لەمردن ڕادەکات لەکاتی جەنگدا ، لە هەندێکاتی بێئاگاییدا تووشی بێت . بەڵگەکەی:( يُوَافِقُهَا) لێرەدا خبری أوشك فعلێکی مضارعەو(أن)ـی پێوە نە لکاوە،ئەمەش کەمە لەزمانی عەرەبیدا .

[3] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:١٦٨- ڕای ڕاستر وایە فعلی(کرب) وەکو فعلی(کاد)وایە- لەڕووەوەی کە خبرەکەی (أن)ـی پێوە نالکێت مەگەر بەکەمی- ، وەپێویستە (أن)لەگەڵ فعلەکانی دەست پێکردن(افعال الشروع) نەیات .١٦٩-وەکو نموونەی (انشأالسائقُ يحدو..)واتا شوانی ووشتر دەستی کرد بە ووتنی گۆرانی بۆ شترەکانی ،هەروەها (أن) بەکارنایات لەگەڵ فعلی(طفق وجعل وأخذ و علق ) کە هەموویان بۆ دەست پێکردن بەکار دێن.

پێشەوا سیبویە دەربارەی فعلی (کرب) تەنها ئەوەی وتووە کە خبرەکەی (أن)ـی پێوە نالکێت ،بەڵام دانەر وتوویەتی کەڕای ڕاستر پێچەوانەی بۆچوونەکەی سیبویهەیە ،ئەویش ئەوەیە کە وەکو((کاد)) وایە ،زۆرتر وایە خبرەکەی (أن)ـی پێوە نالکێت وبەکەمیش هاتووە بە(أن)ەوە، نموونە بۆ پێوە نەبوونی وتەی:

ش٩١/ كَرَبَ الْقَلْبُ مِنْ جَوَاهُ يَذُوبُ حِينَ قَالَ الْوُشَاةُ هِندٌ غَضُوبُ.[1]

هەروەها بیستراوە لە پێوەلکانی أن وتەی:

ش٩٢/ سَقَاهَا ذَوُو الأَحْلاَمِ سَجْلاً عَلى الظَّمَا وَقَدْ كَرَبَتْ أَعْنَاقُهَا أَنْ تَقَطَّعَـا.[2]

وەئەوەی کە باووزانراوە لە خوێندنەوەی ((کَرَبَ)) ئەوەیە کە حەرفی (را)کەی بە مفتوحی بخوێنرێتەوە، وە گێڕدراوەتەوە خوێندنەوەی بە مکسوری .

وە مانای وتەی دانەر((وَتَرْكُ أَنْ مَعْ ذِي الشُّرُوعِ وَجَبَا)) ئەوەیە ئەو فعلانەی کە بۆ دەست پێکردن(الشروع)ە دروست نیە خبرەکەی (أن)ـی پێوە بێت ، چونکە لە نێوان ئەم فعلانەوحەرفی(أن)دا دژ یەك هەن لەڕووی ماناوە،ئەم فعلانە بۆ حال وئێستان وحەرفی (أن)یش بۆ داهاتوو(استقبال)ـە ،نموونەش بۆ ئەم فعلانە وەکو: ((أنشأَ السَّائِقُ يَحْدُو ،وطفقَ زيدٌ يدعو ،وجعلَ يتكلّمُ ،وأخذَ ينظِمُ ، وعلقَ يفْعَلُ كذا))[3].

* * *

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:نزیکە دڵ لە سووتان بۆ خۆشەویست بتوێتەوە ، کاتێك دووزمانەکان وتیان هندی خۆشەویستم لێم توڕەیە . . بەڵگەکەی: (( يَذُوبُ)) لێرەدا خبری ((کرب)) فعلێکی مضارعەو(أن)ـی پێوەنە لکاوە .

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش: ئاویان دایەو تێر ئاویان کرد خاوەن ژیرییەکان دۆڵچەیەك لە کاتی تینوییەتیان ، لەکاتێکدا نزیك بوو ملیان بشکێت وبمرن . بەڵگەکەی: ((أَنْ تَقَطَّعَا) )) لێرەدا خبری ((کرب)) فعلێکی مضارعەو(أن)ـی پێوە لکاوە ،ئەمەش کەمە لەزمانی عەرەبیدا.

[3] مانای ئەم پێنج ڕستەیە بەم شێوەیە:{ شوانی ووشتر دەستی کرد بە ووتنی گۆرانی بۆ شترەکانی ،زید دەستی بە نزاوپاڕانەوە کرد ،هەروەها دەستی کرد بەقسەکردن ، وەدەستی کرد بە هۆنینەوەی شعر ، وەدەستی کرد بە کردنی ئەو کارە }.

١٧٠/ وَاسْتَعْمَلُوا مُضَارِعًا لِأَوْشَكَا          وكَادَ لاَ غَيْرُ وَزَادُوا مُوْشِكَا .[١]

فعلـەکانی ئـەم بابـە گۆڕانکـاری(التـصرف)یـان بەسـەردا نایـات جگـە لـە هـەردووفعلی((کاد،وأوشـك)) ، کـە بـەکار هـاتووە بۆیـان مـضارع، وەکـو فەرمایشتی خوای گەورە:﴿ يَكَادُونَ يَسْطُونَ﴾[٢] ،وە ووتەی شاعر :

- يُوشِكُ مَنْ فَرَّ مِنْ مَنِيَّتِهِ [٣].

هەروەها پێشەوا أصمعی[٤] پێی وایە کە فعلی (یوشك)تەنها بە مضارعی بەکار هاتووە وبە شێوەی ماضی کە (أوشك)ـەیە بە کارنەهاتووە ،بەڵام

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە :بەکاریان هێناوە عەرەب فعلی مضارع بۆ هەردوو فعلی أوشك وكاد وبۆ فعلەکانی تری ئەم بابە بەکاریان نەهێناوە ،هەروەها بەکاریان هێناوە اسمی فاعل بۆ فعلی أوشك و ووتویانە (مُوشك).

[٢] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٧٢)ـی سورەتی(الحج)ـە وماناکەی :{نزیکە _ئەوکافرانەی گوێیان لە ئایەتەکانی ئێمە دەبێت کە بۆیان دەخوێنرێتەوە _هێرش بەرن وپەلاماری ئەو کەسانە بدەن کە ئایەتەکانیان بۆ دەخوێننەوە } إعرابەکەشی بەم شێوەیە: یکادونَ/ فعل مضارع ناقص للمقاربة مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الأفعال الخمسة ، وواوالجماعة /ضمیر متصل مبني في محل رفع اسم كاد . یسطون/ فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الأفعال الخمسة ، وواوالجماعة /ضمیر متصل مبني في محل رفع فاعل ، وجملة (یسطون) في محل نصب خبر كاد . موضع الشاهد في هذه الجملة : یکادون حیث عمل مضارع كاد عمل ماضیه.

[٣] پێشتر لە شاهدی ژمارە (٩٠) مانای ئەم دێڕە مان کرد.

[٤] اصمعی ناوی تەواوی :(عبدالملك بن قریب بن علی بن اصمع)ـە وساڵی ١٢٢کۆچی لە شاری بصرە لەدایك بووەو نازناوەکەی بە ناوی باپیریەوە بووە کە ناوی أصمع بووە، یەکێکە لە کەڵە ناودارو پێشەوایانی عەرەب لە بوارەکانی ئەدەب و ڕێزمان و مێژوو،زۆربەی ناوچەکان گەڕاوە بۆ دەستکەوتن وکۆکردنەوەی زانست وزانیاری ،ساڵی ٢١٦ك کۆچی دوای کردووە خوای گەورە بەباشترین شێوە پاداشتی چاکەی بداتەوە.

بۆچوونەکەی پەسەند نیە ،بەڵکو پێشەوا خلیل گێڕاوێتیەوە بە کارهێنانی ماضی بۆ أوشك ، وەلە شعری عەرەبیشدا هاتووە ،وەکو وتەی :

وَلَوْ سُئِلَ النَّاسُ التُّرَابَ لأَوْشَكُوا إذا قِيلَ هَاتُوا أَنْ يَمَلُّوا ويَمْنَعُوا.[1]

بەڵێ زۆرتر وایە فعلی أوشك بە مضارعی بە کار بێت و کەمە بەکارهێنانی بە ماضیی .

وە ووتەی دانەر:((وَزَادُوا مُوْشِكًا)) مانای وایە هاتووە بە کارهێنانی اسمی فاعل لە فعلی (أوشك)،وەکو ووتەی:

ش٩٣/ فَمُوشِكَةٌ أَرْضُنَا انْ تَعُــــودَ خِلَافَ الأَنِيسِ وُحُوشًا يَبَابَا.[2]

جا بە تایبەت باسکردنی فعلی( أوشك )لەلایەن دانەر ئەوە دەگەیێنێ کە اسمی فاعل بۆ فعلی (کاد)بەکار نەهاتووە،بەڵام وانیە،بەڵکو هاتووە بەکارهێنانی اسمی فاعل بۆفعلی کاد لە شعردا،وەکو ووتەی :

ش٩٤/ أَمُوتُ أَسى يَوْمَ الرِّجَامِ وَإِنَّنِي يَقِينًا لَرَهْــنٌ بِالَّذِي أَنَا كَائِدُ .[3]

جا دانەر باسی ئەمەی کردوە لە کتێبە کانی تری .[4]

هەروەها قسەی دانەر ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە جگە لە فعلی ((کاد،وأوشك)) فعلەکانی تری ئەم بابە مضارع واسمی فاعلیان نیە،بەڵام زانایانی تر پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیان گێڕاوەتەوە ،خاوەنی کتێبی

---

[1] پێشتر لە شاهدی ژمارە (٨٩) مانای ئەم دێڕە مان کرد.

[2] ماناکەی :نزیکە زەوێکەمان _ناوچەکەمان_ببێتە ،پێچەوانەی ئاوە دانی چۆڵ و وێران بێت . بەڵگەکەی:(( فَمُوشِكَةٌ)) لێرەدا اسمی فاعل بەکارهاتووە بۆ فعلی أوشك .

[3] مانای ئەم دێڕە: ئەمرم بە غەم وپەژارەوە ڕۆژی رجام_شوێنێکە جەنگ تێیدا ڕووی داوە_ وەدڵنیام کە بارمتەی ئەو شتەم کەلێی نزیکم واتا کردەوەکانی . بەڵگەکەی : ((كَائِدُ)) اسمی فاعلی فعلی (کاد)ـەیە ئەمەش لای زۆربەی زانایان دروستە .

[4] واتا ابن مالك لەکتێبی تر جگە لە ئەلفیە باسی ئەوەی کردووە کە دروستە فعلی کاد اسمی فاعلی هەبێت .

الانـصاف[١] گێڕاوێتیـوه بـه کارهێنـانی مـضارع واسمـی فاعـل بـۆ فعلـی (عسی)ووتویانه[٢]:عسی یعسی فهو عاسٍ ، هـەروەها پێشەوا جوهـەری[٣] گێڕاوێتێوه مضارعی فعلی (طفِقَ) ،وەپێشەوا کسائی گێڕاوێتێوه مضارعی (جعل) ،خوای گەورە زاناترە.

## * باسی بەکارهێنانی( عسی واخلولق وأوشك )وەکو فعلی تەواو( التام )

١٧١/ بَعْدَ عَسَى اخْلَوْلَقَ أَوْشَكَ قَدْ يَرِدْ غِنًى بِـ((أَنْ يَفْعَلَ)) عَنْ ثَانٍ فُقِـدْ.[٤]

تایبەت کراون هەر سێ فعلی(عسی،واخلولق ،وأوشك) بـەوەی کە بەکاردێن بە تەواوی وناتەواوی(تامّە وناقصە).

جاپێشتر باسی حاڵەتی ناتـەواوی کـرا . حاڵـەتی بـەکارهێنانیان بە تـەواوی ئەوەیە کاتێك بێت لەدوایانەوه (أن)وفعلێك[٥]، وەکو:((عسی أنْ یقُومَ زیدٌ ،واخْلَوْلقَ أنْ یأتيَ ، وأوشَكَ أنْ یفعلَ )) لێرەدا (أن)وفعلەکە لـە محلی رفعدا

---

[١] کتێبی(الانصاف في مسائل الخلاف بین النحویین البصریین والکوفیین)،دانراوی پێشەوا(ابو البرکات عبدالرحمن بن محمد بن أبي سعید الأنباري النحوي) کە ساڵی ٥٧٧ك کۆچی دوای کردووه وزانای ناودار (محمد محی الدین عبدالحمید) تحقیقی کردووه .

[٢] واتا:هەندێ لەعەرەب .

[٣] پێشەوا جەوهەری ناوی تەواوی:(إسماعیل بن حمّاد الجوهري)ـە کە بەرەچەڵەك تورکە و یەکێکە لەپێشەوا ناودارەکانی زمانی عەرەبی وخاوەنی کتێبی(الصحاح)ـە کە یەکێکـە لـە فەرهەنگـە گـەورەکانی زمـانی عـەربی وپێـشەوا ڕازی کـورتی کردۆتـەوه بـە ناونیـشانی (مختـار الـصحاح)، سـاڵی ٣٩٣ك کۆچـی دوای کـردووه . خـوای گـەورە بەباشترین شێوه پاداشتیان بداتەوه.

[٤] مانـای ئـەم دێـڕەی ئەلفیـە: هەندێ جار بـەکاردێن هـەر سێ فعلی(عسی واخلولق وأوشك) بە تـەواو(تام)ـی واتـا پێویستیان بـە خـبر نیـە ،ئەمـەش کاتێك لەدوایانـەوه دەستەواژەی (أن یفعل) بێت ،کە بێنیازیان دەکات لە خبر .

[٥] مەبەست (أن)ـی مصدری وفعلی مضارعە.

دەبنە فاعل بۆ (عسی، واخلولق ،وأوشك )وبێنیازی کردوون لە منصوبێك کە بریتیە لە خبرەکەیان .

ئەمەش [١] بۆ کاتێکە کە لەدوای (أن)ـەکەوە ناوێکی ئاشکرا(ظاهر) نایات کەدروست بێت ببێتە مرفوعی فعلەکەی دوای (أن)ـەکە[٢] ،جا ئەگەر ناوێکی ئاشکرا هات وەکو((عسی أن یقوم زیدٌ)) ئەوە مامۆستا ئەبو عەلی شەلەوبین[٣] پێی وایە ناوە ئاشکراکە دەبێت مرفوعی[٤] فعلی دوای (أن)ـەکە بێت،کەواتا (أن)وفعلەکەی دواوەی دەبنە فاعل بۆ عسی،کەوابوو عسی فعلێکی تەواو(تامە)ـە ،وخبری نیە ، بەڵام هەریەك لە پێشەوا مبردوسیرافی والفارسی پێیان وای ئەم بۆچوونەی مامۆستا شەلەوبین دروستەو، جۆرە إعرابێکی تریش دروستە ئەویش ئەوەیە:ئەوەی لەدوای فعلەکەی دوای(أن)ـەکەوەیە مرفوعە بە عسی ودەبێتە اسمی عسی،وە(أن)ەکەو فعلەکەی لە محلی نصبدا دەبنە خبر بۆ عسی،وپێش اسمەکەی کەوتووە، هەروەها فعلەکەی دوای(أن)ـەکەش فاعلەکەی جێناوێکە دەگەڕێتەوە بۆ فاعلی(عسی)[٥] ،جا دروستە ئەوجێناوە بگەڕێتەوە بۆدوای خۆی[٦] ،چونکە لەنیەتدا لەپێشەوەیە.[٧]

---

[١] واتا ئەوەی کە ئەم فعلانە تام بن وناقص نەبن .

[٢] واتا لەم کاتەدا فعلی دوای (أن)ەکە فاعلەکەی جێناو(ضمیر)نیە .

[٣] مامۆستا الشلوبین ناوی تەواوی :(عمر بن محمد بن عبدالله) ،ساڵی ٥٦٢ك لە شاری اشبیلە لە وڵاتی ئەندەلس لەدای بووەو یەکێکە لە پێشەوایانی زانستەکانی زمانی عەرەبی ، وەنازناوی(الشلوبین)ـە کە بەواتای سوورسپی دێت ، ساڵی ٦٤٥ك کۆچی دوای کردووە ،خوای گەورە بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

[٤] واتا فاعلی( یقوم)ـە

[٥] واتا:بۆ(زیدٌ).

[٦] وەکو جەند جارێك باسمان کرد جێناو دەبێت بگەڕێتەوە بۆ پێش خۆی نابێت بگەڕێتەوە بۆ دوای خۆی .

[٧] مەبەست ئەوەیە لەم ڕستەیەدا(زیدٌ) لەدواوەیەوجێناویشی بۆ گەڕاوەتەوە ،بەڵام لەبنەڕەتدا لەپێشەوەیە .

جا سوودی ئەم ڕاجیایە[١] دەردەکەوێت لە کاتی کردنەدووان(التثنية) وکۆ(الجمع)ومێ (التأنيث)،دەڵێیت لەسەر بۆچوونی غەیری مامۆستا شەلەوبین–((عسی أنْ يقُوما الزيدانِ ،وعسی أنْ يقوموا الزيدونَ ،وعسی أنْ يقُمْنَ الهنداتُ))کەواتا جێناو دێنیت بۆ فعلەکە،چونکە ناوە ئاشکرا (الظاهر)ـە نابێتە فاعل بۆفعلەکە[٢]،بەڵکو دەبێتە فاعل بۆ((عسی))وەلەسەر بۆچونی شەلەوبین پێویستە بڵێیت:(( عسی أنْ يقُومَ الزيدانِ ،وعسی أنْ يقومَ الزيدونَ ،وعسی أنْ تقومَ الهنداتُ))وجێناو نایێنیت بۆ فعلەکە،چونکە فعلەکە ناوەکەی دوای خۆی مرفوع کردووە.

***

١٧٢– وَجَرِّدَنْ عَسَى أَوِ ارْفَعْ مُضْمَرَا بِهَا، إِذَا اسْـمٌ قَبْلَهَا قَدْ ذُكِرَا.[٣]

تایبەتە فعلی عسی لەناو هەموو فعلەکانی ئەم بابەدا بەوەی کاتێك ناوێك لەپێشێوە بێت ئەوە لەم کاتەدا دروستە عسی جێناوێکی هەبێت وبگەڕێتەوە بۆ ناوەکەی پێش خۆی ،ئەمەش بۆچوونی تمیمیەکانە ،هەروەهادروستە خالی بێت لە جێناو،ئەمەش بۆچوونی حجازییەکانە، وەکونموونەی((زيدٌ عسی أن يقوم))جا لەسەر بۆچوونی تمیمییەکان لە فعلی(عسی)دا جێناوێك هەیە دەگەڕێتەوە بۆ(زيدٌ)و(أن يقوم)لەمحلی نصبدا خبرە بۆعسی ،وەلەسەر بۆچوونی حجازییەکان هیچ جێناوێك لە فعلی((عسی))دا نیەو(أن يقوم) لەمحلی رفعدا فاعلە بۆ عسی .

---

[١] واتا ڕاجیای لە إعرابی ڕستەی ((عسی ان يقوم زيدٌ)).

[٢] واتا فعلی(يقوم).

[٣] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:خالی بکە عسی لە جێناو یان جێناوێك بکە بەمرفوعی، کاتێك ناوێك لەپێشێوە هات .

جا سوودی ئەم ڕاجیایە،دەردەکەوێت لە کاتی کردنەدووان(التثنية)وکۆ (الجمع)ومێ (التأنيث)،دەڵێیت -لەسەر بۆچوونی تميمييەکان-((هندٌ عستْ انْ تقومَ ،والزيدانِ عسَيا انْ يقوما ،والزيدونَ عَسَوا انْ يقوموا ،والهندانِ عسَتا انْ تقوما ،والهنداتُ عَسَيْنَ انْ يقُمْنَ ))،بەلاّم- لەسەر بۆچوونی حجازييەکان_ دەڵێیت: (( هندٌ عسى أن تقومَ، والزيدانِ عسى أن يقوما ، والزيدون عسى أن يقوموا ، والهندانِ عسى أن تقوما ، والهندات عسى أن يَقُمْنَ )).

بەلاّم فعلەکانی تری ئەم بابە جگە لە(عسى) پێویستە جێناویان هەبێت [1]،دەڵێیت ((الزيدانِ جعلا ينظِمانِ))لێرەدا دروست نیە فعلەکە[2] جێناوی نەبێ ونالێیت ((الزيدان جعل ينظمان ))هەروەکو دروستە بڵێیت: ((الزيدان عسى أن يقوما)).

***

[1] ئەوجێناوەش دەبێتە اسميان ،وەکو لەنموونەکان ڕوون دەبێتەوە.

[2] واتا فعلی جعل .

**باسی خوێندنەوەی حەرفی (س)ـی (عسى) کاتێ جێناوی رفعی پێوە بلکێ**

١٧٣- وَالْفَتْحَ وَالْكَسْرَ أَجِزْ فِي السِّينِ مِنْ نَحْوِ ((عَسَيْتُ)) وَانْتِقَا الْفَتْحِ زُكِنْ.[١]

کاتێك لكا به(عسى)ـەوە جێناوێك کە دانراوە بۆ حاڵەتی رفع[٢] ،ئەویش بریتیە لە جێناوی کەسی یەکەم(المتكلم)،وەکو((عسيتُ))،یان جێناوی کەسی دووەم وەکو((عَسَيْتَ ،وعَسَيْتِ ،وعسَيْتُما،وعَسَيْتُمْ ،وعَسَيْتُنَّ ))،یان جێناوی کەسی سێیەمی مێی کۆ(الغائبات)،وەکو((عَسَيْنَ))،ئەوە دروستە حەرفی سینەکەی بە مکسوری یان بە مفتوحی بخوێنرێتەوە،بەڵام بە مفتوحی زۆرتر وباوترە، و پێشەوا نافع[٣] خوێندوویێتیەوە ئەم ئایەتە﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ تَوَلَّيْتُمْ ﴾[٤]_بەکسرەی سینەکە_، بەڵام ئەوانی تر [٥] بە مفتوحی خوێندوویانەتەوە.

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: دروستە خوێندنەوەی حەرفی (س)ـی فعلی عسى بەمفتوحی، وبەمکسوری لەهاوشێوەی(عسيتُ)واتا کاتێك جێناوی رفعی پێوە لکا، وەهەڵبژاردنی خوێندنەوەی بە مفتوحی زانراوە.

[٢] پێشتر لە باسی جێناوەکان (الضمائر)دا باسی ئەو جێناوانەمان کرد کە بۆحاڵەتی رفعن.

[٣] ناوی تەواوی(نافع بن عبدالرحمن ابی نعيم)،ساڵی(٧٠)ـی کۆچی لە شاری مدینە لەدایك بووە،یەکێکە لەو حەوت زانایەی کە بە(القُرّاء السبع)واتا حەوت قورئان خوێنەکە ناسراون، ساڵی(١٦٩)ـی ك کۆچی دوای کردووە.

[٤] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٢٢)ـی،سورەتی(محمد)،کورتەی ماناکەی:{جا ئێوە بەتەمان _ئەی ناپاکان_ئەگەر پشت هەڵکەن لە ئیسلام ولە جیهاد....}. إعرابەکەشی بەم شێوەیە: فـ/حسب ماقبلها .هل/ حرف استفهام مبني على السكون لامحل له من الاعراب . عسيْتُم/ فعل ماضٍ للرجاء مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك. تُم/ ضمير متصل مبني في محل رفع اسم عسى . إنْ/حرف شرط جازم مبني على السكون. توَلَّيْتُم/ تولّى:فعل ماضٍ مبني على السكون لاتصاله بضمير،وهو في محل جزم فعل الشرط . تُمْ/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل . وجواب الشرط محذوف ....}. الشاهد فيها: (عسيتم) على قراءة نافع الذي قرأ بكسر سين عسيتم، وجازت هذه القراءة لاتصال ضمير موضوع للرفع ،وقرأ الباقون بفتحها وهو الاعم الاغلب في القراءات.

[٥] مەبەست قورئان خوێنانی ترە.

## إنّ وأخواتها [1]

١٧٤-لإنَّ، أَنَّ، لَيْتَ، لَكِنَّ، لَعَلّ كَأَنَّ، عَكْسُ مَا لِكَانَ مِنْ عَمَلْ
١٧٥-كَإِنَّ زَيْـدًا عَالِـمٌ بِأَنِّـــي كُفْءٌ ،وَلَكِـنَّ ابْنَـهُ ذُو ضِغْـنِ.[2]

ئەمـە بەشـی دووەمـە لـەو حەرفانـەی کـە پێیـان دەوتریـت لابەروهـەڵگری مبتـدا((النـاسـخة للاتبـدا))[3]کـە بـریتین لـە شـەش حـەرف :(( إنَّ ، و أنّ ، و كأنّ، ولكنّ، وليتَ ، ولعلَّ )) بـەڵام پێشەوا سیبویە ڕەحمەتی خوای لێ بیت پێی وایە پێنج حـەرفن "أنَّ" کە فەتحەی هەبێت هەژمارنەکردووە، چونکە ئەصلەکەی"إنَّ " یەو کسرەی هەیە وەکو لە مەودوا باس دێت.

---

[1] إنَّ و هاوشێوەکانی بریتین لە شەش حەرف لای زۆربەی زانایان، کە پێیان دەوترێت" الحروف المشبهه بالفعل" واتا ئەو حەرفانەی کە لە فعل دەچن، جا لێك چوونی ئەم حەرفانە لە فعل لە چەن ڕوویەکەیە:

(ا)- فعل فاعل مرفوع دەکات مفعولیش منصوب دەکات، ئەم شەش حەرفەش خبر مرفوع دەکەن و اسمیش منصوب دەکەن.

(ب)- فعل لە دوایەوە دەبیت ناو "الاسم" بێت، ئەم شەش حەرفەش لەدوایەنەوە ناو دێت.

(ج)- فعلی ماضي مبنیە لەسەر فتحە، ئەم شەش حەرفەش مبنین لەسەر فتحە.

(و)- فعل یان پێك دێت لەسێ حەرف وەکو " ضَرَبَ" یانە لە چوار حەرف وەکو "دحرج" یان لە پێنج حەرف وەکو " تدحرج" ئەم شەش حەرفەش هەندێکیان پێك دێن لە سێ حەرف وەکو ((إنَّ، أنَّ، لیت)) یان لە چوار حەف وەکو ((كأنّ،لعلَّ)) یان لە پێنج حەرف وەکو ((لكنّ )).

[2] پوختەی مانای ئەم دوو دێرەی ئەلفیە:- ١- هەیە بۆ ئەم شەش حەرفە (إنَّ، أنّ،لیت، لكنّ، لعلَّ، كأنّ) پێچەوانەی عملی"كان" واتەی ئەمان اسمەکەیان منصوبە وخبرکەیان مرفوعە.٢-وەکو نموونەی " إنَّ زیداً عالم" بێگومان زید زانایە، بەوەی " اني كفؤٌ" کەمن هاوشانی کچەکەیم، بەڵام " لكنَّ ابنه ذوضغنِ" کوڕەکەی کینە لە دڵە. ئەم دێرە سێ نموونە بوو بۆ إنّ واخواتها.

[3] پێشتر باسی "نواسخ الابتداء" مان کرد.

جا واتـای " إنَّ"و" أنّ" بـۆ بـەهێز کـردن((التوکیـد))ی قـسەیە، وەواتـای " کـأنّ" لێکچوواندنە،وە" لکنّ" بۆ تەواوکردنی و پڕکردنـەوەی قسەی پێشووترە، وە"لیـت" بۆ ئاواتە خواستنە،وە" لعلَّ" بۆ ئومێدبوون وبەزەی پێداهاتنە.

وە جیاوازی نێوان ئومێدبوون " الترجي" و ئاواتخواستن "التمني" ئەوەیـە: ئاواتخواستن بۆ شتێك دەبێ کە دەکرێ ڕووبدات وەکو " لیْتَ زیداً قائمٌ" وە بۆشـتێکیش کـە ناکریـت ڕووبـدات وبێتـەدی[1]،وەکـو" لیـتَ الـشباب یعـود یومـاً"[2] بـەڵام ئومێـد پـێ بـوون "الترجـي " تـەنها بـۆ شـتێك بـەکار دێـت کەبکرێت ڕووبدات، بۆیە دروست نیە بڵێت" لعلّ الـشباب یعـود" هـەروەها جیـاوازی نێـوان ئومێـد پـێ بوون"الترجـي" وترسـان "الاشـفاق" ئەویەکـە ئومێـد بوون بۆ شتێکی وویستراو حەزلێ بووە، وەکو " لعلَّ اللهَ یرحمنـا [3] "، بەڵام ترسـان بۆ شتی ناخۆش و نەویستراوە، وەکو" لعلَّ العدوَّ یقدم"[4] .جا ئەم حەرفانـە[5]، عمـل دەکەن[6] بەپێچەوانەوەی عملی"کان"[7]، اسم منصوب دەکەن و خبر مرفـوع

---

(١) دیارە بە زۆرێش وایە.

(٢) ئەم ڕستەیە هۆنراوەی شاعیری ناودار "ابو العتاهیە"یە کە دەفەرمیت : لیْتَ الشباب یعودُ یوماً، فأخبرَه بما فعل المشیبُ. واتە :- بریا گەنجێتی ڕۆژێك دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی پێم ڕادەگەیاند کە پیری چی لێ کردووم.

(٣) مانای ئەم ڕستەیەواعرابەکەی بەم شێوەیە:- ئومێدمان وایە خوای گەورە ڕەحمان پێبکات اعرابەکەی: لعلَّ/حرف شبە بالفعل للترجي. اللهَ/ اسم لعلّ منصوب وعلامة نصبة الفتحة الظاهرة. یرحمُ/فعل مضارع مرفوع، وفاعلە ضمیر مستتر تقدیرة هو، نا/ ضمیر متصل مبني في محل نصب مفعول بە" والجملة الفعلیة"یرحمنا" في محل رفع خبر" لعلَّ".

(٤) مانای ئەم ڕستەیە :جێی ترسە دوژمن بێت. إعرابی ئەم ڕستەیە هەمان إعراب ڕستەی پێشووە.

(٥) واتە " إنَّ" وهاوشێوەکانی.

(٦) پێشتر باسی((عامل))و((معمول))و((عمل))مان کرد.

(٧) پێشتر باسمان کرد فعلی "کان" و هاوشێوەکانی، اسمەکەیان مرفوعە وخبرەکەیان منصوبە.

دەکەن وەکو:" إنَّ زيداً قائمٌ"، ئەم حەرفانە عمل دەکەن لەهەردوو بەشەکەی ڕستە[1]، ئەمەش ڕاو بۆ چوونی بەصریەکانە، بەڵام کوفێکان پێیان وایە، کە ئەم حەرفانە عمل لە"خبر"دا ناکەن، وخبر بە مرفوعی ماوەتەوە وەکو پێش ئەوەی " إنَّ" بچێتە سەری[2].

---

[1] واتە:لە مبتدا و خبر.

[2] چونکە " إنَّ"و هاوشێوەکانی دەچنە سەر: مبتدا و خبر، کە هەردوو کیان مرفوعن لە ئەصڵدا.

## *باسی ڕیزبەندی اسم و خبری (إنّ وأخواتها ) :

١٧٦- وَرَاعِ ذَا التَّرْتِيبَ إلاَّ فِي الَّذِي    كَلَيْتَ فِيهَا أَوْ هُنَا غَيْرَ الْبَذِي.[١]

واتە: پێویستە پێشکەوتنی ناو"الاسم" لەم باسەدا[٢]، و دواکەوتنی خبرەکەی، مەگەر خبرەکە" ظرف،یان جارومجرور"[٣] بێت، لەم کاتەدامەرج نیە خبر لە دواوە بێت، ئەمەش دوو جۆر لە خۆ دەگرێت:

*یەکێکیان:-* دروستە خەبەر پێش کەوێت یان دوا کەوێت، ئەمەش وەکو،" لیْت فیها غیرَ البذیَ"[٤] یان " لیْتَ هنا غیرَ البذیَ"[٥] واتە :دەم شڕ[٦] ، لێرە دا دروستە پێش کەوتنی "فیها، هنا" بەسەر "غیر"دا ، هەروەها دروستیشە داوکەن.

*دووەمیان:* پێویست(واجب)ـەخبر پێش اسمەکەی کەوێت و نابێت دواکەیت، وەکو "لیتَ فِي الدار صاحِبها"[٧]لێرەدا دروست نیە"في الدار"

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە : ڕەچاوی ئەم ڕیزبەندیە – واتە پێشکەوتنی اسم و دواکەوتنی خبر- بکە مەگەر لە هاو وێنەی ڕستەی "لیت فیها غیر البذیَ" واتا خۆزگە لێرەدا بوایە جگە لەدەم شڕ. واتە لەم ڕستەیەدا خبر پێشکەوتوە دروستە.

[٢] واتا لە باسی إنَّ و هاوشێوەکانی.

[٣] لە بابەتی "مبتدا" باسی جۆرەکانی خبرمان کرد.

[٤] لەم ڕستەیەدا اسمی إنَّ "غیر"یەو دوا کەوتووە، چونکە خبرەکەی جارو مجرورە.

[٥] لەم ڕستەیەشدا بەهەمان شێوە اسمی إنَّ دواکەوتووە،وخبرەکەی پێشکەوتووە کە " هُنا"یە چونکە ئاوەڵفرمان" ظرف"ە.

[٦] واتا:- وشەی "البذیَ" بەمانای دەم شڕودەم پیس دێت .

[٧] لەم ڕستەیەدا "فِي الدار" جارو مجرورە و خبری"لیت"یە، و"صاحبها"اسمەکەیە، و جێناوی"ها"ی لکاوبە"صاحب" ەوە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی "الدار" ، دیارە جێناو دەبێت بگەڕێتە بۆ پێش خۆی بۆیە دروست نیە "صاحب" پێشکەوێت، پێشتر لەدێری ژمارە"١٣٣"ی ئەلفیەدا ئاماژەمان پێکرد.

لەدواوە بێت بۆ ئەوەی جێناوەکە[١] نەگەڕێتەوە بۆ ناوێك کەلە لفظ و پلە"رتبة"دا لەدوا بێت.[٢]

هەروەها دروست نیە پێشکەوتنی معمولی خبر[٣] بەسەر اسمەکەیدا ئەگەر ظرف و جارمجرور نەبوو، وەکو((إنَّ زیداً آکِلٌ طعامَكَ))[٤] دروست نیە بڵێین ((إنَّ طعامَكَ زیدا اکلٌ))، هەروەها ئەگەر معمولی خبرەکە ظرف و جار و مجرور یش بێت دروست نیە پێش اسمەکەی کەوێت، وەکو (( إنَّ زیداً واثقٌ بك))[٥]،یان ((جالسٌ عندك))[٦]، دروست نیە بڵێیت :((إنَّ بك زیداً واثقٌ)) یان(( إنَّ عندك زیداً جالسٌ)) بەڵام هەندێ لەزانایان بەدروستیان داناوە[٧]،ئەم دێڕەش هێنراوەتەوە:

ش٩٥/فَلاَ تَلْحَنِي فِيها فإنَّ بِحُبِّهَا أَخَاكَ مُصَابُ الْقَلْبِ جمٌّ بَلاَبِلُهْ.[٨]

* * *

---

[١] واتا/ جێناوی "ها"ی لکاوبە " صاحب".

[٢] مەبەست لەوەی کە جێناوەکەی بۆ دەگەڕێتەوە ووشەی" الدار"ە، کە بۆ خۆی بەشێکە لە خبر و پلەکەی دواوەیە، بۆیە پێویستە لە"لفظ"دا لە پێشەوە بێت.

[٣] پێشتر باسمان کرد، کە ئەگەر خبر "اسم فاعل" یان "اسم مفعول" بێت ئەوە پێویستی بە"معمول"ە.

[٤] لەم ڕستەیەدا" زیداً"اسم "ی إنَّ "یەو" آکِلٌ " خبریَتي و " آکلٌ" اسمی فاعلە و پێویستی بە" معمول " ێکە کە بریتیە لە " طعامك"ـە.

[٥] لەم ڕستەیەدا " واثقٌ" خبری" إنَّ" یەو اسمی فاعلە وپێویستی بە معمولە کە بریتیە لە" بك" کەجار و مجرورە.

[٦] هەروەها لەم ڕستەیەشدا " جالسٌ" وەکو " واثقٌ" وایە معمولەکەی بریتیە لە"عند" کە ظرفە.

(٧) واتا:- بە دروستیان داناوە معمولی خبری إنَّ پێش اسمەکەی کەوێت ئەگەر معمولەکە ظرف و جار مجرور بێت.

(٨) ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە :سەرزەنشتم مەکە لە خۆشەویستم بۆ ئەو ، چونکە برات دڵی پڕ بووە لە خۆشەویستی ئەو. بەڵگەکەی: پێشکەوتنی معمولی خبری "إنَّ "یە کە بریتیە لە "بحبها" و جارو مجرورە. ئەمەش لای هەندێ لە زانایان دروستە.

## *باسی همزه ی " إنّ"چ کاتێك مفتوحه و چ کاتێك مکسوره[١] :

١٧٧–وَهَمْزَ إِنَّ افْتَحْ لِسَدِّ مَصْدَرِ مَسَدَّهَا وَفِي سِوَى ذَاكَ اكْسِرِ.[٢]

((إنَّ)) سێ حاڵەتی هەیە[٣] واجبە سەر " فتحه"ی هەبێت، وە واجبە ژێر" کسره" ی هەبێت.هەروەها حاڵەتی سێیەمیش بریتیە لە دروستێتی هەردووکیان[٤].

جا واجبە فتحەی بدرێتی ئەگەر ڕاڤەو تقدیر کرێت بە جاووگ((مصدر))ئەویش وەکو ئەوەی ببێتە مرفوعی فعل[٥]، وەکو((يُعْجبُني انَّكَ قائمٌ))[٦]واتا : هەستانی تۆ"قیامُك" ، یان ئەگەر ببێتە منصوبی فعل[٧]، وەکو:((عرفْتُ انَّكَ قائمٌ))[٨]،واتا: هەستانی تۆ

---

(١) واتا چ کاتیك دەڵێین " إنَّ" و چ کاتیك دەڵێین "انَّ".

(٢) پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: همزەی إنَّ– واتا حەرەکەی همزەکەی– مفتوح بکە ئەگەر " إنَّ" خۆی و اسم وخبرەکەی بکرێنە مصدرێك و لە جێی فاعل یان مفعول بە یان شتێکی تر دانرێت جگە لەم حاڵەتەش مکسوری بکە.

(٣) واتا : بەپێی حەرەکەی همزەکەی سێ حاڵەتی هەیە.

(٤) واتا:– کسرەبوونی همزە و فتحە بوونی.

(٥) واتا لە جێی فاعل بێت. دیارە" انَّ" حەرفی مصدریە و لەگەڵ اسم و خبرەکەی دەکرێتە مصدرێك ولە جێی فاعل یان مفعول یان هەر ناوێکی تر بۆ ڕستەکە.

(٦) إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە :– يعجبنُي/ يعجبُ: فعل مضارع مرفوع. ن/ نون الوقاية. ي/ ضمير متصل مبني في محلّ نصب مفعول به مقدم . انَّ/ حرف مشبة بالفعل للتوكيد. كَ/ ضمير متصل مبني في محل نصب اسم "انَّ" . قائمٌ/ خبر انَّ مرفوع. وانَّ ما دخل علية في محل رفع فاعل " يُعجبُ" والتقدير" يُعجبُني قيامُكَ".

(٧) واتا لە جێی "مفعول به" بێت ئەویش لە کاتێکدا لەدوای فعل و فاعلەوە بێت.

(٨) إعرابی تەواوی ئەم ڕستە یەش:– عرفتُ/ فعل و فاعل. انَّ/ حرف مشبه بالفعل ، كَ/ ضمير متصل مبني في محل نصب اسم انَّ. قائمٌ/ خبر انّ مرفوع. و انَّ و معموليها" اسمها وخبرها" في محل نصب مفعول به لـ"عرفْتُ".

"قیامَك"،یان ئەگەر ببێتە مجرور بۆ حرف[١]، وەکو((عجبْتُ مِنْ أنَّكَ قائمٌ))[٢] واتــا: لــە هەســتانی تــۆ " مِــنْ قیامِــك" ، جادانــەر بۆیــە فــەرمووی" لسدّمصدرِمسدَّها"ونەیفەرموو:" لسدِّمفردٍ مسدُها"،چونکە دەکرێ مفرد جێـی بگـرێ[٣]وهەمزەکـەش کەسـرەی هـەبێ بـەواجبی،وەکو((ظننتُ زیدًا إنَّه قائمٌ))لێـرەدا پێویـستە کەسـرەی بـدرێتێ هەرچـەندە دەکـرێ جێـی مفـرد بگرێ،چونکە لە جێی مفعولی دووەمە،بەلاّم ناتوانرێ بە مصدر تقدیرکرێ ودانرێ،چونکە ڕاست نیە بوترێ ((ظننتُ زیدًا قیامَهُ)).

جا ئەگـەر نـەکرا لـە جیـیٚ مـصدر دانـرێ ئـەوە واجـب نیـە فتحـەی بـدریتێ، بـەڵکو کسرەی دەدرێـتێ بـەواجبی[٤]، یـان بـە جـائزی[٥]، وەکـو لـە مـەودوا ڕوونـی دەکەینـەوە، ئەمـەش[٦]دەبێتـەوە بـە دوو جـۆر : یـەکێکیان: ئەوەیـە واجبـە کـسرەی بـدرێتی، دووەمیـان :- ئەوەیـە دروسـتە فتحـەی بـدرێتی و دروستیـشە کـسرەی بـدرێتی، جـا ئامـاژەی کـرد دانـەر بـۆ حاڵـەتی واجـب بوونی کسرەی، بەووتەی :-

١٧٨-فَاكْسِرْ فِي الابْتِدَا وَفِي بَدْءِ صِلَهْ وَحَيْثُ إِنَّ لِيَمِيـــنٍ مُكْمِلَـــــــهْ

١٧٩-أَوْ حُكِيَتْ بِالْقَوْلِ أَوْحَلَّتْ مَحَـلَّ حَالٍ كَزُرْتُـــهُ وَإِنِّــي ذُو أَمَـــــلْ

---

[١] واتا:- لە دوای حەرفی جرەوە " انَّ" و "اسم و خبر"ەکەی بێت.

[٢] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە:عجبْتُ/ فعل و فاعل. منْ/ حرف جر. أنَّ/ حرف مشبه بالفعل. كَ/ ضمير متصل مبني في محل نصب اسم أنَّ، قائمٌ: خبر أنَّ مرفوع،وأنَّ و معموليها في محل جر اسم مجرور،و التقدير " عجبْتُ منْ قيامِكَ".

[٣] واتا:جێی ئەو ووشەیەی کە ڕستەکە پێویستی پێیەتی وماناکەی تەواو دەکات.

[٤] مەبەست لەواجبی ئەوەیە دروست نیە بە هیچ شێوەیەك بکرێتە فتحە.

(٥) مەبەست لە جائزی ئەوەیە دەتوانی همزەی " إنَّ" کسرەی دەیتێ یان فتحە.

[٦] واتا: ئەوەی کە فتحەی نەبێت بەواجبی.

١٨٠-وَكَسَـرُوا مِنْ بَعْدِ فِعْـلٍ عُلِّقَا     بِاللاَّمِ كَاعْلَـمْ إِنَّهُ لَـذُو تُقَـى.[١]

واجبه مكسوركردنى همزەى " انَّ" له شەش شوێندا:

*يەكەم:* ئەگەر لەسەرتاى قسه"ڕسته" وەبێت، وەكو((إنَّ زيداً قائمٌ))كەواتە دروست نيه له سەرەتاوە بە مفتوحى بێ، بۆيە ناڵێيت((أنَّك فاضلٌ عندي))، بەڵكو دەبێت دواكەوێت،دەڵێيت((عندي أنَّكَ فاضلٌ))[٢] وە هەندێ لە زانايان بە دروستان داناوە[٣].

*دووەم:* ئەگەر((إنَّ))لە سەرەتاى((صله))[٤]وە بێ،وەكو((جاء الذي إنَّه قائمٌ))[٥]،

---

(١) پوختەى ماناى ئەم سێ دێرەى ئەلفيه:- كه باسى ئەوشوێنانه دەكات كه پێويست" واجب"ه كسرەى هەبێت همزەى إنَّ- بەم شێوەيه:-

١٧٨- كەسره بده به هەمزەى إنَّ لەم حاڵەتاندا (أ) ئەگەر له سەرەتاى ڕسته"قسه"ەوە بوو،(ب) ئەگەر له سەرەتاى جملەى صله وە بوو واتا له دواى ناوى " موصول"ەوە بوو، (ج) ئەگەر له دواى سوێند خوارنەوە بوو.

١٧٩- (د) ئەگەر له دواى ووتن "القول" هات.(ه) ئەگەر له دواى جملەى حاليەوە هات واتا له دواى "واوالحاليه "وە هات وەكو :سەردانم كرد له كاتێكدا من خاوەن هيوا بووم.

١٨٠- هەروەها ئەگەر لەدواى يەكێك لەكردارەكانى دڵ"افعال القلوب"ەوە هات- دواتر له بابەتەكانى داهاتوودا باسى ئەفعالى قلوب دەكەين- انشاءالله- بەڵام ئەو فعله عملى نەمابێ به هۆى (لام) ەوە ، وەكو :- بزانه بێگومان ئەو خاوەن تەقوايه.

(٢) إعرابى ئەم ڕستەيه بەم شێوەيه:- عند/ ظرف زمان متعلق بـ"فاضل" وهو مضاف. ي/ ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. انَّ/ حرف مشبه بالفعل. ك/ ضمير متصل مبني في محل نصب اسم انَّ. فاضل/ خبر انَّ مرفوع وعلامة رفعة الضمة.

(٣) واتا:لاى هەندێ له زانايان دروسته "انَّ" به مفتوحى بێ له سەرەتاى ڕستەوە.

(٤) پێشتر له باسى((الاسم الموصول))دا پێناسەو ماناى((صلة))مان كرد له شەرح وڕاڤەى دێرى ٩٦ى ئەلفيه.

(٥) إعرابى تەواوى ئەم ڕستەيه بەم شێوەيه:- جاء/ فعل ماضي مبني على الفتح.الذي/اسم موصول مبني في محل رفع فاعل. إنَّ/ حرف مشبه بالفعل،ـه/ضمير متصل مبني في محل نصب اسم إنَّ ،قائمٌ/ خبر إنَّ مرفوع وعلامة رفعه الضمة، والشاهد في هذة الجملة وجوب كسر "إنَّ" لوقعها بعد اسم موصول.

وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ﴾[١].

*سێیەم:* ئەگەر" إنَّ" بیێتە وەڵامی سوێند(جواب القسم) دواتریش قسەو باسی لە سەری دێت.

*چوارەم:* ئەگەر بیێتە ڕستەی گێڕدراوە لە دوای ووتن " القول"[٢]، وەکو((قلْتُ انَّ زیداً قائمٌ))،هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ﴾[٣]جا ئەگەر مەبەست لە ووتن" القول"کە گێڕانەوە نەبوو- بەڵکو مەبەست پێی گومان بوو ئەوە همزەی" إنَّ" کە فتحە وەردەگرێت، وەکو((اتقولُ انَّ زیداً قائمٌ))[٤] واتا أَتظنُّ، گومانت وایە.

---

[١] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە "٧٦" سورەتی (القصص)، پوختەی ماناکەی {دابوومان پێی-بەقارون-ئەوەندە گەنج-ئاڵتون و زیو- کە بێگومان هەڵگرتنی کلیلەکانی- ئەوقاسەو گەنجانە- بەزەحمەت هەڵدەگیرا بۆ کۆمەڵێکی بەهێز}. **إعرابەکەی**:(و/حسب ما قبلها. أتيْ، فعل ماضي مبني على السكون، ونا/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل،والهاء/ ضمير متصل مبني على الضم في محل نصب مفعول به اول، من الكنوز/جار و مجرور متعلقان بـ" أتيناهُ". ما/اسم موصول مبني في محل نصب مفعول به ثان. إنَّ/ حرف توكيدو نصب. مفاتح:- اسم إنَّ منصوب، وهو مضاف.ـهُ / ضمير متصل مبني على الضم في محل جر مضاف إليه. لتنوءُ/ لـ: مزحلقة. تنوءُ/ فعل مضارع مرفوع، وفاعلة ضمير مستتر جوازا تقديره"هي" و جملة" تنوء" في محل رفع خبر إنَّ. الشاهدفيها: ما إنَ :حيث وجب كسر همزة إنَ لأنها وقعت في صدر صلة.

[٢]مەبەست لە ووتن ئەوەیە شتێك بگێڕیتەوەو باسی کەیت.

[٣] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٣٠)ی سورەتی "مريم" پوختەی ماناکەی {پێغەمبەر عیسی علیە السلام- ووتی بێگومان من بەندەی خوام ...}. **إعرابەکەی** : قال/ فعل ماضي مبني على الفتح، وفاعله ضمير مسترّ تقديره"هو". إنَّ حرف مشبه بالفعل، ي/ ضمير متصل مبني في محل نصب اسم إنَّ. عبدُ/ خبر إنَّ مرفوع وعلامة رفعة الضمة الظاهرة وهو مضاف. الله/ مضاف إلية مجرور.

الشاهد فيها:- إنّي...." همزتها مكسورة لأنها محكية بالقول .

[٤] لەم ڕستەیەدا "تقولُ" بەمانای"دەڵێیت" نایات بەڵکو بەمانای " گومانت وایە"دێ.

**پێنجەم:** ئەگەر بکەوێتە سەرەتای ڕستەی حاڵەوە[1]، وەکو((زرتُهُ وإني ذوامل))،وەوەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنْ بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ﴾[2]، وە وەکو ووتەی شاعر:

ش ٩٦/ مَا أَعْطَيَانِي وَلاَ سَأَلْتُهُمَا إِلاَّ وَإِنِّي لَحَاجِزِي كَرَمِي.[3]

**شەشەم:** ئەگەر بکەوێتە دوای کردارێك لەو کردارانەی، بە دڵ ئەنجام دەدرێت " افعال القلوب"[4] وئەو کردارەش هەڵواسراو بێت[5] بە هۆی حەرفی لامەوە،

---

[1] ڕستەی "حال"لە دوای ناوێکی ناسراو"معرفە"ەوە دێت، و لە ناو ڕستەی حالەکەدا جێناو"ضمیر"ێك هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەکە، وە بە زۆریش وایە ڕستەی حال بە حەرفی "واو"دەست پێدەکات و پێ دەوترێت"واو الحالية".

[2] ئایەتی ژمارە "٥" سورەتی " الأنفال"،پوختەی ماناکەی{هەرچۆنێك کە پەروەر دگارت لە ماڵەکەت دەری هێنایت بە هەق و ڕاستی لە کاتێکدا بێگومان دەستەیەك لە باوەڕداران بێزار بوون و پێیان ناخۆش بوو.} .إعرابە کەشی بەم شێوەیە:{كما:- ك/حرف جر للتشبيه.ما/مصدرية،والجار والمجرور في محل رفع خبر لمبتدأ محذوف ، أخراجَكَ/ اخرجَ:- فعل ماضي. والكاف/ ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به مقدم . ربُّكَ/ربُّ:- فاعل مرفوع، وهو مضاف/ ك:- في محل جر مضاف اليه. من بيتكِ/- جار و مجرور متعلقان بـ(اخرج) بالحق:- جار و مجرور متعلقان بمحذوف حال تقديره"ملتبساً بالحق". وإنَّ/و حالية. إنَّ حرف مشبه بالفعل. فريقاً اسم إنَّ منصوب. من المؤمنين/ جارو مجرور متعلقان بمحذوف صفة. لكارهون /ل: مزحلقة. كارهون/ خبر إنَّ مرفوع. الشاهد فيه: وجوب كسرة همزة إنّ لوقوعها في صدر جملةٍ حاليةٍ.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:- ئەو دووانە نە پێیان دام ونەمنیش داوام لێکردن، تەنها بەربەستیش بۆ ئەمە پیاوەتی و کەسایەتی خۆم بوو، واتا لەبەر پاراستی ڕێزی خۆم داوام لێنەکردن.

بەڵگەکەی: ((إلاّ وإنّي)) لێرەداهمزەی إنّ مكسورە چونکە لەدوای واوی حالیەوە هاتووە.

(٤) مەبەست لە افعال القلوب ئەوکردارانەن کە بە دڵ و عەقل ئەنجام دەدرێن، دواتر بە تفصیل باس دەکرێن إنشاءالله.

[5] مەبەست لە هەڵواسینی"افعال القلوب"ئەوەیە کە عملیان نەمێنێت، دواتر. بە تفصیل باس دەکرێت إنشاءالله.

وەکو((علمْتُ إنَّ زیداً لَقائمٌ)). ئەمەش ڕووندەکەینەوە لەمەودا لەبابەتی "ظنَّ" ، جا ئەگەر خبری ئەوکرداره لامی لەسەر نەبوو ئەوکات همزەی " إنَّ " مفتوح دەبێت، وەکو((علمْتُ انَّ زیداً قائمٌ)).

ئەمە[1] ئەو شوێنانە بوو کە دانەر باسی کرد، جا بەگلەی ورەخنە هاتۆتە سەردانر کە هەندێ شوێنی تری باس نەکردووە کە واجبە همزەی " إنَّ" تیایاندا مکسور بێت، ئەوانەش:

*یەکەم:* کاتێك لە دوای"ألا"ی دەست پێکردن" الاستفتاحیە"ەوە بێت، وەکو((الاَ إنَّ زیداً قائمٌ))،وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿أَلا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ﴾[2].

*دووەم:* کاتێك لە دوای" حیثُ"[3]ەوە بێت، وەکو((اجلسْ حیثُ إنَّ زیداً جالسٌ)).

---

[1] مەبەست ئەو شەش شوێنەبوو کەدانەر باسی کردن.

[2] ئەم ڕستەیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە "١٣"ی سورەتی ((**البقرة**))، پوختەی ماناکەی{بێداربن و بزانن کە بێگومان هەر خۆیان-واتا دووڕووکان-گێل و نەفامن....}إعرابەکەی: الا/ حرف استفتاح یفید تنبیە المخاطب ،إنهم/ إنَّ: حرف مشبە بالفعل، هم/ ضمیر متصل مبني علي السکون في محل نصب اسم إنَّ. هُمُ / ضمیر متصل مبني في محل رفع مبتدا/ السفهاء:خبر لـ (هم)مرفوع. والجملة الاسمیة" هم السفهاء" في محل رفع خبر إنَّ. وقیل"هم" ضمیر فصل لا محل لها من الاعراب،و" السفهاء:- خبر إنَّ مرفوع. الشاهد فیها :(إنهم)کسرت همزتها وجوبا لوقوعها بعد"الا" استفتاحیة.

[3] ووشەی "حیث" لەزمانی عەرەبیدا ئاوەڵفرمانی کاتی"ظرف مکان"ـە بە یەکدەنگی زاناکان،هەموو کاتێکیش إضافە دەکرێ بۆ ڕستەیەك لە دوای خۆیەوە، واتا دەبێت إضافە کرێت بۆ لای جملە، دواتر لە بابەتی (الأضافة)دا باس دەکرێت انشاءالله.

سێ یەم/ کاتیك بکەوێتە سەرەتای ڕستەیەك ئەو ڕستەیە خبر بێ بۆ ناوی خود((اسم عین))[١] وەکو((زیدٌ إنّهُ قائمٌ)).

دیارە ئەم شوێنانەش نابنە ڕەخنەو گلەی لە دانەر، چونکە هەموو یان دەچنە ناو ووتەی (( مکسور بکە لەسەرەتای ڕستەوە)) ئەم شوێنانەش بۆیە مکسورن چونکە لەسەرەتای ڕستەوە هاتوون[٢].

* * *

---

[١] مەبەست لە ناوی خود "اسم عین" ئەوەیە بۆ کەس و شتێکی بەرهەست و دیاری کراوبێت"مادلّ علی ذات محسوس قائم بنفسه"، وەکو ناوی کەسێکی دیاریکراو یان هەرشتێکی دیاری کراو و بەرهەست(محسوس).

[٢] واتا ئەم سێ شوێنەی کە هەندێ بە ڕەخنە هێناویانەتەوە بۆ سەر قسەی ابن مالك نابنە ڕەخنە چونکە، هەریەك لە"الا،وحیث،وخبر اسم عین" دەبێت لە دوایانەوە ڕستەی سەربەخۆ بیت.

*** باسی ئەو شوێنانەی دروستە همزەی إن مکسور و مفتوحیش بێت.**

١٨١-بَعْـدَ إِذَا فُجَاءَةٍ أَوْ قَسَـمِ لاَ لاَمَ بَعْـدَهُ بِوَجْهَيْنِ نُمِـي

١٨٢-مَـعْ تِلْوِ فَا الْجَـزَا وَذَا يَطَّرِدُ فِي نَحْوِ خَيْرُ الْقَوْلِ إِنِّي أَحْمَدُ.[1]

واتا دروستە همـزەی "إن" مفتـوح بێـت یـان مکسور بێت ئەگـەر لـە دوای "إذا"ی کتـوپڕ"الفجائیـە" وە بێـت وەکـو((خرجْـتُ فـإذا انّ زیـدًا قـائمٌ))،جـا ئەوزانایانەی دەڵێن دەبێـت مکسور بێت ئـەوە "إن"ـەو دوای خـۆی دەکەنـە ڕستە"جملە"یەکی تەواو و تقدیرە کەش دەبێتـە(( خرجـت فـإذا زیدٌ قـائمٌ)) وە ئەو زانایانەی دەڵێن دەبێت مفتـوح بێت ئـەوە"إنّ" و دوای "إنّ" دەکەنـە ناوێکی تـاك و مـصدرێك ودەیکەنـە مبتدایـەك و "إذا" فجائیەکـەش دەکەنـە خـبری و تقدیرەکـەش((فـإذا قیـامُ زیـدٍ))،واتـا لـە کـاتی ئامـدە بـوونی زیـدا، هـەروەها دروستیـشە لـەم کاتـەدا[2] خبرەکـەی محـذوف بێـت و تقدیرەکـەی((خرجـتُ فـإذا قیـامُ زیـدٍ موجـودٌ))، لەونموونانـەی هـەمزەی إنّ تێدا بە دوو شێوە هاتووە ووتەی:

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە : (١٨١) کاتێك انّ کەوتە دوای " اذا"ی کتوپڕی" الفجائیە"، هەروەها کاتێکیش کەوتە دوای سوێند خواردنێك کە لامی پێوە نەبوو، ئەوە دروستە همزەکەی فتحەی هەبێت و دروستیشە کسرەی هەبێت، (١٨٢) - هەروەها حاڵەتیشی سێیەم کە دروستە همزەی انّ فتحەو کسرەی هەبێ- ئەوەیە بکەوێتە دوای حەرف(فا)ی پاداشت((فاءالجزاء))،هەروەها ئەم حاڵەتە_واتا دروستێتی مفتوح بوون ومکسور بوون_ لەوێنەی ئەم ڕستەیە(( باشترین قسە ئەو قسەیە کە من ستایشی خوادەکەم))واتا هەر کاتێك إن ببێتە خبر بۆ قسە "قول" و خودی خبرەکەش قسە "القول" بێت و فاعلی هەردوو قسەکەش یەك بێت. کەواتا لە چوار حاڵەتدا دروستە همزەی إن کسرە یان فتحەی هەبێت.

[2] واتا: کاتێك همزەکەی مفتوح بێت ولەگەڵ دوای خۆیدا بکرێتە ناوێکی تاك.

ش٩٧/ وَكُنْتُ أَرَى زَيْدًا كَمَا قِيلَ سَيِّدا إِذَا أَنَّهُ عَبْدُ الْقَفَا وَاللَّهَازِمِ.[١]

ئەم دێڕە گێڕدراوەتەوە بە(مفتوح)خوێندنەوەی همزەی (انّ)و بە مکسور خوێندنەوەی، ئەوانەی بە مکسوری خوێندویانەتەوە کردوویانە بەڕستەی سەربەخۆ وتازە[٢] وتقدیری ڕستەکەش((إذا هو عبد القفا واللهازم))، وە ئەوانەی بە مفتوحی خوێندوو یانەتەوە" انَّ" ـەو دوای خۆیان کردووە بە ناو " مصدر"ێك و مبتدایە،و خبرەکەشی دروستە دوو شێوەکەی پێشووتری[٣] بۆ دانرێت، جا لەسەر شێوەوبۆ چوونی یەکەم دەبێتە" فإذا عبودیتهُ "[٤] واتا لە کاتی ئامادە بوونی بەندایەتی ئەو، وە لەسەرشێوەو بۆچوونی دووەم " فإذا عبودتیهُ موجودةٌ"[٥]. هەروەها[٦]دروستە همزەی"انّ" مفتوح یان مکسور بێت کاتێك بکەوێتە دوای سوێندێکەوە کە

---

(١) ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:-من وام گومان دەبرد کاك زید- وەکو ووتراوە- گەورەو بەڕێز بێت، کەچی جەنابی کۆیلەی پشتەمل و قەپۆزە، کە واتە بێڕێزو هیچە. **بەڵگەکەی**: (إذا انه...) لێرەدا إنّ لەدوای (إذا)ی فجائیەوە هاتووە بۆیە دروستە همزەکەی مکسور بێت ودروستیشە مفتوح بێت.

(٢) چونکە وەکو لە دێڕی ژمارە (١٧٨) ئاماژە مان پێکرد هەرکاتێك انّ لەسەرەتای ڕستەوە بێت ئەوە دەبێت همزەکەی مکسور بێت.

(٣) مەبەست لە دوو شێوەکەی پێشوو بریتیە لە ڕستەی(( خرجت فإذا انّ زیدًا قائمٌ))کە باسمان کرد، لەم کاتەدا ڕستەی"انّ زیدًا قائم" دەکرێتە مصدرێك وە خبرەکەی حزفکراوە، وە دەکرێت "إذا"ی فجائیە خبری بێت.

(٤) لەم حاڵە تەدا" عبودتیە" مبتدایەو"إذا"ی فجائیە خبرەکەیەتی.

(٥) لەم حاڵەتەدا" عبودیتە" مبتدایەو خبرەکەی محذوفە.

(٦) لێرەوە باسی حاڵەتی دووەم لەو چوار حاڵەتەی کە دروستە همزەی " انّ" مکسور یان مفتوح بێت،دەکات.

خبرەکەی[١] لامی پێوەنەبێت، وەکو((حلفْتُ انّ زیداً قائمٌ)) دروستە بڵێیت"أَنّ" و بڵێیت"إِنَّ"، وەگێڕدراوەتەوە بە فتحەو کسرە[٢] ووتەی:

ش٩٨/ لَتَقْعُدِنَّ مَقْعَدَ الْقَصِيِّ مِنِّي ذي الْقَاذُورَةِ الْمَقْلِيِّ

أَوْ تَحْلِفِي بِرَبِّكِ الْعَلِيِّ أَنِّي أَبُو ذَيَّالِكِ الصَّبِيِّ .[٣]

کەواتە بە پێی قسەی دانەر دروستە مفتوح کردن و مکسورکردنی همزەی "إنّ" کاتێك لە دوای سوێندەوە بێت و خبرەکەی لامی پێوە نەبێت، جا یەکسانە ڕستەی سوێند پێخوراوەکە فعلی بێت و فعلەکەی ووترا بێت وەکو((حلفت إنّ زیدا قائم))، یان فعلەکەی نەووترا بێت وەکو((والله إن زیدا قائم))[٤] ، یان ڕستەی ناوی بێت وەکو((لعمرك إنّ زيداً قائمٌ))[٥].

---

[١] واتا خبری"إنّ" ەکە.

[٢] واتا فتحەو کسرەی همزەی "انّ".

[٣] مانای ئەم دوو دێڕە: سوێند بێت دەبێت لێم دوور کەویتەوەو لەشوێنێکی دوور دانیشی ئەی کەسی بوغزێنراو وبەدخوو، یان سوێند بخۆی بە پەروەردگاری بەرزو بڵند، کە من باوکی ئەو منداڵەم، دیارە ئەم کەسە لە سەفەر بوو و هاتۆتەوە ماڵ تەماشا دەکات خێزانەکەی منداڵێکی بووە، ئەویش بە گومان بووە لەو منداڵەو ئەم دوو دێڕە شیعرەی ووتووە.

بەڵگەکەی: "انّی"لێرەدا دروستە بڵێین " انّی" و "إنّی"، چونکە لە دوای سوێندەوە هاتووە و خبرەکەی کە" ابو"ـە لامی پێوە نیە.

[٤] لەم ڕستەیەدا "والله" جار و مجرورەو متعلقە بە فعلێکی محذوف کە"حلفت" یان "احلف"یأن " اقسمت" یان "اقسم"ـە.

[٥] لعمرك:- سوێندەو دەبێتە مبتداو خبرەکەی محذوفە، وپێشتر لە شەرحی دێڕی ژمارە(١٣٨) باسمان کرد.

هەروەها[١] دروستەمفتوح بوون و مکسور بوونی همزەی "إنّ" کاتێك بکەوێتە دوای حەرفی(فای پاداشت)"فاءالجزاء"، وەکو((من یأتینی فإنه مکرم))[٢] ،جا ئەگەر بە کسرە بخوێنرێتەوە ئەوە "إنّ"ـەو اسمەکەی و خبرەکەی دەبێتە ڕستەی وەڵام"جواب الشرط"، وەکو ئەوەی ووتبێتی((من یأتنی فهو مکرمٌ))وەئەگەر بە فتحە بخوێنرێتەوە ئەوە"انّ"ـەو اسمەکەی و خبرەکەی دەبێتە مصدرێك و دەکرێتە مبتدا و خبرەکەی محذوفە،وتقدیرەکەی((من یأتنی فإکرامُه موجودٌ))، هەروەها دروستیشە بکرێتە خبر و مبتداکەی محذوف بێت، و تقدیرەکەی دەبێتە" فجزاؤهُ الاکرام". نموونەی ئەوەی بە دوو شێوەکە خوێندراوەتەوە ،فەرموودەی خوای گەورە﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنْكُمْ سُوءاً بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[٣] خوێندراوەتەوە (فأنّهُ غفورٌ رحیم) بە مفتوح بوونی

(١) ئەمە حاڵەتەی سێیەمە لەوحاڵەتانەی کە دروستە همزەی"إن" مفتوح یان مکسور بێت.

(٢) لەم ڕستەیەدا"من" اسمي شرطه و جملەی"فإنّهُ مُکرمٌ"،وەڵامەکەیەتی.

[٣] بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٥٤)ی سورەتی "الانعام" کورتەی ماناکەی{پێویستی کردووە لەسەر خۆی پەروەردگارتان بەزەی و میهرەبانی، بێگومان هەرکەس لە ئێوە کارێکی خراپ بکات بە نەزانی، پاشان بگەڕێتەوە و تەوبە بکات و خۆی چاك بکات ئەوە بەڕاستی خوا لێبوردەی بە بەزەییە}، إعرابەکەی: کتب/ فعل ماضي. ربکم/ فاعل مرفوع وهو مضاف، کم/ ضمیر متصل مبني في محل جر مضاف إلیه. علی نفسه/ جارو مجرور متعلقان ب(کتب)، الرحمة/ مفعول به منصوب ، إنه/ حرف مشبه بالفعل، والهاء/ ضمیر متصل مبني علي الضم في محل نصب اسم إن. مَنْ/ اسم شرط جازم مبني في محل رفع مبتدأ. عمل/ فعل ماضي مبني علي الفتح في محل جزم الشرط، وفاعله ضمیر مستتر تقدیره"هو" و جملة من عمل في محل رفع خبر"ان". منکم/ جارو مجرور متعلقان بمحذوف حال . سُوءاً/ مفعول به منصوب. بجهالة/جارو مجرور متعلقان بمحذوف حال من فاعل عمل. ثم/ حرف عطف. تاب/فعل ماضي مبني علي الفتح، و فاعله ضمیر مستتر تقدیرة"هو". مِنْ بعدهِ/ جارو مجرور متعلقان بـ (تاب).

همزەی"انّ" ،وبە مكسور بوونیش، جائەگەر بە كسرە بخوێنرێتەوە،ئەوە دەبێتە جملەیەك و جوابی"مَنْ"ی شرطیە،وە ئەگەر بە مفتوحی بخوێنرێتەوە ئەوە"انّ"ـەو اسمەكـەی وخبرەكـەی دەبێتـە مبتـدا و خبرەكـەی محـذوفـە، وتقـدیرەی"فـالغُفْرانُ جزاؤُه"،یان دەبێتە خبر ومبتداكەی محذوفە،و تقدیرەكەی" فجزاؤُه الغفرانُ".

هەروەها[1]دروستە مفتوح بوون ومكسوربوونی همـزەی"انّ" ئەگـەر بكەوێتـە دوای مبتدایـەك ئەومبتدایـە لـەمانادا قـسە"قـول"بێـت وخـبری"إن"كـەش قسە"قـول"بێـت ،وبێـژەری هەردوو قسەكەش یـەك بێـت، وەكـو((خیرالقـول إنّـــي أحمـــدُاللّهَ))[2]ئەوزانایانـــەی بـــە مفتـــوح خوێندوویانەتـــەوە فەرموویانـە"أن"ـەو اسـم و خبرەكـەی دەكرێتـە مـصدرێك و دەبنـە خـبر بـۆ ووشـەی"خـیرُ"،و تقدیرەكـەی((خـیر القـول حمدُاللـه)) لێـرەدا"خـیر" مبتدایــــە،و"حمداللـــــە"خـــبرێتی، وەئەوانـــەی بـــە مكـــسوری خوێندوویانەتـــەوە"إنّ" و اســـم وخبرەكـــەیان كـــردووە بـــە جملەیـــەك وئەوجملەیەش دەبێتە خبر بۆ "خیر"، هـەروەكو دەڵێیت((أول قراءتـي سبح اســم ربــك الا علــی))[3]، لێــرەدا أول:مبتدایــە،و((ســبح اســم ربــك الا

---

واصلح/ و :حرف عطف، اصلح/فعل ماضي،وفاعله ضمير مستتر تقديره" هو".
فانه/فـ: واقعة في جواب الشرط. أن/ حرف مشبه بالفعل. والهاء/ ضمير متصل مبني في محل نصب اسم "إن" ،والجملة من (انّ)واسمها و خبرها في محل رفع خبر لمبتدأ محذوف، والتقدير"فجزاؤهُ الغفرانُ". غفور/ خبر أن مرفوع و علامة رفعه الضمة الظاهرة علي أخره ، رحيم/ خبر ثان مرفوع. الشاهد في هذه الاية:((فانه غفور رحيم)) :يجوز في "انّ" فتح همزتها وكسرها، لانه واقع بعد فاء الجزاء.

[1] ئەمە حاڵەتەی چوارەمە لەو حاڵەتانەی كە همزەی"انّ" بە فتحەو دەخوێنرێتەوە.

[2] لێرەدا دوو ڕستەهەیە"خیر القول"،لەگەڵ"إني احمد الله"،ڕستەی دووەم خبرە بۆ ڕستەی یەكەم، هەردوو ڕستەكەش قسەن وبێژەری هەردووڕستەكەش یەكە.

[3] مانای ئەم ڕستەیە:یەكەم و سەرەتای قورئان خوێندنم سورەتی"الاعلی"یە، ئەم ڕستەیە هاوشێوەی ڕستەی(( خیر القول إني احمد الله))یە.

علی))جملەیەو دەبێتە خبربۆ" اوّل"، هەروەها"خیر القول"مبتدایە و" إنّی احمد اللە"دەبێتە خبری،جا ئەم ڕستەیە کە دەبێتە خبر پێویستی بە "رابط"[1]نیە، چونکە جملەکەی کەخبرە لە مانادا مانای مبتداکەیە، ئەمەش وەکو((نطقي اللهُ حسبي)) وایە، هەروەها پێشەوا سیبویە نموونەی بۆ ئەم حاڵەتە[2] هێناوەتەوە بە ووتەی((اولُ ما أقولُ أنّی احمدُ اللە))، جا ئەگەر بە کسرە بخوێنرێتەوە ئەوە پێشتر باسمان کرد کە دەکرێتە ڕستەیەك و ڕستەکەش دەبێتە خبر، کەواتە دەبێتە خبردان بە جملە، لەسەر ئەم بۆ چوونەشن کۆمەڵێك لە زانایانی کۆن وتازە، وەکو پێشەوا: مبرد،زجاج، وسیراف، وأبو بکری کوڕی طاهر، و زۆرێکیش لە زانایانی ڕێزمان عەرەبی.

---

[1] پێشتر لە شەرح وڕاڤەی دێڕی"١١٩" و "١٢٠"ی ئەلفیەدا باسی ئەوەمان کرد هەرکاتێك خبری مبتدا"جملە" بوو ئەوە پێویستە ئەوجملەیە شتێکی تێدا بێت بگەڕێتەوە بۆ مبتدا کەو پێی دەوترێت"رابط".

[2] واتا: حاڵەتەی چوارەمی دروستێتی"مکسور بوون و مفتوح بوونی همزەی" إنّ".

***خبری (إنّ) لامی ابتدا دەچێتە سەری:**

١٨٣-وَبَعْدَ ذَاتِ الْكَسْرِتَصْحَبُ الْخَبَر لاَمُ ابْتِدَاءٍ نَحْـوُ إِنِّي لَـوَزَرْ.[(١)]

دروستە لامی ابتدا[(٢)] بچێتە سەر خبری(إنّ) کاتێك مکسور بێت[(٣)]، وەکو(( إنّ زیداً لقائمٌ). ئەم لامە دەبێت لەسەرەتای ڕستەوە بێت، چونکە مافی لە پێش بوونی قسە " صداره الکلام"[(٤)]ی هەیە، بۆیە دەبوو بخرایەتە سەر"إنّ"ـە بەڵام لەبەر ئەوەی حەرفی لامی ابتدا بۆ بە هێزکردن" التوکید"ە و حەرفی"إنّ"ـەش بەهەمان شێوە بۆ توکیدو بەهێزکردنـە، زانایـان بەباشـیان نـەزانیوە و پێیـان جـوان نـەبووە دوو حـەرف کـە هەردووکیان بۆ یەك مانا بن پێکەوە کۆ بکرێنـەوە، بۆیە هـاتوون لامەکـەیان بردۆتە دواوە وکردوویانەتە سەر خبرەکە، جا ئـەم لامی ابتدایە ناچێتە سەر هیچ کامی تر لە هاو شێوەکانی"إن" کەواتە دروست نیە بڵێیت((لعلّ زیداً لقائمٌ))، بەڵام کوفێکان بە دروستیان داناوە بچێتە سەرخبر"لکنّ" و ئەم دێرە شیعرەیان هێنیوەتەوە:

ش٩٩/ يَلُومُونَنِي فِي حُبِّ لَيْلَى عَوَاذِلِي وَلَكِنَّنِي مِنْ حُبِّـهَا لَعَمِيـدُ.[(٥)]

---

[(١)] کورتەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە: لامی ابتدا دەچێتە سەر خبری "إنّ"کاتێك همزەکەی مکسور بێت، وەکو ڕستەی" إنّی لوزرٌ"واتا:بێگومان من پشت وپەناویارمەتی دەرم.

[(٢)] لامی ابتدا کاتیك دەچێتە سەر خبری"إنّ" پێی دەوترێت"لام المزحلقة"،واتا ترازاو، چونکە لە جێی خۆی-کە لە سەرەتا بوونە- ترازاوە.

[(٣)] واتا: کاتێك همزەی"إن" مکسور بێت.

[(٤)] لەزمانی عەرەبیدا هەندێ ووشە هەن دەبێت لەسەرەتای ڕستەوە بێن"لها صداره فی الکلام"، پێشتر باسمان کرد، جا یەکێك لەو ووشانەی مافی لەسەرتابونی قسەیان هەیە لامی ابتدایە.

[(٥)] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: سەرزەنشتم دەکەن سەرزەنشت کاران دەربارەی خۆشەویستی لیلی بەڵام بێگومان من دڵم پڕە لە خۆشە ویسیتی ئەو و بۆی سووتاوە. **بەڵگەکەی:**"لعمید" لێرەدا لامی ابتدا چۆتە سەر خبری لکن ئەمەش شاذەو بەلای کوفێکانەوە دروستە .

بەڵام هەندێ لە زانایان دەربارەی لامی ئەم دێڕە فەرموویانە زیادکراو"زائدة"یە، هەروەکو چۆن زیادکراوەبە شاذی بۆ خبری فعلی"أمسی"،وەکو ووتەی:

ش١٠٠/ مَرُّوا عَجَالَى فَقَالُوا كَيْفَ سَيِّدُكُمْ؟ فَقَالَ مَنْ سُئِلوا أَمْسَى لَمَجْهُودَا.(١)

واتا:أمسی مجهوداً.(٢)

هەروەکو چۆن زیادکراوە بۆ خبری مبتدا بە شاذی، وەکو ووتەی:

ش١٠١/ أُمُّ الحُلَيْسِ لَعَجُوزٌ شَهْرَبَهْ تَرْضَى مِنَ اللَّحْمِ بِعَظْمِ الرَّقَبَهْ.(٣)

هەروەهاپێشەوا مبرد بە دروستی داناوە لامی ابتدا. بچێتە سەر خبری"أنّ"کە همزەکەی مفتوحە، وە خوێندراوەتەوە بە شازی(٤) ﴿إِلاَّ إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ﴾(٥) بە خوێندنەوەی همزەی"أن" بە مفتوحی، بەڵام زۆرێک لە زانایان دەربارەی ئەمەش فەرموویانە :لامەکە زیادکراوە.

* * *

---

(١) ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش:- ئەوان خێرا تێپەڕ بوون و ووتیان: گەورەکەتان چۆنە؟ ووتی ئەوەی پرسیاری لێکرا: ماندووی دەردو نەخۆشیە. بەڵگەکەی:"لمجهودا" لێرەدا حەرفی لام چۆتە سەر خبری "امسی" ئەمەش شاذە.

(٢) مەبەست ئەوەیە ئەو لامە چۆتە سەر ووشەی"مجهودا"وهیچ لەماناکەی نەگۆڕیوە.

(٣) ماناو بەڵگەی ئەم دێرە:- ئەوماکەرە پیرەژنێکی پەککەوتەیە، ڕازییەلە بری گۆشت بە ئێسکی ملە حەیوان. بەڵگەکەی:"لعجوز"لێرەدا حەرفی لام چۆتە سەر خبری مبتدا، ئەمەش شاذە.

(٤) خوێندوەی شاذ لە زانستی قورئان خوێندن"القراءات"دا بریتیە لەو خوێندنەوەی کە پێچەوانەی خوێندنەوەی ڕاست دروست بێت، زانایان فەرموویانە دروست نیە خوێندنەوەی قورئان بە خوێندنەوەی شاذ مەگەر بۆ ڕوونکردنەوە، یان کاتێ ماناکە نە گۆڕێت.

(٥) ئەم ڕستە قورئانیە بە شێکە لە ئایەتی ژمارە"٢٠"ی سورەتی "الفرقان" کورتەی ماناکەی{بێگومان ئەوان- واتە پێغەمبەرانی پێش تۆ-خواردنیان خواردووە، واتا مرۆڤ بوون} .إعرابەکەی:- إلاّ/اداة حصر .أن/حرف مشبه بالفعل، هم/ضمير متصل مبني في محل نصب اسم انّ. ليأكلون/لـ :زئدة. يأكلون:- فعل مضارع مرفوع و علامة رفعة ثبوت النون لأنه من الافعال الخمسة .والواو/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل.الطعام/مفعول بة. وجملة"يأكلون الطعام"في محل رفع خبر أن. الشاهد فيها :- "انهم" قرئ بالفتح على ان اللام زائدة في قرءة شاذة".

١٨٤-ولاَ يَلِي ذِي اللاَّمَ مَا قَدْ نُفِيَا وَلاَ مِــنَ الأَفْعَالِ مَــا كَرضِيَـا
١٨٥-وَقَـدْ يَلِيهَا مَعَ قَـــدْ كَإِنَّ ذَا لَقَدْ سَمَا عَلَى الْعِدَا مُسْتَحْوِذَا.[١]

کاتێك خبری إنّ نەفی کراو"المنفی" بوو ئەوە دروست نیە لامی ابتدا بچێتە سەری، کەواتە دروست نیە بڵێیت ((إنَ زیداً لما یقومُ))، ئەمەش[٢] هاتووە لە شیعردا، وەکو ووتەی:

ش١٠٢/ وَأَعْلَمُ إِنَّ تَسْلِيمًا وَتَرْكًا لَلاَ مُتَشَابِهَانِ وَلاَ سَوَاءُ.[٣]

هەروەها ئاماژەی کرد دانەر بە ووتەی((وَلاَ مِنَ الأَفْعَالِ مَـا كَرِضِيَا))بۆ ئەوەی کە ئەگەر خبری"إنّ"ـە فعلی ماضی متصرف[٤] بوو وەحەرفی"قد"ی لە پێشەوە نەبوو ئەوە دروست نیە لام بچێتە سەری، کەواتە دروست نیە بڵێیت((إنّ زيدًا لَرَضِيَ))[٥]، وەپێشەوا کسائی بەدروستی دەزانێت،هەروەها پێشەوا"هشام"یش، وە ئەگەر فعلەکە[٦]، مضارع بوو ئەوە

---

[١] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە :١٨٤- لامی زیاد کراو ناچێتە سەر فعلی نەفی کراو، هەروەها ناچێتە سەر فعلی هاوشێوەی"رضيَ"کە ڕابردووەو حەرفی "قد"ی پێوە نیە.١٨٥ -بەڵام دروستە لامی زیاد کراو بچێتە سەر فعلی ماضی ئەگەر "قد"ی پێوە بوو، وەکو ڕستەی((إنَّ ذَا لَقَدْ سَمَا عَلَى الْعِدَا مُسْتَحْوِذَا))واتا:بێگومان ئەو کەسەزاڵ بووە بەسەر دوژمنەکەیدا.

[٢] واتا زیاد کردنی لام بۆ سەر خبری "إن"کە نەفی کراو بێت.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:- دڵنیام سڵاو کردن و نەکردنی وەکو یەك نین و هاوشێوەی یەکنین. **بەڵگەکەی:** "للامتشان"، لێرەدا لام چۆتە سەر خبری "إن" کە نەفی کراوە ئەمەش پێچەوانەی یاسایەوشاذە.

[٤] پێشتر باسمان کرد کە فعلی"متصرف"پێچەوانەی فعلی جامدە.

[٥] لەبەر ئەوەی فعلی"رضي"فعلێکی ماضیە و متصرفە و حەرفی "قد"ی پێوە نیە.

[٦] واتا: ئەو فعلەی کە لەگەڵ فاعلەکەیدا دەبێتە خبری."إن".

حەرفی"لام"دەچێتە سەری،جیاوازی نیە ئەو فعلە مضارعە متصرف بێت وەکو((إنّ زيدًا لَيَرْضَى))یان متصرف نەبێت وەکو((إنَّ زيدًا لَيَذَرُ الشَّرَّ))[١]، ئەمەش کاتێك دەبێت کە فعلە مضارعەکە حەرفی"سین"و"سوف"[٢]ی لەسەر نەبێت، جا ئەگەر"سین"و"سوف"ی لە پێشەوە بوو وەکو((إنَّ زيدًا سوف يقومُ))یان"سيقوم"،ئەوە لە دروسێتی چوونە لام بۆ سەری ڕاجیای هەیە، دروستە لەسەر ڕاو بۆ چوونی ڕاست ئەگەر فعلە مضارعەکە"سوف"ی لە پێشەوە بوو،بەڵام ئەگەر حەرفی"سین"ی لەسەر بوو ئەوە زۆر کەمە.

هەروەها ئەگەر فعلە ماضیەکە متصرف نەبوو ئەوە بە پێی قسەی ئاشکرای دانەر دروستە حەرفی لام بچێتە سەری، دەڵێیت((إنَّ زيدًا لَنِعْمَ الرَّجلُ ،إنَّ عَمْرًا لَبِئْسَ الرَّجلُ))[٣]، ئەمەش بۆ چوونی پێشەوا ئەخفەش و پێشەوا فەڕایە، بەڵام ئەوەی کە گێڕدراوەتەوە لە پێشەوا سیبویە ئەوەیە کە دروست نیە ئەمە[٤].

هەروەها ئەگەر فعلە ماضیەکە متصرف بێت و حەرفی "قد"ی پێوە بوو ئەوە دروستە"لام" بچێتە سەری، ئەمە بوومەبەستی ووتەی دانەر((وَقَدْ يَلِيهَا مَعَ قَدْ))،وەکو((إنّ زيداً لقدْ قامَ)).

* * *

---

[١] فعلی"يذرُ" لەزمانی عەرەبیدا تەنها بە"مضارعی و امر" بە کاردێت و ماضی و مصدری نیە، بەمانای وازهێنان"ترك" دێت.

[٢] حەرفی "سین"و"سوف" لە زمانی عەرەبیدا پێیان دەوترێت"حرفا التنفس"واتا: دووحەرفەکەی تایبەتن بۆ داهاتو"الاستقبال" تەنها دەچنە سەر فعلی"مضارع"و تایبەتی دەکەن بۆ داهاتوو.

[٣] فعلی"نعم"و"بئس" دوو فعلی نەگۆڕ"جامد"ن و تەنها بە شێوەی ماضی بەکاردێن.

[٤] واتا پێشەوا سیبویە پێی دروست نیە لامی زیدا کراو بچێتە سەرخبری إنّ کاتێك ئەو خبرە فعلی ماضی جامد بێت.

١٨٦- وَتَصْحَبُ الْوَاسِطَ مَعْمُولَ الْخَبَرْ    وَالْفَصْلَ وَاسْمًا حَلَّ قَبْلَهُ الْخَبَرْ.[١]

لامی ابتدا ئەچێتە سەر معمولی[٢] خبر، ئەگەر ئەو معمولە بکەوێتە نێوان اسمی إنّ و خبرەکەی، وەکو((إنّ زيدًا لَطَعَامَكَ آكلٌ))[٣] هەروەها پێویستە لەم حاڵەتەدا خبرەکە لە وانە بێت کە دروستە حەرفی لام بچێتە سەری وەکو نموونەمان هێنایەوەیە ،جا ئەگەر خبرەکە لەوانە بوو کە دروست نیە لام بچێتە سەری ئەوە دروست نیە بچێتە سەر معمولەکەشی، وەکو ئەوەی خبرەکەفعلێکی ماضی گۆڕاو"متصرف"بوو و"قد"ی پێوە نەبێت، کەواتە دروست نیە بڵێیت((إنّ زيدًا لَطعامَك أَكَلَ)) هەرچەندە هەندێ لە زانایان بە دروستیان داناوە، جادانەر بۆیە فەرمووی" وَتَصْحَبُ الْوَاسِطَ" واتا ئەو معمولەی کە دەکەوێتە ناوەڕاستەوە[٤]، بۆ ئەوەی ئاگادارمان بکاتەوە کە حەرفی لام ناچێتە سەر ئەو معمولەی داو کەوتبێت، کەواتە دروست نیە بڵێیت ((إنّ زيدًا آكلٌ لَطعامك)). هەروەها ئەوە فامرایەوە لە ووتەی دانەر کە حەرفی لام ئەگەر بچێتە سەر ئەو معمولەی کە لە ناوەڕاستەوەیە ئەوە دروست نیە بچێتە سەر خبرەکەش، کەوابوو ناڵێیت((إنّ زيدًا لَطعامَك لآكلٌ))،ئەمەش لەو ڕوو وەوەی کە تایبەتی کرد چوونە سەری لام بۆ سەر

---

[١] مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:لامی زیدا کراو دەچێتە سەر معمولی خبر ئەگەر ئەو معمولە بکەوێتە نێوان اسم و خبرەکەوە، هەروەها دەچێتە سەر جێناوی جیاکەرەوە"ضمير الفصل"، هەروەها دەچێتە سەر ئەو اسمەی خبرەکەی پێش کەوتووە.

[٢] پێشتر لە شەرحی دێری(١٥٢)ی ئەلفیەدا باسی معمولی خبر مان کرد.

[٣] لەم ڕستەیەدا " آكلٌ"خبری"إن"یە واسمی فاعلەوەو پێویستی بە"فاعل و مفعول بە" هەیە، فاعلەکەی جێناوێکی نادیارە و" طَعَامَكَ " مفعول بە بۆی و معمولێتی، چونکە " آكلٌ " اسمی فاعلەو عاملە.

[٤] واتا: دەکەوێتە نێوان اسم و خبرەکەی.

معمولی خبرێك كە لەناوەڕاستی اسم و خبرەكەوە بێت، ئەمەش بەكەمی بیستراوە، گێڕدراوەتەوە لە قسەیان[١] ((إِنِّي لَبِحَمْدِ اللهِ لَصَالِحٌ))[٢].

هەروەها ئاماژەی كرد دانەر بەووتەی"الفصل"[٣]بۆ ئەوەی كە لامی إبتدا دەچێتە سەر جێناوی جیاكەرەوە"الفصل" وەكو((إنّ زیدًا لهو القائمُ))، خوای گەورە فەرموویەتی﴿إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْقَصَصُ الْحَقُّ﴾[٤]،لێرەدا(هذا)اسمی "إنّ"یە، وجێناوی"هو" جیاكەرەوەیەو حەرفی لام چۆتە سەری وە،"القصص"خبری"إن"یە.

جێناوی جیاكەرەوە"الفصل"بۆیە پێی دەوترێت جیاكەرەوە، چونكە جیادەكاتەوە خبر لە ئاوڵناو"الصفة" ئەمەش وەكو ئەوەی كاتێك دەڵێت((زیدٌ هو القائمُ))ئەگەر لێرەدا جێناوی"هو"نەبێت ئەوكات دەكرێت"القائم"ئاوڵناو"صفە" بێت بۆ زید، وە دەكرێت خبر بێت بۆی، بەڵام كاتێك جێناوی"هو"دێ ئەوە"القائم"دەبێتە خبر و بەس.

هەروەها مەرجی جێناوی جیاكەرەوە ئەوەیە بكەوێتە نێوان مبتدا وخبرەكە،وەكو((زیدٌ هو القائمُ)،یان بكەوێتە نێوان دوو ناو كە لەئەصڵدا مبتداوخبر بوون وەكو((إنّ زیداً لهو القائمُ))[٥].

---

[١] واتا لە قسەی عەرەب.

[٢] لەم ڕستەیەدا لامی ابتدا چۆتە سەر خبرەكە "لصالح" وەچۆتە سەر معمولەكەش كە "لبحمد الله"،یە چونكە"صالح"اسمی فاعلە، مانای ڕستەكەش(بێگومان من چاكەكارم بە حمدو سنای خوای گەورەوە".

[٣] جێناوی جیاكەرەوە"الفصل" جیاوازە لە جێناوی سەر بەخۆ"المنفصل"، جیاكەرەوە تەنها بۆ جوودا كردنەوەی خبرە لە صفە وەكو ابن عقیل ڕوونی كردەوە.

[٤] ئەم ڕستەیە بەشێكە لە ئایەتی ژمارە(٦٢)ی سورەتی"آل عمران"، ماناكەی {بێگومان هەر ئەمەیە داستان و بەسەرهاتی ڕاست و دروست"، إعرابەكەشی لەشەرحەكەدا كراوە .

[٥] لەم ڕستەیەدا"زیدا"اسمی"إنّ"یە و"القائم" خبرێتی، هەردووكیان لە بنەڕەتدا مبتدا و خبر بوونە.

هەروەها ئامارژەی کرد دانەر بەووتەی((وَاسْمًا حَلَّ قَبْلَهُ الْخَبَرْ))بۆ ئەوەی کە لامی ابتدا دەچێتە سەر ئەو ناوەی کە خبرەکەی پێش کەوتووە،وەکو((إنّ في الدار لَزيدًا))[1] خوای گەورە فەرموویەتی﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ﴾[2].

هەروەها قسەی دانەر ئەوەی لێ دەفامرێتەوەکە ئەگەر لام جۆیە سەر جێناوی جیاکەرەوە، یان جۆیە سەر ئەو ناوەی دواکەوتووە، ئەوە ناچێتە سەر خبر، ئەمەش هەروایە، کەوابوو دروست نیە بلێیت((إنّ زيداً لهو لقائم))،هەروەها((إنّ لفی الدار لزيدا)).

هەروەها ناوەڕۆکی بەرەهاگوتنی-ابن مالك- لەووتەی:لامی ابتدا دەچێتە سەر معمولی خبر کاتێك ئەو معمولە بکەوێتە نێوان اسم و خبر،ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە هەموو معمولێك ئەگەر کەوتە نێوان اسم و خبرەکەوە، ئەوە دروستە لامی ابتدا بچێتە سەری، وەکوە بەرکاری ڕاستەوخۆ"المفعول الصريح"[3]، وجارو مجرور،وئاولفرمان"الظرف"و، وحال ، بەڵام زانایانی

---

[1] لەم ڕستەیەدا "زیدا" اسمی"إن" یە،ودواکەوتووەو "فی الدار" خبری"إن"یە،وپێش کەوتووە، بۆیە دروستە لامی ابتدا بچێتە سەری.

[2] ئایەتی ژمارە(٣)ی سورەتی"القلم"، ماناکەی{وە بێگومان پاداشتی نەبڕاوەو هەمیشەی هەیە بۆ تۆ-ئەی ﷺ}. إعرابەکەی :{وإن/و:حسب ماقبلها .إنّ/ حرف مشبه بالفعل. لك/ جار ومجرور في محل رفع خبر إنّ مقدم.لأجراً/لـ:لام الابتداء للتوكيد ، اجراً/اسم إنّ مؤخر منصوب ،غيرَ/نعت لـ((اجرا))منصوب وعلامة نصبه الفتحة الظاهرة، وهو مضاف، ممنونٍ /مضاف اليه مجرور .} الشاهد فيها :-لأجرا"حيث دخلت لام الابتداء على الاسم"أجرا"لتاخره عن الخبر

[3] مەبەست لە"المفعول به الصريح" ئەوناوەیە کە ڕاستەوخۆ دەبێتە بەرکار"المفعول به" بەبێ پێویست بوون، بە"تاويل"کردن.

ڕێزمـان عـەرەبی فەرموویانـە دروسـت نیـە لامـی ابتـدا بـچێتە سـەر حـال[1]، کەوابوو دروست نیە بڵێیێت((إن زيدا لضاحكاً راكبٌ)).

* * *

[1] واتا هەریەك لە(المفعول به، وجارو المجرور، والظرف، والحال) دەگونجێ ببنە معمول بۆ خبر بەڵام مەرج نیە هەموویان- کاتێك دەبنە معمول- دروست بێت لامی ابتدا بچێتە سەریان.

## *باسی لکاندنی( ما )به( إنّ )ـەوهاوشێوەکانی

١٨٧–وَوَصْلُ مَا بِذِي الْحُرُوفِ مُبْطِلُ إِعْمَالَهَا وَقَدْ يُبَقَّى الْعَمَــــلُ .[١]

هـەرکاتێك لکا(ما)[٢] جگـە لـە(مـا)ـی موصـوله بـە إنّ وهاوشـێوەکانی ئـەوە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی عەمەلەکەیان، جگە لەحەرفی(لیت)کە دروستە عەمـەل بکـات ودروستیـشە إهمـال کرێـت وعەمـەلی نـەمێنێت، کـەوابوو دەڵێیت: ((إنّما زیدٌ قائمٌ))[٣]، دروست نیە (زیدٌ)منصوب کرێت، هەروەها هـەر یـەك لـە انّ وکـأنّ ولکـنّ ولعلّ بەهـەمان شـێوەن ،دەڵێیـت :((لیتمـا زیـدٌ قائمٌ))،وەدەتـوانی (زیـدا)منصوب کـەیت ودەڵێیـت: ((لیتما زیـدا قـائمٌ))،جا بـەپێی قـسەی ئاشـکرای دانـەر (مـا)کاتێـك لکـا بـەم حەرفانـەوە عەمـەلیان ناهێڵێت ،وەهەندێ جاریش بەکەمی عەمـەل دەکـەن ،ئەمـەش ڕاو بۆچوونی کۆمەڵێك لە نحوزانانە، لەوانە پێشەوا زجاجی وابن سەراج ،هەروەهاپێشەوا ئەخفـەش وکـسائی گێڕاویانەتـەوە((إنّمـا زیـدا قـائمٌ))،بـەڵام ڕای راسـت بۆچوونی یەکەمە،کە بریتیە لە عەمـەل نـەکردنیان کاتێك (ما)یـان پێوە لکا جگـە لـە(لیـت)، بـەڵام ئـەوەی کـە ئـەخفـەش وکسائی گێڕاویانەتـەوە ئـەوە پێچەوانەی یاسـایە(شـاذ)ـە، هـەروەها خۆمـان پاراسـت بـەوەی کـەووتمان (مـــا)ـــی جگەلەموصـــوله لـــە(مـــا)ـــی موصـــوله،کەنایگرێتەوەوڕێگری

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە بەم شێوەیە: ئەگەر لکا(ما)بەم حەرفانەوە_واتا بە إنّ وهاوشێوەکانی_ ئەوە هەڵدەوەشێنێتەوە عەمەلەکەیان–کەبریتی بوو لەمنصوب کردنی مبتدا–،وەدەکرێت کەم جار عەمەلەکەیان بمێنێتەوە.

[٢] ئەم (ما)یە پێی دەوترێت _الکافّة_واتا :نایەڵێت إنّ وهاوشێوەکانی عەمەل بکەن ، هەروەها پێیشی دەوترێت_الزائدة_،وەپێی دەوترێت –ما الهیئة–.

[٣] إعرابی ئەم ڕستەیە بەم شێوە دەبێت :إنّما/ دەتوانی پێکەوە إعرابی کەیت ودەبێتە: أداة حصر،وەدەتوانی بە جیا إعرابی بکەیت بەم شێوەیە:إنّ/حرف مشبه بالفعل بطل عملها وبقي معناها. ما/کافّة أو زائدة. زیدٌ/ مبتدأ مرفوع . قائمٌ/خبر مرفوع.

عەمەلەکەیان ناکات،بەڵکو عەمەلی خۆیان دەکەن ،مەبەستیش لە موصولە ئەوەیە کەمانای((الذي))دێت،وەکو((إنّ ماعندك حسنٌ)){واتا:إنّ الذي عندك حسنٌ }،هەروەها ئەو(ما)یەی کەلەگەڵ دوای خۆی دەکرێتە مصدر[1]،وەکو((إنّ مافَعَلْتَ حَسَنٌ))واتا:إنَّ فِعْلَكَ حسَنٌ.[2]

## *باسی عطفکردنەوەی ناو بۆسەر اسمی إنّ

١٨٨-وَجَائِزٌ رَفْعُكَ مَعْطُوفًا عَلَى مَنْصُوبِ إِنَّ بَعْدَ أَنْ تَسْتَكْمِلاَ.[3]

ئەگەر دوای اسم وخبری(إنّ) ناوێکی معطوف هات ئەوە دروستە ئەوناوە بەدوو شێوە بێت:یەکەمیان :بەمنصوبی کەعطف دەکرێتەوە بۆسەر اسمی(إنّ)ەکە،وەکو: ((إنّ زيداً قائمٌ وعَمْرواً))،دووەمیان: بە مرفوعی وەکو: ((إنّ زيداً قائمٌ وعَمْرٌو))،جا لەم کاتەدا زاناکان ڕایان جیایە دەربارەی[4]، ئەوەی بۆچوونی زۆروباوە ئەویە کە عطف کراوەتەوە بۆ سەر جێگەی اسمی(إنّ)ەکە چونکە لە بنەڕەتدا مبتدایەومرفوعە ،ئەم بۆچوونەش هەست پێدەکرێت لەووتەی دانەر، بەڵام هەندێکی ترلەزانایان پێیان وایە دەبێتە مبتداو خبرەکەی حذف کراوەوتقدیرولێکدانەوەکەشی :وعَمْرٌو كذلك[5] ،

---

[1] مەبەست (ما)ی مصدریە ،کەلەڕووی زمانەوانیەوە دروستە پێی بوترێت موصول چونکە دەگەێنرێتە دوای خۆی وموصولیش واتا گەیەندراو بە دوای خۆی.

[2] واتا:بێگومان کارەکەت جوانە.

[3] مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:دروستە ناوێك عطفکەیتەوە بە مرفوعی بۆسەر اسمی ((إنّ)) ،دوای تەواوبوونی ڕستەکە،واتا دوای ئەوەی اسم وخبری إنّ دێت دوای ئەوان ناوە معطوفەکە بێت.

[4] واتا دەربارەی ئەو ناوەی کە بەمرفوعی عطف دەکرێتەوە بۆ سەر اسمی إنّ .

[5] واتا لەڕستەی ((إنّ زيداً قائمٌ وعَمْرٌو))،عمروٌ بەپێی ئەم بۆچوونە دەبێتە مبتدا و خبرەکەی محذوفە.

ئـەم بۆچـوونەش ڕاسـتترە. جائەگـەر عطـف کردنەوەکـە پـێش تـەواوبوونی ڕستەکەبوو_واتا پێش ئەوەی خبری إنّ بێت_لەم کاتەدا پێویستە ناوەکە[1] منـصوب بێـت لای زۆربـەی نحوزانـان ،کـەوابوو دەڵێیـت:إنّ زیـداً وعَمـراً قائمانِ[2] ،وإنَّكَ وزیداً ذاهبانِ[3] ، وەهەندێ لە زانایان پێیان وایە دروستە مرفوعیش بێت.

## *باسی عطفکردنەوەی ناو بۆسەر اسمی هاوشێوەکانی( إنّ )

١٨٩–وَأُلْحِقَتْ بِإِنَّ لَكِـــنَّ وَأَنّ مِنْ دُونِ لَيْـتَ وَلَعَلَّ وَكَـــأَنّ[4].

حوکی(أنّ)کە همزەکەی مقتوحەو(لکنّ) لەڕووی عطف کردنەوەی ناو بۆسەر ناوەکانیـان وەکــو(إنّ)وایە،کـەواتا دەڵێیـت: ((علمـت أنّ زیـدًا قـائمٌ وعمرٌو))بەمرفوعی (عمرو)وبەمنصوبی، هەروەها دەڵێیت:(( علمْتُ انّ زیدًا وعمـرًا قائمـان)) تـەنها بـە منـصوبی لێرەدا لای زۆربـەی زانایان،هـەروەها دەڵێیت: ((مـا زیـدٌ قائمًـا لکـنّ عمـرًا مُنطلـقٌ وخالـدًا))لێرەدا دەتـوانی نـاوی (خالد)مرفوع کەیت ودشتوانی منصوبی کەیت، هەروەهادەڵێیت: ((مـا زیـدٌ قائمًا لکنَّ عمرًا وخالدًا منطلقان))بەمنصوبکردنی(خالداً).

بەڵام((لیت،ولعلّ،وکأنّ)) دروست نیە لەگەڵیاندا جگە لەمنصوب بوون[1]،جا ئەوناوە عطف کراوە پێشکەوتبێت[2] یان دوا کەوتبێت،دەڵێیت: ((لیت زیدًا

---

[1] واتا ئەو ناوەی عطف دەکرێتەوە بۆ سەر اسمی(إنّ)ەکە.

[2] لەم ڕستەیەدا عمرا عطف کراوەتەوە وپێش هاتنی خبری إنّ ،بۆیە پێویستە منصوب بێت لای زۆربەی زانایان.

[3] لەم ڕستەیەشدا زیداً عطف کراوەتەوە بۆ سەر جێناوی(ك)کە اسمی( إنّ)یە پێش هاتنی خبرەکەی بۆیە پێویستە منصوب بێت.

[4] پوختەی ئەم دێڕەی ئەلفیە :– عطف کردنەوە بۆسەر ناوی –لکن وأن وەکو (إنّ) وایە ، بەڵام بۆ سەر ناوی (لیت) و(لعل) ، وکأن ) دەبێ تەنها منصوب بێ.

وعمـــرًا قائمـــان " ولیـــت زیـــدًا قـــائمٌ وعمـــرًا ))بەمنـــصوب بـــوونی ((عمـرو))لەهـەردوو حاڵەتەکـەدا[٣]،وەدروسـت نیـە مرفـوع کردنی،هـەروەها بۆ((کـأنّ ،ولعـلّ))ش وایـە، بـەڵام پێـشەوا فـەڕا پێـی وایـە دروسـتە مرفـوع کردنی_پێشکەوتبێت یان دواکەوتبێت_لەگەڵ ئەم سێ حەرفەشدا.[٤]

* * *

---

[١] واتا ئەو ناوەی عطف دەکرێتەوە بۆسەر اسمی ((لیت،ولعلّ،وکأنّ))دەبێت منصوب بێت ودروست نیە مرفوع بێت.

[٢] واتا پێش خبرەکە کەوتبێت یان دوای.

[٣] واتا:لەحاڵەتی هاتنی ناوە عطف کراوەکە پێش خبری (لیت)،وەلەحاڵەتی هاتنی دوای خبرەکە.

[٤] واتا لەگەڵ ((لیت،ولعلّ،وکأنّ)).

***باسی سووك کردن( تخفیف )ـی إنَّ[١]**

١٩٠–وَخُفِّفَتْ إنَّ فَقَلَّ الْعَمَـــلُ     وَتَلْزَمُ الـــلاَّمُ إِذَا مَا تُهْمَـــلُ

١٩١–وَرُبَّمَا اسْتُغْنِيَ عَنْهَا إِنْ بَدَا     مَـــا نَاطِـــقٌ أَرَادَهُ مُعْتَمِـــدَا.[٢]

ئەگـەر حـەرفی(( إنّ)) تخفیـف کـرا ئـەوە زۆرترواپـە لـەزمانی عەرەبیـدا عەمەلەکـەی نـەمێنێت،دەڵێیت: ((إنْ زیـدٌ لقـائمٌ))[٣]،هـەرکاتێکیش عەمـەلی نـەما ئـەوە پێویـستە حـەرفی لامـی بـۆ بێنیـنن بـۆ جیاکردنـەوەی لـە((إنْ))ـی نـافیـە، وەبەکـەمیش عەمـەل دەکـات دەڵێیـت: ((إنْ زیـداً قـائمٌ))،هەریـەك لـە پێشەوا سیبویەوئەخفەش_ رەحمـەتی خوایـان لـیٚ بێـت_ عەمـەل کردنیـان گێڕاوەتەوە،کـەواتا لـەم کاتـەدا پێویـستی بـە حـەرفی لام نیـە چـونکە لەگـەڵ (إن)ـی نافیـە تێکـەڵ نابێت لەبەرئـەوەی (إن)ـی نافیـە ناوەکـەی دوای خـۆی منـصوب ناکـات وخـبریش مرفـوع کـات، تـەنها کاتێـك لەگـەڵ (إن)ـی نافیـە تێکـەڵ دەبـن وجیاناکرێنـەوە کـە إهمـال کرێـت ولـەکار خرێـت ومەبەسـت ومانـاکـەی ڕوون وديـار نـەبێت،جا ئەگـەر مەبەسـت وماناکـەی ڕوون بـوو ئەوەپێویستی بە لام نیە،وەکو ووتەی:

---

[١] مەبەست لەسووك بوونی إنّ ئەوەیە بکرێتە(إنْ)ودووبارەبوونە(شدە)کەی لابیرێت، واتا لەخوێندنەوەدا بەسووکی دەخوێنرێتەوە،جائێمە لە کاتی شەرح کردندا ووشەی تخفیف بەکاردێنین.

[٢] لەم دوودێرەدا ابن مالك _رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ_باسی تخفیف کردنی إنّ دەکات ودەفەرموێت: ١٩٠–ئەگەر إنّ تخفیف کرا ئەوە عەمەل کردنی کەم دەبێتەوە_واتا ناوەکەی دوایخۆی منصوب ناکات_،لەم کاتەدا پێویستە حەرفی لام بچێتەسەر خبرەکەی بۆ ئەوەی بزانرێت کە عەمەلی نەماوە.١٩١–وەهەندیٚ جاریش پێویستی بەو لامە نیە ئەگەر ماناکەی دیارو ئاشکرا بوو.

[٣] إعرابی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە دەکەین:إنْ/ مخفف من المثقل .زیدٌ/مبتدأ مرفوع .لقائمٌ/لـ:الفارقة للفرق بين (إنْ) المخففة و(إنْ)النافية. قائمٌ:خبرلـ(زید)مرفوع.

ش١٠٣/ وَنَحْنُ أُبَاةُ الضَّيْمِ مِنْ آلِ مَالِكٍ وَإِنْ مَالِكٌ كَانَتْ كِرَامَ الْمَعَادِنِ.[١]

تقدیری قسەكە(وَإِنْ مَالِكٌ لَكَانَتْ)بەلاّم حەرفی لامی نەهێناوحذف ی كردوە، لەبەرئەوەی لەگەڵ (إن)ی نافیە تێك ناگیرێن،چونكە مەبەستی شاعر بریتیە لە چەسپاندنی نەجبی نەوەك نەفی كردنی،ئەمەیە مەبەست لەووتەی دانەر: ((وەهەندێ جاریش پێویستی بەو لامە نیە ئەگەر ماناكەی دیارو ئاشكرا بوو_تاكۆتای)).

جازانایان رایان جیایە دەربارەی ئەم لامە[٢]:ئایە لامی ابتدایە وچۆتە سەر خبرەكە بۆ جیاكردنەوەی(إن)ی نافیە لە(إن)ی تخفیفكراو،یان لامێكی ترەو هێنراوە بۆجیاكردنەوە؟ قسەی پێشەوا سیبویە ئەوە دەخوازێت كە لامی ابتدایەوبۆ جیاكردنەوە هاتووە.

جاسوودومانای ئەم راجیاییە دەردەكەوێت لەبابەتێك كەرووی داوە لەنێوان هەردووزانااین أبی العافیةوابن الاخضر[٣] ئەویش بریتیە لەو فەرموودەی پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم -: " قَدْ عَلِمْنَا إنْ كُنْتَ لَمُؤْمِنا "[٤]،جائەو

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە :ئێمەی هۆزی مالك رێگری ستەمین،بێگومان مالك بۆخۆشی نەجیب ورەسەن بوو. بەڵگەكەی: (وَإِنْ مَالِكٌ كَانَتْ..)لێرەدا (إن)تخفیف كراوەو حەرفی لامیش نەچۆتەسەر خبرەكەی چونكە ماناكەی روون وئاشكرایەو مەبەستی ئەوەیە كە مدح وستایشی مالك بكات نەوەك نەفی نەجیبی ورەسەنایەتی لێ بكات.

[٢] واتا ئەو لامەی دەچێتە سەر خبری إنّ لەكاتی تخفیف كردنی إنّ.

[٣] ابن أبی العافیە ناوی:محمد بن عبدالرحمن بن عبدالعزیز وەیەكێكە لەپێشەوایانی زاستی ئەدەب وزمانی عەرەبی،خەڵكی شاری (غرناطة)یە لەووڵاتی اسپانیا،ساڵی ٥٨٣ك – ١١٨٧ز،كۆچی دوای كردووە. هەروەها ابن الاخضر ناوی تەواوی: علی بن عبدالرحمن ویەكێكە لەپێشەوایانی زمانی عەرەبی،خەڵكی شاری( الاشبیلی)ە لەووڵاتی اسپانیا،ساڵی ٥١٤ك– ١١٢٠ز كۆچی دوای كردووە.خوای گەورە پاداشتیان بەباشترین شێوە بداتەوە.

[٤] ئەم فەرموودەیە پێشەوا بخاری ومسلم گێراویانەتەوەوبەشێكە لە گفتووگۆی نێوان ملائكەتەكانی ناو گۆڕوكەسی باوەڕدار كاتێك كە پرسیار دەكەن لێی دەربارەی-

زانایانەی ووتوویانە لامی ابتدایە دەڵێن پێویستە همزەی (إنّ)ـەکە مکسور بێت،ئەوزانایانـەش وتوویانـە لامـی ابتدانیـەولامێکی تـرە_هێنـراوە بۆجیاکردنـەوە_ همـزەی (إنّ)ـەکە مفتـوح دەکـەن ،هـەروەها ئـەم خلافـە پێشتریش ڕووی داوە لـەنێوان هەردوو زانـا (ابي الحسن عليّ بن سليمان البغدادي الأخفـش الـصغير)[1] وزانـا(ابـي علـيّ الفارسـي)،پێشەوا فارسـی فـەرمووی ئـەم لامـە لامـی ابتـدا نیەوتـەنها هێنـراوە بـۆ جیـا کردنەوە،وپێشەوا(ابـن أبـی العافيـة)وای فەرموو،بەڵام ئەخفەشـی بـچووك فەرمووی لامی ابتدایەو بۆجیاکردنەوە هاتووە،پێشەوا(وابن الاخضر)یش وای فەرموو.

* * *

-پێغەمبەر_ صلى الله عليه وسلم_ دەفەرموێ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت:ئەو پێغەمبەری خوایەوئیمانمان پێهێناوبەچاکی دوای کەوتین ئەوانیش پێی دەڵێن:{بێگومان ئێمە دەمانزانی کە تۆ باوەڕداری}. إعرابەکەشی بەم شێوەیە: قدْ/ حرف تحقيق .عِلمْنا/علِمْ:فعل ماضٍ مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك. نا/ ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع الفاعل .إنْ/ المخففة من إنّ ،واسمه ضمير الشأن المحذوف. كُنْتَ :كنْ/ فعل ماضٍ ناقص مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك. تَ/ ضمير متصل مبني على الضم في محل رفع اسم كان . لَمؤمناً:لـَ/ فارقة بين إنْ النافيةوإنْ المخففة عند بعضهم، ولام الابتداء عندآخرين ، مؤمناً/خبر كان منصوب. وجملة (كُنْتَ لَمُؤمِنا)في محل رفع خبر إن. الشاهد *في هذا الحديث:لمؤمناً* : اختلفوا في اللام،فقال بعضهم لام ابتداء،وقيل لام فارقة.

[1] ناوی تەواوی:(علي بن سليمان بن الفضل) وناسراوە بە ئەخفەشی بچووك،ساڵی ٣١٥ك کۆچی دوای کردووە.

## *باسی مەرجی ئەوشتەی لەدوای( إن )ـی مخففەودێت

١٩٢–وَالْفِعْلُ إِنْ لَمْ يَكُ نَاسِخًا فَلاَ تُلْفِيهِ غَالِبًا بِإِنْ ذِى مُوصَلاَ.[١]

هـــەرکاتێك (إنّ)تخفیـــف کرائـــەوەدەبیّ لەدوایـــەوە تـــەنها افعـــالی ناسـخە[٢]دێـت،وەکو (کـان)وهاوشـێوەکانی،وظـنّ وهاوشـێوەکانی خـوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَإِنْ كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ﴾[٣]،هەروەها دەفـەرموێ:﴿ وَإِنْ يَكَـادُ الَّـذِينَ كَفَرُوالَيُزْلِقُونَـكَ بِأَبْـصَارِهِمْ﴾[٤]،هـەروەها دەفەرموێ:

---

[١] مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:فعل ئەگەر لە افعالی ناسخە_وەکو کان واخواتها یان کادواخواتهایان ظنّ واخواتها_ نەبێ نایبینی لە دوای (إن)ـی مخففەوە بێت،واتا(إن)ـی مخففە بەوە دەناسرێتەوە کە لەدوایەوە افعالی ناسخە دێت.

[٢] پێشتر باس ومانای افعالی ناسخەمان کرد.

[٣] ئەم ڕستەقورئانیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(١٤٣)ـی سورەتی البقرە،کورتەی ماناکەی{بەڕاستی_ ئەم گۆڕینی ڕووگەیە_کارێکی زۆرگەورەوگران بوو مەگەر لای ئەوانەی کە خوا ڕێنموونی کردوون} .إعرابەکەشی بەم شێوەیە: وإنْ/و:حسب ماقبلها، إنْ/المخففة من الثقيلة،واسمها محذوف،واللام في(لكبيرة)تعويض عن المحذوف. كانتْ/فعل ماضٍ ناقص .واسمه ضمير مستتر عائد إلى التولية. لكبيرةً/ لـ:الفارقة .كبيرة/خبر كان منصوب . والجملة الفعلية في محل رفع خبر إنّ. إلاّ/اداة استثناء .على الذين/جارومجرور،في محل نصب المستثنى،والمستثنى منه محذوف تقديره:وإن كانت لكبيرة على الناس إلاّ على الذين هداهم الله. هدى/ فعل ماضٍ مبني على الفتحة المقدرة على الألف للتعذر. اللهُ/ فاعل مرفوع . الشاهد فيها/ (كَانَتْ لَكَبِيرَةً..)حيث جاء بعد إن المخففة فعل ناسخ .

[٤] ئەم ڕستەیەش بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٥١)ـی سورەتی القلم،پوختەی ماناکەی:{بەڕاست نزیك بوو بێ باوەڕەکان هەڵت خلیسکێنن بەچاوە پیسەکانیان } . إعرابەکەشی بەم شێوەیە: إنْ/مخفف منَ المثقل ،واسمها ضمير الشأن المحذوف .يكادُ/فعل مضارع ناقص للمقاربة مرفوع .الذين/ اسم موصول مبني على الفتح في

﴿وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ﴾[١]، وەکەمە لەدوایەوە فعلی ترجگە لەافعالی ناسخەبێت،بۆئەمەش ئامارەی کرد دانەر بەووتەی:(غالبا)، نموونەی ئەوەی فعلی ناسخی لەدواوە نەهاتبیّ قسەی هەندێ لەعەرەبە:(( إنْ يَزِينُك لَنَفسُك ، وإنْ يَشِينُك لَهِيَهْ ))هەروەها قسەیان: إنْ قَنَعْتَ كَاتِبَكَ لَسَوْطًا))[٢]،وەپێشەوا ئەخفەش بەدروستی دانـاوە بلێی((إنْ قـام لأنا))،هەروەها وەکو ووتەی شاعر:

---

محل رفع اسم يكاد. كفروا/ فعل ماضٍ مبني على الضم لاتصاله بواو الجماعة،والواو/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل، والجملة(كفروا) لامحل لها من الاعراب صلة الموصول. ليُزلقونك/ لَـ:الفارقة. يُزلِقون: فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون لانه من الأفعال الخمسة، والواو/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل ، كَ/ ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. وجملة(يُزلقونك) في محل رفع خبر يكاد. بأبصارهم/ جارومجرور متعلقان ب(يُزلقونك)، وأبصار مضاف ،وضمير(هم) في محل جر مضاف إليه. وجملة يكاد مع اسمها وخبرها في محل رفع خبر( إنْ)المخففة. . الشاهد فيها:( وإن يكاد..) حيث جاء بعد إن المخففة فعل ناسخ.

[١] ئەم ڕستەیەش بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٠٢)ـی سورەتی الاعراف ،پوختەی ماناکەی:{بەڕاستی زۆربەیانمان دی تاوانباروسەرپێچی کاربوون}. إعرابەکەشی بەم شێوەیە: وإنْ/ و:حسب ماقبلها. إنْ/ مخفف من المثقل ،واسمها ضمير الشأن محذوف والتقدير:وإنّا/ وجدْنا. فعل ماضٍ مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك ،ونا/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. اكْثرَ/ مفعول به اول منصوب، وهو مضاف، هم/ ضمير متصل في محل جر مضاف إليه. لَفاسقين/لـ:فارقة،فاسقين/ مفعول به ثانٍ منصوب وعلامة نصبه الياء لانه جمع مذكر السالم.

[٢] ئەم دووڕستەیە قسەی بیستراون لەعەرەبەوە، یەکەمیان واتا:بێگومان ئەوەی جوانت دەکات خودی خۆتە و،ئەوەشی ناشیرینت دەکات هەرخۆتی. دووەمیان واتا:بێگومان داوتەبەسر نووسەرەکەتدا_یان بەسەر بەندەکەتدا_قامچییەك وکردووتە بەقناع بۆی. لەم دوونموونەیەدا (إن)ـی مخفف هاتووەولەدوایەوە فعلی ناسخ نەهاتووە ئەمەش کەمە لەزمانی عەرەبیدا.

ش١٠٤/ شَلَّتْ يَمِينُكَ إِنْ قَتَلْتَ لَمُسْلِمًا    حَلَّـتْ عَلَيْكَ عُقُوبَةُ الْمُتَعَمِّـدِ.[1]

* * *

***باسی سووك كردن( تخفيف )ـی أنّ:**

١٩٣-وَإِنْ تُخَفَّفْ أَنَّ فَاسْمُهَا اسْتَكَنْ    وَالْخَبَرَ اجْعَلْ جُمْلَةً مِنْ بَعْدِ أَنْ.[2]

ئەگـەر(أنّ)کەهمزەکـەی مفتوحـە تخفیـف کـرا ئـەوە عەمـەلی دەمێنێـت ولەکارناکەوێت،بەڵام دەبێت ناوەکەی جێناوی حاڵ(الشأن)[3]، خبرەکەشی دەبــــێ ڕســــتەبێت،ئەویش وەکونموونـــەی: ((علمـــتُ أَنْ زيـــدٌ قـــائمٌ))لێـــرەدا((أن))تخفیـــف كـــراوی(أنّ)ـــەیە،وناوەکەی جێنـــاوی حاڵ(ضمیرالشأن)ـە، وحـذف كراوە،وتقدیروڕاڤەکەی :أنـهُ، وەڕستەی((زیـدٌ قائمٌ))خبرەێتی وتقدیروڕاڤەکەی((علمتُ أنـهُ زیـدٌ قائمٌ))، وە دەکرێ هەنـدێ جار ناوەکەی دەرکەوێ بەڵام جێناوی حاڵ نیە،وەکو ووتەی:

ش١٠٥/ فَلَوْ أَنْكِ فِي يَوْمِ الرَّخَاءِ سَأَلْتِنِي   طَلاَقَكِ لَمْ أَبْخَلْ وَأَنْتِ صَـــدِيقُ.[4]

* * *

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە : دەك دەستی ڕاستت شکێت بێگومان مسوڵمانێکت کوشت ،یاخوا بێتە سەرتا سزای تاوانبار. بـەڵـگـەکـەی:( إنْ قَتَلْتَ لَمُسْلِمًا)لێرەدا (إن)تخفیف کراوەولەدوایەوە فعلی ناسخ نەهاتووە،ئەمەش کەمەویاسایی نیە.

[2] مانای ئەم دێرەی ئەلفیە: ئەگەر(أنّ)تخفیف کرێت ئەوە دەبێت ناوەکەی جێناوێکی نادیاربێت،وەخبرەکەی ئەوڕستەیە کەلەدویەوە دێت ،واتا دەبێت خبرەکەی جملە بێت ومفرد نەبێت لەم کاتەدا.

[3] پێشتر باسی جێناوی حاڵ مان کرد.

[4] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: بێگومان ئەگەر لەکاتی شێنەی وڕۆژانی خۆشیدا داوای جیابوونەوەوطلاقت دەکر منیش نامەردیم نەدەکرد طلاقم دەدای هەرچەندە دۆست وهاوڕێی. . بەڵگەکەی((أنكِ)) تخفیف کراوەوناوەکەی نادیاروحذف کراو نیە، ئەمەش زۆرکەمە لەزمانی عەرەبیدا.

***باسی مەرجەکانی ئەوڕستەیەی دەبێتە خبری( أنْ )ــی مخفف.**

١٩٤-وَإِنْ يَكُــنْ فِعْلاً وَلَمْ يَكُــنْ دُعَا     وَلَمْ يَكُـــنْ تَصْرِيفُـــهُ مُمْتَنِـــعَ

١٩٥-فَالأَحْسَنُ الْفَصْلُ بِقَدْ أَوْ نَفْيٍ أَوْ     تَنْفِيسٍ ،أَوْ لَوْ، وَقَلِيـــلٌ ذِكْـرُ لَوْ.[1]

هەرکاتێك خبری (ان)ـی مخففە جملەی اسمی بوو ئەوە پێویستی بە نێوان کردن(فاصل)[2] نیە،دەڵێی:(( علمتُ أَنْ زيدٌ قائمٌ))بەبێ هێنانی حەرفێك لە نێوان (ان)وخبرەکەی، مەگەرمەبەست نەفی کردن بێت وەکو فەرموودەی خوای گەورە:﴿ وَأَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَهَلْ أَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾[3]. بەلاّم ئەگەر خبرەکەی جملەی فعلی بوو ،ئەوە بەدەر نیە لەوەی :یان ئەو فعلە بگۆڕ(متـصرف)ـە،یان نەگۆڕ(غیرمتـصرف)ـە، جا ئەگەر نەگۆڕبوو ئەوەپێویستی بە بەین کردن(فاصل)نیە،وەکو فەرموودەی خوای

[1] ماناى ئەم دوو دێڕەى ئەلفیە :١٩٤- هەرکاتێك خبری (ان)ـی مخففە فعل بوو_واتاجملەی فعلی بوو_بۆ دوعاونزا نەبوو هەروەها بگۆڕ(متصرف)بوو .١٩٥- ئەوەباشتروایە شتێك بکەوێتە نێوان (ان)ەکەوخبرەکەی ئەوشتەش حەرف(قد)ـە یان(نفی)ـە یان حەرف(سین وسوف)ـەیە،یان حەرف(لو)ـە ،هەرچەندەحەرف لو کەمە.

[2] واتا نێوان کردنی (ان)وخبرەکەی.

[3] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٤)ـی سورەتی هود،پوختەی ماناکەی:{بێگومان هیچ پەرستراونین جگەلەو دەی ئایە ئێوە ملکەچ ومسوڵمانن } إعرابەکەشی بەم شێوەیە: وانْ/ و:حسب ماقبلها. انْ/ مخفف من المثقل ،واسمها ضمير الشأن المحذوف والتقدير(وانه). لا/نافية للجنس. إلهَ/اسم لا مبني على الفتح. وخبر لا محذوف تقديره موجود. إلاّ/أداة حصر. هو/ضميرمنفصل مبني في محل رفع مبتدا ، وخبره محذوف تقديره موجود. فهل/فـ:حرف عطف. هل:حرف استفهام. انتم/ ضميرمنفصل مبني في محل رفع مبتدا. مسلمون/خبر مرفوع وعلامة رفعه الواو لانه جمع مذكر السالم. وجملة (لاإله)الاسمية في محل رفع خبر(أن)المخففة. الشاهد فيها:لاإله حيث وقع خبر أن المخففة جملة اسمية من غير فاصل بين ان وخبرها،إلاّ إذا قصد النفي فيفصل بينهما .

گەورە﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾[1]،هەروەها وەکوفەرموودەی خوای گەورە﴿وَأَنْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ﴾[2]. بەلاّم ئەگەر فعلەکە بگۆڕ(متصرف)بوو،ئەویش بەدەر نیە لەوەی:یان بۆدوعاونزایە،یان نا، جائەگەربۆدوعا بووئەوە پێویستی بە بەینکردن(فاصل)نیە،وەکوفەرموودەی خوای گەورە﴿وَالْخَامِسَةَ أَنْ غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهَا﴾[3]،

---

[1] ئەم ئایە پیرۆزە ئایەتی ژمارە(٣٩)ی سورەتی( النجم)ە، پوختەی ماناکەی:{بێگومان مرۆڤ جگە لەکۆششی خۆی خاوەنی هیچی تر نیە} إعرابەکەشی: [الواو/ حرف عطف .أن/مخففة من الثقيلة تنصب الاسم وترفع الخبر ، واسمها ضمير الشأن محذوف وجوباً. ليس/ فعل ماض ناقص . للإنسان/ جار ومجرور متعلق بمحذوف خبر ليس مقدم . إلا/ أداة حصر .ما/ مصدرية .سعى/ فعل ماض مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهورها التعذر لأنه فعل ماض معتل بالألف ، وما المصدرية وما دخلت عليه في تأويل مصدر في محل رفع اسم ليس مؤخر ، وليس واسمها وخبرها في محل رفع خبر أن المخففة من الثقيلة .الشاهد فيها:( ..لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ) حيث وقع خبران جملة فعلية فعلها غير متصرف فلم يؤت بفاصل.

[2] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٨٥)ی سورەتی الاعراف،پوختەی ماناکەی:{بێگومان لەوانەیە نزیك بووبێتەوە کۆتای ژیانیان } إعرابەکەشی: ﴿الواو﴾ حرف عطف ﴿أن﴾ مخففة من الثقيلة تنصب الاسم وترفع الخبر ، واسمها ضمير الشأن محذوف وجوبا ﴿عسى﴾ فعل ماض تام ﴿أن﴾ حرف مصدر ونصب ﴿يكون﴾ فعل مضارع منصوب بأن و﴿يكون﴾ متصرف من كان الناقصة ترفع الاسم وتنصب الخبر ، واسمها ضمير الشأن محذوف ﴿قد﴾ حرف تحقيق ﴿اقترب﴾ فعل ماض ﴿اجل﴾ فاعل مرفوع ، وهو مضاف ، و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل جر بالإضافة ، و﴿الميم﴾ علامة الجمع ، وأن ومادخلت عليه في تأويل مصدر في محل رفع فاعل عسى و﴿جملة عسى﴾ في محل رفع خبر أنْ المخففة من الثقيلة ، و﴿جملة قد اقترب اجلهم﴾ في محل نصب خبر يكون . .الشاهد فيها:( وأن عسى..) حيث وقع خبر(أن)المخففة جملة فعلية فعلها غير متصرف فلم يؤت بفاصل.

[3] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٩)ی سورەتی النور،پوختەی ماناکەی: {لەپێنجەم جاردا بڵێ خەشمی خوای لەسەربێ....} . إعرابەکەشی: ﴿الواو﴾ حرف عطف. ﴿الخامسة﴾ معطوف على اربع "من قوله تعالى" { ان تشهد اربع شهادات } تبعه في نصبه. ﴿أن﴾ مخففة من الثقيلة تنصب الاسم وترفع الخبر ، واسمها ضمير الشأن محذوف وجوبا ﴿غضب﴾ فعل ماض ﴿الله﴾ فاعل ، وجملة الفعل والفاعل في محل رفع خبر ان المخففة ﴿عليها﴾ جار ومجرور ﴿على﴾

لەخوێندنەوەی ئەوانەی کە(غَضِبَ)یان بە فعلی ماضی خوێندۆتەوە[١]،بەڵام ئەگەر فعلەکەبۆ دوعا نەبوو ئەوە هەندێ لەزانایان فەرموویانە:پێویستە بەین(فصل)بخرێتە نێوانیان مەگەر بەکەمی، وەهەندێکی تر فەرموویانە لەوانەش دانەر:دروستە بەین بکرێت ودروستیشە نەکرێت،بەڵام چاکتروایە بەین بکرێت ،بەین کردنەکەش یەکێکە لەم چوارشتە:

یەکەم: ((قد))وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿وَنَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا ﴾[٢].

دووەم:هەردووحەرفی داهاتوو(حرفا التنفیس)[٣]،کەبریتین لە (سین وسوف)،نموونەی حەرفی سین فەرموودەی خوای گەورە﴿أَنْ سَيَكُونُ مِنْكُمْ مَرْضَى﴾[٤]،وەنموونەی حەرفی((سوف))ووتەی شاعر:

---

حرف جر ، و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل جر بعلى ، والجار والمجرور متعلق بغضب. الشاهد فيها:( أن غضب..) حيث وقع خبر(أن)المخففة جملة فعلية فعلها متصرف للدعاء فلم يؤت بفاصل،في إحدى القراءات.

[١] مەبەست ئەوەیە هەموو خوێنەرانی قورئان(القُرّاء) ئایەتەکەیان بەو شێوەیە نەخوێندۆتەوە.

[٢] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١١٣)، سورەتی المائدە، پوختەی ماناکەی{وەبزانین کە بێگومان ڕاستت لەگەڵ کردووین...}. إعرابەکەشی: ﴿الواو﴾ حرف عطف ﴿نعلم﴾ فعل مضارع معطوف على نأكل من قوله تعالى { ونريد أن نأكل منها } تبعه في نصبه، وفاعله مستتر فيه وجوباً تقديره نحن ﴿أن﴾ مخففة من الثقيلة تنصب الاسم وترفع الخبر ، واسمها ضمير الشأن محذوف وجوباً ﴿قد﴾ حرف تحقيق ﴿صدقتنا﴾ فعل وفاعل ومفعول ﴿صدق﴾ فعل ماض مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك ، و﴿التاء﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ، و﴿نا﴾ ضمير متصل في محل نصب مفعول به و﴿جملة الفعل والفاعل﴾ في محل رفع خبر أن المخففة من الثقيلة . الشاهد فيها:(. أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا)دخول (قد)على خبر (أن)المخففة،وذلك لأنّ الخبر جملة فعلية فعلهاماضٍ متصرف وليس للدعاء.

[٣] مەبەست لەحەرفی داهاتوو ئەوەیە مانای فعلە مضارعەکە تایبەت دەکەن بە داهاتوو،چونکە فعلی مضارع بۆ ئێستا(الحال)وداهاتوو(الاستقبال)دەبێت ،بەڵام کاتێك یەکێك لەم دوو حەرفە دەچێتە سەری تایبەتی دەکات بە داهاتوو.

[٤] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٢٠)ی سورەتی المزمّل، پوختەی ماناکەی{وەبێگومان خوای گەورە دەزانێ کە لەمەولا کەسانێکتان نەخۆش-

ش١٠٦/وَاعْلَمْ فَعِلْمُ الْمَرْءِ يَنْفَعُــــهُ أَنْ سَوْفَ يَأْتِي كُـــلُّ مَا قُدِرَا.[1]

سـێیەم:نەفی،وەکوفـەرموودەی خـوای گـەورە﴿أَفَلَـا يَـرَوْنَ أَلَّـا يَرْجِـعُ إِلَـيْهِمْ قَوْلًا﴾[2]،هەروەها وەکوفەرموودەی:

---

-دەبێت} .إعرابەکەی: ﴿علم﴾ فعل ماض من افعال القلوب تنصب مفعولين ، وفاعله مستتر جوازاً تقديره هو. ﴿أن﴾ مخففة من الثقيلة تنصب الاسم وترفع الخبر، واسمها ضمير الشأن محذوف وجوباً تقديره أنَهُ .﴿السين﴾ حرف تنفيس وهو الزمن القريب﴿يكون﴾ فعل مضارع مرفوع لتجرده عن الناصب والجازم وعلامة رفعه ضم آخره ، متصرف من كان الناقصة ترفع الاسم وتنصب الخبر﴿منكم﴾ جار ومجرور ﴿من﴾ حرف جر و﴿الكاف﴾ ضمير متصل مبني على الضم في محل جر بمن، و﴿الميم﴾ علامة الجمع والجار والمجرور شبه جملة متعلق بواجب الحذف تقديره كائن في محل رفع خبر كان مقدم ﴿مرضى﴾ اسمها مؤخر مرفوع بها وعلامة رفعه ضمة مقدرة على الألف ، منع من ظهورها التعذر لأنه اسم مقصور ، و﴿جملة كان مع اسمها وخبرها﴾ في محل رفع خبر أن المخففة من الثقيلة ، والمصدر المنسبك ، من أن وما بعدها سد مسد مفعولي علم ، والتقدير"علم كون مرضى منكم" . الشاهد فيها:(سيكون)،حيث وقع خبر أن المخففة جملة فعلية،والفعل متصرف لايفيد الدعاء لهذا فصل بينهما بحرف التنقيس.

[1]مانای ئەم دێرە : هەمیشە بزانەوفێربە چونکە زانستی مرۆڤ سوودی پێدەگەیێنێت کاتێك هات هەموو ئەوشتانە بڕیار دراون لە خۆشی وناخۆشی. بەڵگەکەی:( أنعسوف يأتي)،خبری (أن)ـی مخففە جملەی فعلیەوفعلەکەش بۆدوعا نیە،بۆیە بەین خراوەتە نێوانیان کەبریتیە لە حەرفی(سوف).

[2] ئەم ڕستەیە قورئانیەبەشێکە لەئایەتی ژمارە(٨٩)ـی سورەتی طه، پوختەی ماناکەی{ئایە ئەوان نازانن ونابینن _ئەوگوێرەکەیە مەبەست ئەو گوێرەکەیە کە بنی إسرائیل دەیان پەرست_وەڵامی هیچ ووتەیەکیان ناداتەوە.} . إعرابەکەی:افلا/أ: حرف استفهام. فـ:حرف عطف. لا:نافية غير عاملة. يرون/فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الواو لانه من الافعال الخمسة، وواوالجماعة/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل.

﴿أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَنْ لَنْ نَجْمَعَ عِظَامَهُ﴾[1] هەروەهاوەكوفەرموودەی: ﴿أَيَحْسَبُ أَنْ لَمْ يَرَهُ أَحَدٌ﴾[2].

چوارەم: حەرفی((لو))_كەمن ئەوزانايانەی كە باسی (لو)يان كردبێت لە بابەتەدا[3]_وەكو فەرموودەی خوای گەورە:

﴿ وَأَنْ لَوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ﴾[4]، هەروەها وەكو فەرموودەی خوای گەورە﴿أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِ أَهْلِهَا أَنْ لَوْ نَشَاءُ أَصَبْنَاهُمْ

---

انْ/مخففة من الثقيلة، واسمه ضمير الشأن المحذوف تقديره(انّه). لا/نافية غير عاملة. يرجع/فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة. وفاعله ضمير مستتر تقديره هو. وجملة(يرجع)في محل رفع خبر(ان)المخففة. إليهم/ جارومجرور متعلقان ب(يرجع). قولا/مفعول به منصوب. الشاهد فيها:(أن لايرجعُ ..) حيث وقع خبر أن المخففة جملة فعلية،والفعل متصرف لايفيد الدعاء لهذا فصل بينهما بحرف التنقيس.

[1] ئايەتی ژمارە (٣)ی سورەتی(القيامە)، كورتەی ماناكەی:ئايە مرۆڤ وادەزانێ كە ئێسقانە ڕزیوەكانی كۆناكەینەوە. إعرابەكەشی ڕوونەو بەڵگەكەشی وەكو ئايەتی پێشتر وايە.

[2] ئايەتی ژمارە (٧)ی سورەتی(البلد)، كورتەی ماناكەی:{ئايا وادەزانێ كە كەس نەيديوە} ، إعرابەكەشی ڕوونەو بەڵگەكەشی وەكو ئايەتی پێشتر وايە.

[3] واتا لە بابەتی بەين كردن(الفصل)لەنێوان(أن)ی مخففەوخبرەكەی.

[4] ئەم ڕستەيە قورئانيەبەشێكە لەئايەتی ژمارە(١٦)ی سورەتی الجن ، ماناكەی{ئەگەرئەوان (مرۆڤ وجنۆكە)بەردەوام بوونايە لەسە ڕێی ڕاست ...}، إعرابەكەشی: ﴿الواو﴾ استئنافية ﴿أن﴾ مخففة من الثقيلة واسمها ضمير الشأن محذوف وجوباً ﴿لو﴾ حرف شرط غير جازم .﴿استقاموا﴾ فعل وفاعل ﴿استقام﴾ فعل ماض مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهوره اشتغال بحركه مناسبة لأن الواو لايناسبها إلا ضم ما قبلها ، و﴿الواو﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ﴿على الطريقة﴾ جار ومجرور متعلق باستقاموا ﴿وجملة استقاموا﴾ في محل رفع خبر ان ، وان وما دخلت عليه في تأويل مصدر في محل رفع نائب فاعل لفعل محذوف تقديره أوحي إليّ . الشاهد فيها:( وَأَنْ لَوِ اسْتَقَامُوا)، حيث وقع خبر أن المخففة جملة فعلية،والفعل متصرف لايفيد الدعاء لهذا فصل بينهما بحرف(لو).

بِذُنُوبِهِمْ﴾(١).

نموونەی ئەوەی هاتبێت بەبێ بەین کردن(فاصل)،ووتەی شاعر:

ش١٠٧/ عَلِمُوا أَنْ يُؤَمَّلُونَ فَجَادُوا قَبْلَ أَنْ يُسْأَلُوا بِأَعْظَمِ سُؤْلِ.(٢)

---

(١) ئەم ڕستەیە قورئانیەش بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٠٠)ی سورەتی الاعراف،ماناکەی{ئایە ڕوون نەبۆتەوە بۆئەوانەی زەوییان بە میرات بۆدەمێنێتەوە دوای تیاچوونی خاوەنە پێشووەکانیان ئەگەر بمانەوێ بەهۆی گوناهەکانیانەوە دووچاری بەڵایلن دەکەین.} إعرابەکەشی:أ/حرف استفهام(استفهام إنكاري).و/حرف عطف. لم/ حرف نفي وجزم وقلب. يهدِ/فعل مضارع مجزوم وعلامة جزمه حذف حرف العلة. للّذين/جارومجرور متعلقان بـ(يهد). يرثون/ فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الواو لانه من الافعال الخمسة،وواوالجماعة/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل. الارض/مفعول به منصوب. وجملة(يرثون الارض) لامحل لها من الاعراب صلة الموصول. من بعد/ جارومجرور،وبعد مضاف ، أهلها/مضاف إليه مجرور،وهو مضاف وضمير/ها/ في محل جرمضاف إليه. أنْ/ مخففة من الثقيلة،واسمه ضمير الشأن المحذوف تقديره(أنه). لو/حرف تمنٍّ وشرط غير جازم .نشاءُ/ فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة الظاهرة. وفاعله ضمير مستتر تقديره(نحن). وجملة(نشاء أصبناهم) في محل رفع خبر(أنْ).والمصدر المؤوّل من(أن لونشاء) في محل رفع فاعل لـ(يهدِ). اصبْناهم/اصبْ: فعل ماض مبني على السكون لاتصاله بضمير رفع متحرك ، و﴿نا﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ، هم/ ضمير متصل في محل نصب مفعول به. بذنوبهم/ جارومجرور متعلقان بـ(أصبْناهم). . الشاهد فيها:( أَنْ لَوْ نَشَاءُ أَصَبْنَاهُمْ)، حيث وقع خبر أن المخففة جملة فعلية،والفعل متصرف لايفيد الدعاء لهذا فصل بينهما بحرف(لو).

(٢) ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: ئەوان زانییان کە جێی ئومێدن بۆیە گورج وچوست بوون وکەمتەرخەم نەبوون،پێش ئەوەی داوایان لێ کرێت بە داوای گەورە. . بەڵگەکەی:( أَنْ يُؤَمَّلُونَ) لێرەدا خبری( أن)ی مخففە جملەی فعلیە بەبێنیش نەخراوەتە نێوانیان.

هـــەروەهاوەکو فـــەرموودەی خـــوای گـــەورە﴿لِمَـــنْ أَرَادَ أَنْ يُـــتِمُّ الرَّضَـــاعَةَ﴾[1] لەخوێندنـەوەی ئەوانـەی فعلـی(یتم) یـان بـەمرفوعی خوێندۆتـەوە ئەمـە بۆچوونێکە دەربارەی خوێندنەوەی ئەم ئایەتە، بۆچوونی دووەم: پێیان وایە کە(أن)لـەم ئایەتـەدا مخففە نیەوبەڵکو (أن)ی ناصبەیە[2] وچۆتە سەر فعلی مضارع ،وفعلە مضارعەکەش مرفوع بووە بە پێچەوانەی یاسا(شاذ)ی.

* * *

[1] ئەم ڕستەیە قورئانیەبەشێکە لەئایەتی ژمارە(٢٣٣)ی سورەتی البقرة ، ماناکەی{ ..ئەمە بۆ کەسێکە بیەوێت شیری تەواو بدات...}. إعرابەکەشی: ﴿اللام﴾ حرف جر ﴿من﴾ اسم موصول في محل جر باللام والجار والمجرور متعلق بمحذوف خبر لمبتدأ مقدر تقديره ذلك المذكور من إرضاع الحولين ﴿أراد﴾ فعل ماض ، وفاعله ضمير مستتر جوازا تقديره هو ﴿أن﴾ مخففة من الثقيلة واسمها ضمير الشأن محذوف وجوباً ﴿يتم﴾ فعل مضارع مرفوع ، وفاعله مستتر فيه جوازاً تقديره هو ﴿الرضاعة﴾ مفعول به منصوب ، وجملة الفعل والفاعل في محل نصب خبر "أن"المخففة . الشاهد فيها: وردت أن مخففة وخبرها جملة فعلية فعلها متصرف ليس للدعاء ، ومع ذلك لم يُؤت بفاصل بينهما ،وهذا من أمثلة ما ورد بدون فاصل. وقيل : إنّ ( أنْ ) ليست المخففة من الثقيلة ، بل هي أنْ المصدرية الناصبة للفعل المضارع ، وارتفع الفعل ( يتمُّ ) بعدها شذوذًا ، وإهمال أنْ الناصبة للفعل المضارع لغةٌ لجماعة من العرب .

[2] لە زمانی عەرەبیدا (أنْ) بۆ چوار ماناومەبەست بەکار دێت:١-مصدريە. ٢-مفسِّرە. ٣-زائدە. ٤- مخففە من (أنّ)الثقيلة.

## *باسي سووك كردن( تخفيف )ـي( كأنّ )

١٩٦–وَخُفِّفَتْ كَأَنَّ أَيْضًا فَنُـوِي      مَنْصُـــوبُهَا وَثَابِتاً أَيْضاً رُوِي.[1]

ئەگەر تخفيف كريْت(كأنّ) ئەوە ناوەكەی نادیارومقدر دەبیْت ،وخبرەکەشی ڕستەیەکی ناوی(جملە اسميە)دەبیْت،وەکو: ((كَـأَنْ زيـدٌ قـائمٌ ))،یـان ڕستەیەکی کرداری(جملە فعليە)دەبیْت کە بە حەرفی(لم) دەست پیْبکات ، وەکو فەرموودەی خوای گەورە:

﴿كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ﴾[2]، یان بەحەرفی(قد) دەست پیْبکات ،وەکو ووتەی شاعر:

ش١٠٨/أَفِدَ التَّرَحُّلُ غَيْرَ أَنَّ رِكَابَنَا      لَمَّا تَـــزُلْ بِرِحَالِنَا وَكَأَنْ قَدِ.[3]

---

[1] ماناى ئەم دێڕەى ئەلفيە:دروستە سووك (تخفيف)كريْت (كأنّ) واسمەكەی نادیار (محذوف)دەبیْت ،وئەوڕستەیەی دوای خۆی دەبیْتە خبری، وەهەندی جاریش اسمەكەی باس دەكریْت وحذف ناكریْت.

[2] ئەم ڕستەیە قورئانیەبەشیْکە لەئایەتی ژمارە(٢٤)ـی سورەتی یونس، ماناکەی {..وەك لەوەو پیْش هەر نەبووبیْت.} ، إعرابەكەشی: ﴿كَأَنْ﴾ حرف تشبيه ونصب وهي مخففة من الثقيلة تنصب الإسم وترفع الخبر ، واسمها ضمير الشأن محذوف والتقدير "كأنه" ﴿لم﴾ حرف نفي وجزم وقلب ﴿تغن﴾ فعل مضارع مجزوم بلم ، وعلامة جزمه حذف حرف العلة من آخره وهو الألف ، والفاعل مستتر فيه جوازاً تقديره هي ﴿بالأمس﴾ جار ومجرور متعلق "بتغن" وجملة الفعل والفاعل في محل رفع خبر كَأَنْ المخففة. الشاهد فيها: (كأن) المخففة وقد نوي اسمها،وأخبر عنها بجملة فعلية مصدرةبـ(لم).

[3] پیْشتر لەشاهدی ژمارە(٢)ئەم دێڕەمان ماناکرد، ئەوەی پەیوەندی بە ئیْرەوە بیْت وەکو بەڵگە بۆ ئەم بابەتە بریتیە لە(وَكَأَنْ قَدِ) كأن تخفيف كراوەو اسمەكەی حذف كراوەوخبرەكەشی بریتیە لە جملەی(قد زالت)،دیارە (زالت)كە جملە فعلييەكەيە حذف كراوە چونكە زانراوە.

واتا(وكأن قد زالت)لەم نموونانەدا اسمی(كأن) حذف كراوە،كەبریتیە لە جێناوی حالْ(ضمیرالشأن)،وەتقدیرەكەش((كأنە زید قائم، وكأنە لم تغن بالامس، وكأنە قدزالت))،ڕستەكەی دوای(كأن) دەبێتە خبری،ئەمەیە مەبەست لە ووتەی دانەر)) نادیارومقدر دەبێت منصوبی(كأن) واتا اسمەكەی))،هەروەها ئاماژەی كرد بەووتەی((وەهەندێ جارناوەكەی باس دەكرێت ونادیار نابێت))بۆ ئەوەی كەهەندێ جار اسمی(كأن)باس دەكرێت ونادیارنابێت،بەلاّم كەمە، وەكو ووتەی شاعر:

ش١٠٨/ وَصَدْرٍ مُشْــــرِقِ النَّحْرِ كَأَنْ ثَدْيَيْـــــــهِ حُقَّـــانِ.[1]

جا(ثدییە) اسمی(كأن)ـە ومنصوبە بە(یا)چونكە (مثنی)یە، وە(حقان) خبری(كأن)ـەیە، وەئەم دێرە ڕیوایەت كراوەبە(كَأَنْ ثَدْيَاهُ حُقَّانِ) لەم كاتەدا اسمی(كأن) حذف كراوە كە بریتیە لە جێناوی حالْ وتقدیرەكەشی(كَأَنَّهُ ثَدْيَاهُ حُقَّانِ)،وەڕستەی(ثَدْيَاهُ حُقَّانِ)كە بریتیە لە:مبتداو خبر هەردووكیان لە جێگەی خبری (كأن)ن،وەلەوانەشە ((ثَدْيَاهُ)) اسمی(كأن)ـە بێت ومنصوب بێت بە ئەلیف لەسەر بۆچوونی ئەوانەی كە پێیان وایە(مثنّی) لەهەموو كاتێكدا إعرابەكەی بە حەرفی(ألف) دەبێت.[2]

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە :ئەو خاوەن سینگ وگۆبەرۆركێكی درەوشاوەیە، مەمكەكانی دەڵێی داری عاجە. بەڵگەكەی:( كَأَنْ ثَدْيَيْـــــــهِ حُقَّـــانِ) لێرەدی (كأن) تخفیف كراوەو ناوەكەشی بە دوایدا هاتووەوباسكراوە ئەمەش كەمە لە زمانی عەرەبیدا.

[2] پێشتر لە ڕاڤەی دێریژمارە(٣٢)ـی ئەلفیە باسی ئەوەمان كرد هەندێ لە عەرەب إعرابی (مثنّی) بە حەرفی ئەلیف دەكەن لە هەموو حاڵەتێكدا.

## * باسی(لا)ـی نافیه للجنس "لا" الَّتي لِنَفْيِ الْجِنْس

١٩٧- عَمَلَ إنَّ اجْعَلْ لِلاَ فِي نَكِرَهْ مُفْـــــرَدَةً جَاءَتْكَ اوْ مُكَرَّرَه.[1]

ئەمە بریتیە لە بەشی سێیەم لەوحەرفانەی مبتدا لادەبەن ، ئەویش بریتیە لە(لا)ـی نافیە للجنس[2]،مەبەست پێی نەفی کردنی هەموو ڕەگەزی ئەو ناوەیە کە بەدوایدا دێت دەقاودەق.

جابۆیە ووتم:(دەقاودەق) بۆ خۆپاراستن لەو (لا)یەی کە ناوەکەی دوای خۆی مرفوعە وەکو:(لارجلٌ قائماً) ئەم نەفی کردنە بۆ نەفی کردنی هەموو ڕەگەزی پیاوان نیە،چونکە دەکرێت مەبەست ئەوە بێت یەك پیاو بە پێوە نیە وەدەکرێت مەبەست پێی ڕەگەزی پیاوان بێت، کەواتا بەمەستی وویستنی نەفی کردنی ڕەگەزەکە دروست نیە بڵێی(لا رجلٌ قائماً بل رجلان)،بەلاّم بەمەستی نەفی کردنی یەك کەس دروستە بڵێی(لا رجلٌ قائماً بل رجلان)، بەلاّم ئەم(لا)یەی ئێرە[3] تەنها بۆنەفی کردنی ڕەگەز بەکار دێت،کەواتە دروست نیە بڵێی(لا رجلَ قائماً بل رجلان).

(لا)ـی نافیە للجنس هەمان عەمەلی((إنّ))دەکات،ومبتدا منصوب دەکات ودەیکاتە اسمی خۆی،وخبرەکەش مرفوع دەکات ودەیکاتە خبر بۆخۆی،هیچ جیاوازییەك نیە لەم عەمەل کردنە ئەگەر(لا)تەنیابێت ودووبارە نەبێت،وەکو((لا غُلامَ رجلٍ قائمٌ))،یان دووبارە بێت وەکو((لا حولَ ولا قوةَ إلا

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە: هەمان عەمەل کردنی(إنّ)_کە بریتی بوو لەمنصوب کردنی اسم ومرفوع کردنی خبر_ دانە بۆ(لا) بەمەرجێك ناوەکەی نەناسراو(نکرە)بێت، جائەگەر(لا) تەنهابێ واتا دووبارە نەبووبۆەویان دوو بارە بێت ،هەمان عەمەل دەکات.

[2] مەبەست لە نەفی هەڵوەشاندنەوەودوورخستنەوەونکوڵی کردنە بەلاّم ئێمە لە کاتی شیکردنەوەوڕاڤەکردندا دەڵێین نەفی ،وەمەبەست لە(الجنس)ڕەگەزە،واتا ئەم حەرفی(لا)یەنەفی هەموو ئەوشتانە دەکات کە پەیوەندییان بە ڕەگەزی ئەوناوەوە بێت.

[3] واتا(لا)ـی نافیە للجنس.

بالله)). هەروەها مەرجە اسم وخبرەکەی نەناسراو(نکرە)بن،بۆیە(لا)ـی نافیە لەناوی ناسراو(معرفە)عەمەل ناکات،وەئەگەر شتێکی واهاتبێت لەزمانی عەرەبیدا ئەوەدەبێت ڕاڤە(تأویل)بکرێت بە نەناسراو،وەکووتەیان((قَضِيَّةٌ ولا أَبا حَسَنٍ لها)) [١] ، تقدیروڕاڤەکەی :ولامسمّی بهذا الاسم لها[٢]، بەڵگەش بۆئەوەی کە ئەم ناوە[٣]،وەکو ناوێکی نەناسراو مامەڵەی لەگەڵ دەکریت ئەوەیە کاتێك ئاوەڵناو(صفة)ێکی بۆ دێنین بە نەناسراوی دێنینی وەکو دەڵێت((لا أبا حسنٍ حَلاّلا لها)) ،هەروەها مەرجێکی تری عەمەل کردنی(لا)ـی نافیە للجنس ئەوەیە نابێت بەین خرێتە نێوان خۆی وناوەکەی،جائەگەر بەین خرا ئەوە عەمەلی نامێنێت،وەکوفەرموودەی خوای گەورە﴿لَا فِيهَا غَوْلٌ﴾[٤].

* * *

---

[١] ئەمە قسەیەکە لە قسەکانی عەرەب ووەکوپەند بەکاردێت لەکاتێکدا کێشەیەك ڕووبدات وچارەسەری گران بێت ئەم قسەیە دەڵێن ،واتاکەی:کێشەوبابەتێك ڕووی داوەوباوکی حەسەنی بۆ نیە.مەبەست لەباوکی حەسەن ئیمامی عەلی یەکە باشترین کەس بووە بۆچارەسەرکردنی کێشەکان.

[٢] واتا:أبا حسن ناوێکی ناسراوەودروست نیە ببێتە اسمی(لا)ی نافیە للجنس،بۆیە پێویستە تأویل بکرێت بە ناوێکی نەناسراو.

[٣] واتا:ناوی أبا الحسن.

[٤] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٤٧)ی،سورەتی الصافات ،کورتەی ماناکەی{_ئەو شەرابەی لە بەهەشتدا باوەڕداران دەیخۆنەوە_مێشکیان تێك نادات}.}، إعرابەکەشی:لا/ نافیة ملغاة أي غير عاملة. فيه/ جارومجرور في محل رفع خبر مقدم. غولٌ/ مبتدا مؤخر مرفوع. الشاهد فيها: (لَا فِيهَا غَوْلٌ) حيث فصل بين لا النافية للجنس وبين اسمها فبطل عملها.

## باسی جۆروحاڵەتەكانی اسمی( لا )ـی نافیه للجنس

١٩٨- فَانْصِبْ بِهَا مُضَافاً أَوْ مُضَارِعَهْ     وَبَعْدَ ذَاكَ الْخَبَرَ اذْكُـــرْ رَافِعَه

١٩٩-وَرَكِّبِ الْمُفْـــــــرَدَ فَاتِحاً كَـلاَ     حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ وَالثَّانِي اجْعَـــلاَ

٢٠٠-مَرفوعاً أَوْ مَنْصُوباً أَو مُرَكبَا     وَإِنْ رَفَعْـــتَ أَوَّلاً لا تَنْصِـــبَا.[1]

بەدەرنیە اسمی(لا)ـی نافیە للجنس لەسێ حاڵەت :حاڵەتی یەكەم:ئەوەتاوە مضاف بێت وەكو: ((لا غلامَ رجلٍ حاضرٌ))[2].حاڵەتی دووەم:هاوشێوەی مضاف بێت، مەبەستیش لەهاوشێوەی مضاف:هەموناوێكە پەیوەندی هەبێت بەدوای خۆیەوە:یان بەوەی كەعەمەلی تێدا دەكات،وەكو: ((لا طالعاً جبلاً ظاهرٌ [3]،ولا خیراً مِنْ زیدٍ راكبٌ))[4]، یان بەوەی كە ناوی دوای خۆی

---

[1] كورتەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە:١٩٨-منصوب بكە_ اسمی (لا)_ئەگەر مضاف بوویان هاوشێوەی مضاف بوو،وەدوای ئەوەش خبرەكەی مرفوع بكە. ١٩٩- بەڵام ئەگەر اسمی(لا)ی نافیەكە تاك(مفرد)بوو_واتا مضاف نەبوو_ئەوە مبنی بكە لەسەر(فتحە)وەكو چۆن ژمارەی لێكدراو(عدد مركب)مبنی دەبێت لەسەرفتحە، وەكونموونەی: (لَاحَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ )،جائەگەر ناوەكەی یەكەمت مبنی كرد_لەحاڵەتی دووبارە بوونەوەی(لا)_ئەوەناوی دووەم سێ حاڵەتی تێدا دروستە وبەم شێوەیە. ٢٠٠-دەتوانی مرفوعی بكەی،یان منصوبی بكەی ،یان مبنی بكەی وەكو مبنی بوونی ژمارەی لێكدراو، بەڵام ئەگەر ناوی یەكەمت مرفوع كرد ئەوە ناتوانی ناوی دووەم منصوب بكەی.

[2] إعرابی تەواوی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە: ﴿لا﴾ نافية للجنس ﴿غلام﴾ اسم لامنصوب وعلامة نصبه فتح آخره ، وهو مضاف و﴿رجلٍ﴾ مضاف إليه مجرور ﴿حاضرٌ﴾ خبر"لا"مرفوع .

[3] ماناوإعرابی ئەم ڕستەیە: هیچ كەسێكی چووە سەر كێو دیار نیە، إعرابەكەشی:﴿لا﴾ نافيه للجنس تعمل عمل إن ﴿طالعاً﴾ اسمها منصوب ، وهو اسم فاعل يعمل عمل فعله يرفع الفعل وينصب المفعول ، وفاعله مستتر فيه جوازاً تقديره هو ﴿جبلاً﴾ مفعول به لـ(طالعاً) منصوب، ﴿ظاهر﴾ خبر"لا"مرفوع .

[4] ماناوإعرابی ئەم ڕستەیەش: هیچ سوار چاكێ چاكتر لەزید سوارنەبووە،إعرابەكەشی ڕوون ودیارە.

عطف کراوەتەوە بۆی وەکو: ((لا ثلاثةً وثلاثين عندنا))[1]،جابەهاوشێوەی مـضاف دەوترێت:مُطّولاً یان مَمْطُولاً،واتا:درێـژکراو، جـاحوکمی اسمی(لا)کاتێ کە مضاف یان هاوشێوەی مضاف بێت ئەوەیە کە منصوب بێت بە(لفظ)ی خۆی[2]،وەکو نموونە هێنرایەوە.

حاڵەتی سێیەم: ئەوەیە کە تاك(مفرد)بێت مەبەستیش لە تاك[3]_ لێرەدا_ ئەوەیـە کـەمـضاف وهاوشـێوەی مـضاف نـەبێت، کەواتـە مفـرد لێـرەدا کـۆ(الجمـع)وکراوبـەدووانیش(المثنّـی)دەگرێتـەوە،حوکمی ئـەم جـۆرەش ئەوەیـە مبنیـە لەسـەر ئەوشـتەی کـە پێـشتر[4] پێـی منـصوب بووە،چونکە لێـرەدا ئـەم نـاوە لەگـەڵ(لا)ـی نافیەکـە لێکـدراون ووەکـو یـەك ناویـان لێهاتووە،وەکو ناوی خمسةَ عشَر،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە مبنیـە لەجێگـەی نصبدایە بۆ(لا)وچونکە دەبێتە اسمی(لا)،کەواتا ئەوناوە تاکەی کە کۆ یان دووان نیـە ئەوەمبنیـە لەسـەر فتحـە وەکـو((لاَحَـوْلَ وَلاَ قُـوَّةَ إلاّ بـالله))[5]، هەروەها ناوی کۆ ودووان(المثنّی) مبنی دەبن لەسەر ئەوشـتەی پێشر پێـی

---

[1] ماناوإعرابی ئەم ڕستەیەش: هیچ سی وسییەك لای ئێمە نیە ،إعرابەکەشی: ﴿لا﴾ نافية للجنس ﴿ثلاثة﴾ إسمها منصوب بها ، و﴿ثلاثين﴾ ﴿الواو﴾ حرف عطف ﴿ثلاثين﴾ معطوف على اسم "لا" تبعه في نصبه ، وعلامة نصبه الياء نيابة عن الفتحة لأنه محمول على جمع المذكر السالم ﴿عند﴾ ظرف مكان منصوب على الظرفية وهو مضاف ، و﴿نا﴾ ضميرمتصل في محل جر بالإضافة ، والظرف وما أضيف إليه شبه جملة متعلق بمحذوف في محل رفع خبر "لا".

[2] مەبەست بە منصوب بوون بە(لفظ) پێچەوانەی (محلا)یان(تقديراً).

[3] پێشتر باسمان کرد لەزمانی عەرەبیدا ووشەی(مفرد) بۆسێ مانا بەکار دێت و هەرمانایەك لەو مانایانە لەبەرانبەر شتێکدایە،جا لەبابەتی(لا)ی نافیە للجنس کە دەوترێت مفرد لەبەرانبەر مضاف وهاوشێوەی مضاف دا دەوترێت.

[4] واتا پێش ئەوەی بووبێتە اسمی(لا)ی نافیە للجنس.

[5] إعرابی (حول)و(قوّە) بەم شێوە دەکرێت: اسم لا مبني على السكون في محل النصب.

منصوب بوون_کەبریتیە لەحەرفی یا_وەکو((لا مُسلِمَیْنِ لكَ، ولا مُسلِمِیْنَ لك))،لێرەدا مُسلِمَیْنِ و مُسلِمِیْنَ مبنین لەبەر ئەوەی لەگەڵ (لا)لێکدراون،هەروەکو چۆن ناوی(رجل) کەدەبێتە اسمی لا مبنی دەبێت.

بەلاّم کوفێکان وپێشەوازجّاج پێیان وایە ناوی(رجل) لەووتەی(لارجلَ) معربەومبنی نیە وفتحەکەشی فتحەی معرب بوونەوفتحەی مبنی بوون نیە ، هەروەها پێشەوا مُبرّد پێی وایە ((مُسلِمَیْنِ))و((مُسلِمِیْنَ)) معربن ومبنی نین.

بەلاّم جمعی مؤنثي سالم[1]،کۆمەڵێك لەزانایان دەڵێن:مبنیە لەسەرئەوشتەی پێشتر پێی منصوب بووە_کەبریتیە لەکسرە_کەواتە دەڵێت: ((لا مسلماتِ لك)) بەمکسور کردنی حەرفی(تا)،وەوەکو ووتەی شاعر:

ش١٠٩/ إنَّ الشَّبَابَ الّذِي مَجْدٌ عَوَاقِبُهُ فِيهِ نَلَـــذُّ وَلاَ لَذَّاتِ لِلشَّيْبِ.[2]

بەلاّم هەندێ لەزانایان بەدروستی دەزانن کە مبنی بێت لەسەر فتحە،وەکو((لا مسلماتَ لك)).

هەروەها ووتەی دانەر((وَبَعْدَ ذَاكَ الْخَبَرَ اذْكُرْ رَافِعَه)) ماناکەی ئەوەیە خبری(لا)دێت لەدوای اسمەکەوە ،بەمرفوعی،وئەوەشی کەمرفوعی کردووە بریتیە لە(لا)بەڕای دانەروکۆمەڵێك لەزانایان،بەلاّم بەڕای پێشەوا سیبویە ئەوەی کە خبرەکەی مرفوع کردووە(لا)یە ئەگەر ناوەکەی مضاف یان هاوشێوەی مضاف بێت،بەلاّم ئەگەر ناوەکەی مفرد بێت ،ئەوەزانایان ڕایان جیایە دەربارەی مرفوع کارەکەی،پێشەوا سیبویە پێی وایە کە مرفوع نیە بە(لا)،بەڵکو مرفوعە بەوەی کەخبری مبتدایە،چونکە پێشەوا سیبویە ڕای

---

[1] واتا کاتێك دەبێتە اسمی (لا)ی نافیە للجنس.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: بێگومان ئەوتەمەنی لاوێتی وگەنجێتیەی کە دواڕۆژەکەی گەورەی وسەربەرزیە تێدا خۆشحاڵین ، وەبێگومان هیچ خۆشییەك لە پیرێتی دا نیە. بەڵگەکەی:( وَلاَ لَذَّاتِ لِلشَّيْبِ) اسمی(لا) لێرەدا جمعی مؤنثي سالمەومبنیە لەسەر کسرە.

وايـه كـه(لا)واسمەكـەى پێكـەوە لـەمحلى رفعـدا مبتدان،وناوەكـەى دوايـان دەبێتـە خـبر بـۆى ،لـەم حاڵەتـەدا(لا)تـەنها عەمـەلى لـە اسمەكەيـدا كـردووە، بەلأم پێشەوا ئەخفەش ڕاى وايە كە خبر[1] مرفوعە بە(لا) كەواتا (لا)عەمـەلى كـردووە لـە هـەردوو بەشـەكە،هەروەكو چۆن عەمەلى كـردووە لـەوناوەى كـە مضافە يان هاوشێوەى مضافە .

هــەروەها ئامــاژەى كــرد دانەربەووتــەى:(( وَالثَّــانِى اجْعَــلاَ)) بۆئــەوەى كەئەگەرلەدواى(لا)واسمەكەيەوە ناوێكى عطف كراوى نەناسراوى تاك هات و(لا)يەكەش دووبارە ببووەوەوەكو((لاحَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ))،ئـەوە بۆنـاوى دووەم پێـنج شـێوە دروسـتە،لەبەرئەوەى نـاوى يەكـەم(معطـوف عليـە):يـان لەگەڵ(لا)مبنى دەبن لەسەرفتح،يان منصوب دەبێت ،يان مرفوع دەبێت.

جائەگەر ناوى يەكەم مبنى بوو ئەوەناوى دووەم سىٚ شێوەى تيا دروستە:

يەكــەم:مــبنى دەبێــت لەسەرفتحە،چـونكە دەبێتــە نــاوێكى لێكدراولەگــەڵ(لا)ــى دووەم،و(لا)ـى دووەميش عەمەلى(إنّ)ـى كردووە،وەكو((لاحَوْلَ إلاّ وَلاَ قُوَّةَ بِاللهِ)).

دووەم:منصوب دەبێت بـەوەى كـەعطف دەكرێتـەوە بۆسـەر جێگـە(محل)ـى اسمــى (لا)،لــەم كاتــەدا(لا)ــى دووەم دەبێتــە زيادكراولــەنێوان عطــف كــراووعطــف بۆســەركراووعەمەل ناكــات،وەكو: ((لاحَــوْلَ وَلاَ قُــوَّةً إلاّ بِاللهِ))،وەوەكو ووتەى:

ش١١٠/لا نَسَبَ الْيَوْمَ وَلاَ خُلَّةً اتَّسَعَ الْخَرْقُ عَلَى الرَّاقِعِ.[2]

---

[1] واتا خبرى (لا)ـى نافيە للجنس.

[2] ماناوبەڵگەى ئەم دێرە:لەم ڕۆژەدا نەژادو نەسب ودۆستايەتى وبرادەرێتى سوودى نيە ،فراوان وگەورە بووە كونى دڕاوى لەسەر چنەرى _واتا كار لەكارترازاوە_. بەڵگەكەى:( وَلاَ خُلَّةً..)لێرەدا (لا)بەزيادكراودەدەنرێت و(خُلَّةً)منصوبە وعطف كراوەتەوە بۆ سەر محلّى اسمى(لا)ـى يەكەم.

سێیەم:مرفوع دەبێت ،بۆ ئەمەش سێ ڕووی هەیە: یەکەم: ئەوەیە کە عطف کرابێتەوەبۆسەر جێگە(محل)ـی(لا)واسمەکەی،چونکە هەردووکیان لە محلی رفعدا لەجێی مبتدان بەبۆچوونی پێشەوا سیبویە ،لەم کاتەشدا(لا)ـی دووەم زیادکراوە. دووەم:دەکرێت (لا)ـی دووەم عەمەلی(لیس)ـەی کردبێت. سێیەم: دەکرێت ئەم ناوە[1] مرفوع بێت بەوەی بووبێتە مبتدا و(لا)یەکەش هیچ عەمەلی نەکردبێت، ئەمەش وەکو((لاحَوْلَ وَلاَ قُوَّةٌ إلاّ باللهِ))، هەروەها وەکو ووتەی شاعر:

ش١١١/ هَذَا _لَعَمْرُكُمْ_ الصَّغَارُ بِعَيْنِهِ     لاَ أُمَّ لِي إنْ كَانَ ذَاكَ وَلاَ أَبُ.[2]

بەڵام ئەگەر ناوەکەی یەکەم کە(معطوف علیە)ـە منصوب بێت ئەوەلەم کاتەدا ناوەکەی دووەم(معطوف)ـەکە ئەوسێ شێوە إعرابەی تیادروستە کە باسکرا_مەبەستم مبني بوون ،ومرفوع بوون،و منصوب بوونە_وەکو نموونەی: لا غلامَ رجلٍ ولا امرأةَ ، ولا امرأةً ، ولا امرأةٌ .

وەئەگەر ناوەکەی یەکەم(معطوف علیە) مرفوع بێت ئەوە لەناوی دووەمدا دووشێوە إعراب دروستە:یەکەم: مبني بوون لەسەر فتحە ،وەکو((لا رجلٌ ولا امرأةَ، ولا غلامُ رجلٍ ولا امرأةَ))،وەوەکو ووتەی شاعر:

ش١١٢/ فَلاَ لَغْــوٌ وَلاَ تَأْثِيمَ فِيهَا     وَمَا فَاهُوا بِهِ أَبَداً مُقِيــــــمُ.[3]

---

[1] واتا ناوی دوای(لا)ـی دووەم.

[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: ئەمە_بەگیانتان قەسەم_خودی سەرشۆڕیە ، دایك وباوکم نەبێ ئەگەر شتی وا بێ. بەڵگەکەی:( وَلاَ أَبُ)لێرەدا (ابُ) لە دوای (لا)ـی دووەمەوە هاتووەومرفوعە بەپێی یەکێك لە سێ ڕووەی لە شەرحەکەدا باسمان کرد.

[3] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: هیچ قسەی بێ ماناو تاوان وگوناهی تێدا نیە، وەهیچ کاتیش قسەی بێ مانای تێدای ناکەن. بەڵگەکەی:( فَلاَ لَغْــوٌ وَلاَ تَأْثِيمَ) لێرەدا(لا)ـی یەکەم یان هیچ عەمەلی نەکردووە یان عەمەلی(لیس)ـەی کردووە،وە(لا)ـی دووەم عەمەلی(إنّ)ـەی کردووە.

دووەم: مرفوع بێت ،وەکو((لا رجلٌ ولا امرأةٌ ولا غلامُ رجلٍ ولا امرأةٌ))،لەم حاڵەتەدا[1] دروست نیە ناوی دووەم منصوب بێت ،چونکە پێشتر بۆیە دروست بوو لەبەر ئەوەی عطف ئەکرایەوە بۆسەر جێگە(محل)ی اسمی(لا)،بەڵام(لا)لەم حاڵەتەدا ناوەکەی منصوب نەکردووە بۆیە منصوب بوون نەماوە،بۆیە دانەرفەرمووی((وَإِنْ رَفَعْتَ أَوَّلاً لا تَنْصِبَا)).

* * *

[1] واتا لە حاڵەتی مرفوع بوونی ناوی یەکەم.

## باسی حوکمی سیفەتی اسمی( لا )

٢٠١- وَمُفْــــرَداً نَعْتاً لِمَبْنِيٍّ يَلِــي    فَافْتَحْ أَوِ انْصِبَنْ أَوِ ارْفَعْ تَعْدِلِ.[١]

هــەرکاتێك اسمــی(لا) مــبنی بوو،وەســیفەتێکی تــاك(مفــرد)ــی بــەدوادا هـات_واتـا هیچ شتێك نەکەوتبووە نێوانیـان_ئەوە ئەوسیفەتە سێ ڕووی إعرابی تێدا دروستە:

یەکەم:مبنی دەبێت لەسەرفتحە،لەبەرئەوەی لەگەڵ(لا) لێکدەدرێن،وەکو(( لا رجلَ ظریفَ)).دووەم:منـصوب دەبێت،لەبەر ڕەچاوکردنی جێگـە(محـل)ـی اسمی(لا)،وەکو(( لا رجلَ ظریفاً )).

سێیەم:مرفوع دەبێت بەڕەچاوکردنی جێگە(محل)ـی (لا)واسمەکەی،چونکە هــەردووکیان[٢] لــەمحلی رفعــن بەبۆچــوونی ســیبویە وەکوباســکرا، وەکونموونەی((لا رجلَ ظریفٌ)).

* * *

٢٠٢- وَغَيْرَ مَا يَلِي وَغَيْرَ الْمُفْرَدِ    لاَ تَبْنِ وَانْصِبْهُ أَوِ الرَّفْعَ اقْصِدِ.[٣]

لــەدێڕی پــیش ئــەم دێــڕەدا ڕابــورد کــە ئەگــەر اسمــی(لا)مفــرد بــوو وەسیفەتەکەشی مفرد بووەڕاستەوخۆ بەدوایدا هات بوو،ئەوەئەو سیفەتە سێ جۆر إعرابی تێدا دروستە،وەلەم دێڕەدا باسی ئەوەدەکات کە ئەگەر

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەگەر اسمی(لا)ـی نافیە للجنس سیفەتێك(نعت)ـی بۆهات ،ئەوەدروستە ئەوسیفەتە مبنی کەیت لەسەرفتحەودروستیشە منصوبی کەیت ویان مرفوعی کەیت.

[٢] واتا(لا)واسمەکەی.

[٣] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:بەڵام ئەگەرسیفەتی اسمی(لا) ڕاستەوخۆ بەدوایدا نەهات وبەین کرابوولەنێوانیان،یان ئەگەر سیفەتەکە تاك(مفرد)نەبوو،ئەوە لەم کاتەدا دروست نیە سیفەتەکە مبنی بێت بەڵکو دەبێت یان منصوب بێت یان مرفوع بێت.

سيفەتەكە ڕاستەوخۆ بەدوای وەسفكراو(منعوت)ەكەدا نەهات ،بەڵكو بەين خرابووە نێوانيان،ئەوكات دروست نيە سيفەتەكە مبنی بێت ،كەوابوو دروست نيە بڵێت((لا رجلَ فيها ظريفَ))بەمبنی بوونی(ظريفَ)،بەڵكو پێويستە مرفوعی كەيت،وەكو((لا رجلَ فيها ظريفٌ))،يان منصوبی كەيت،وەكو((لا رجلَ فيها ظريفاً))،جابۆيە مبنی بوون لێرەدا نەما لەبەرئەوەی_لەكاتی نەبوونی بەين(فاصل)_سيفەتەكەواسمەكە وەكو ناوی لێكدراويان لێدەهات،بەڵام لەگەڵ بوونی بەين لەنێوانيان لێكدراوی نامێنێت،هەروەها لێكدراوبوون نابێت كاتێك وەسفكراو تاك نەبێت،وەكو((لا طالعاً جبلاً ظريفٌ))،وەهيچ جياوازييەك نيە _لەدروست نەبوونی مبنی بوون لەسەر فتحە بۆسيفەتەكە لەكاتی هەبوونی بەين لەنێوان ناوەكەوسيفەتەكەی_ ئەگەر ئەوناوە وەسفكراوە تاك بێت يان تاك نەبێت.

هەروەها ئاماژەی كرد دانەر بەووتەی((وَغَيْرَ الْمُفْرَدِ)) بۆئەوەی كە ئەگەر سيفەتەكە تاك نەبوو_وەكو ئەوەی مضاف يان هاوشێوەی مضاف بوو_ئەوەلەم حاڵەتەشدا پێويستە يان مرفوع بێت يان منصوب بێت،وەدروست نيە مبنی بێت لەسەر فتحە،لەم كاتەشدا جياوازی نيە لەوەی كە ناوە وەسفكراوەكە تاك بێت يان تاك نەبێت ،وەبەين خرابێتە نێوانيان يان بەين نەخرابێت،ئەمەش وەكو((لا رجلَ صاحبَ برٍّ فيها، لا غلامَ رجلٍ فيها صاحبَ برٍ)).

پوختەی ئەودوو[1] دێڕە:هەركاتێك سيفەتەكە تاك بوو،وەوەسفكراوەكەش تاك بوو،وەبەين(فصل)نەكرابوون،ئەوە سيفەتەكە سێ ڕووی إعرابی تێدا دروستە،وەكو((لا رجلَ ظريفَ، وظريفاً، وظريفٌ))،بەڵام ئەگەر هەردووكيان[2] بەم شێوەيە نەبوون ئەوكات تەنها مرفوع بوون يان منصوب بوون دروستە ، مبنی بوون دروست نيە.

* * *

---

[1] واتا دێڕی ژمارە ٢٠١و٢٠٢.

[2] واتا:سيفەتەكەو وەسفكراوەكە(النعت والمنعوت).

٢٠٣- وَالْعَطْفُ إِنْ لَمْ تَتَكَرَّرْ(( لاَ)) احْكُمَا لَهُ بِمَا للنَّعْتِ ذِي الْفَصْلِ انْتَمَى.[1]

پێشتر ڕابورد كە ئەگەر ناوێ عطف كرایەوە بۆسەر اسمی(لا)،وەناوەكە تاكی نەناسراو بوو،و(لا)یەكەش دووبارە ببوویەوە،ئەوە ناوە عطف كراوەكە سێ ڕووی إعرابی تێدا دروستە: مرفوع بوون ،ومنصوب بوون ، مبنی بوون لەسەر فتحە،وەكو((لا رجلَ ولا امرأةٌ ولا امرأةً ولا امرأةَ)) ،وەلەم دێڕەدا دانەر باسی ئەوەدەكات كە ئەگەر(لا)دووبارە نەبۆیەوە ئەوە لەناوە عطف كراوەكەدا دروستە ئەوەی لە سیفەتی بەین كراودا دروست بوو، پێشتریش ڕابورد_لەدێڕی پێش ئەم دێڕە_كە دوو حاڵەتی تێدا دروستە:مرفوع بوون ،ومنصوب بوون ،وەدروست نیە مبنی بێت لەسەر فتحە، دەڵێیت((لا رجلَ و امرأةٌ، وامرأةً))،دروست نیە مبنی بێت لەسەر فتحە،پێشەوەا ئەخفەش گێڕاوێتیەوە((لا رجلَ و امرأةَ))بەمبنی بوونی لەسەر فتحە،بەنیەتی ئەوەی كە(لا)كە دووبارە بێت،هەروەك ئەوەی ووتبێتی((لا رجلَ ولا امرأةَ))وپاشان(لا)یەكە حذف كرابێت.

هەروەها ئەگەر ناوە عطف كراوەكە تاك(مفرد)نەبوو،ئەوەتەنها مرفوع بوون ومنصوب بوون تێیدا دروستە،(لا)دووبارە بێت وەكو((لا رجلَ ولا غلامَ امرأةٍ))،یان دووبارە نەبێت وەكو((لا رجلَ و غلامَ امرأةٍ)). هەموو ئەمانەش بۆ كاتێكە كە ناوە عطف كراوەكە نەناسراو بێت،بەڵام كاتێك ناسراو بێت ئەوەتەنها مرفوع بوون تێیدا دروستە، لەهەمووكاتێكدا،وەكو((لا رجلَ ولا زیدٌ فیها))،یان وەكو((لا رجلَ وزیدٌ فیها)).

* * *

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەگەر ناوێك عطف كرێتەوە بۆسەر اسمی(لا)بەبێ دووبارە كردنەوەی(لا)،ئەوە ناوە عطف كراوە هەمان حوكمی سیفەتی بەین كراو (النعت المفصول)ی هەیە،كە لەدێڕی پێشوتردا باسكرا.

٢٠٤- وَأَعْطِ لاَ مَعْ هَمْزَةِ اسْتِفْهَامِ مَـــــــا تَسْتَحِقُّ دُونَ الاسْتِفْهَامِ.[(١)]

ئەگـەر هـەمزەی پرسـیارکردن(الاسـتفهام) چۆیە سـەر(لا)ـی نافیە للجـنس، ئەوە هەموو ئەوحوکم وبڕیارانەی پێشتر هەیبووەوباسـکران بەبێ هەمزەکـە دەیمێنێتـەوە ،کەواتـە دەڵێیـت((أَلاَ رجلَ قـائمٌ ؟ وأَلاَ غـلامَ رجلٍ قـائمٌ ؟ وأَلاَ طالعاً جبلاً ظاهرٌ ؟))، هـەروەها حـوکمی نـاوی عطـف کراووسـیفەت_دوای هەمزەی پرسـیار_هەمان حوکمی پێش هەمزەکەیە.

بەم شێوە ڕەهایە فەرموویەتی دانەر_ڕەحمـەتی خـوای لێ بێ_لێرەدا،بـەلاّم ووردە کارییـەك(تفـصیل)لـە بابەتەکـەدا هەیـە، ئـەویش بریتیـە لـەوەی:کـە ئەگـەر مەبەسـت لەوهـەمزەیە سـەرکۆنەکردن(التـوبیخ)بێـت ،یـان نـەفی کـردن بێـت ،ئـەوە حوکمەکـەی وایە کـە باسـکرا، لـەوەی کـە هـەمان حـوکمی هەیـە بـەبێ هەمزەکـە لـە حـوکم وبڕیارەکـانی عطـف کردنەوەوسـیفەت بۆهێنـان ودروستی هەڵوەشاندنەوەی(الالغاء) .جا نموونەی سەرکۆنەکردن وەکـو((أَلاَ رُجُوعَ وقَدْ شِبْتَ ؟))[(٢)]،وە وەکو ووتەی:

ش١١٣/ أَلا ارْعِوَاءَ لِمَنْ وَلَّتْ شَبِيبَتُهُ وَآذَنَتْ بِمَشِيبٍ بَعْدَهُ هَــرَمُ .[(٣)]

---

[(١)] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: بدە بە(لا)ـی نافیە للجنس کاتێك هەمزەی پرسیارکردنی لەسەر بێت،هەموو ئەو حوکم ویاسایانەی هەبوو بەبێ هەمزە.

[(٢)] واتا:ئایە ناگەڕێیتەوەوپەشیمان نابیتەوە لەکاتێکدا پیر بووی؟ لێرەدا مەبەستی پرسیارکردن نیە بەڵکو مەبەستی سەرزەنشت کردن ولۆمەکردنێتی.

[(٣)] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە :ئایە دەست هەڵناگرێ ئەو کەسەی لاوێتی ڕۆیشتووە، وەپیری پێی ڕاگەیاندووە کە بەرەوتیا چوون ونەمان دەڕوات. بەڵگەکەی:(أَلا ارْعِوَاءَ) لێرەدا (لا)ـی نافیە للجنس عەمەلی لە دوای خۆی کردووە لە کاتێکدا هەمزە چۆتەسەری،چونکە هەمزەکە بۆ سەرکۆنەکردن وسەرزەنشت کردنە.

وەنموونەی همزە کە بۆ نەفی کردن بێت وتەت((ألَا رجلَ قائمٌ))[١]، وە وەکو ووتەی:

ش١١٤/ أَلا اصْطِبَارَ لِسَلْمَى امْ لَهَا جَلَدٌ . إِذَا أُلاَ قِي الَّذِي لاقَاهُ أَمْثَالِي.[٢]

بەلآم ئەگەر مەبەست لە هەمزەکە ئاوات خواستن(التمنّى)بوو،ئەوەبۆچوونی پێشەوا مازنیّ وایە کە هەمان عەمەلی پێشووتری دەبێت، بەڕەهایی دەربڕینی دانەریش وای لێدەفامرێتەوە، بەلآم بۆچوونی پێشەوا سیبویە وایە کە عەمەل لە اسمەکەدا دەکات ،ودروست نیە عەمەلەکەی نەمێنێت ،وەدروست نیە عەمەل لەسیفەت وناوە عطف کراوەکەدابکات بەوەی مرفوعیان بکات .

نموونەی بەکارهێنانی(لا)بۆ ئاوات خواستن(التمنی) قسەیان[٣]:(( أَلاَ ماءَ ماءَ بارداً))[٤]، هەروەها وەکو ووتەی شاعر:

ش١١٥/أَلاَ عُمْرَ وَلَّى مُسْتَطَاعٌ رُجُوعُهُ فَيَرْأَبَ مَا أَثْأَتْ يَدُ الْغَفَلاَتِ.[٥]

* * *

---

[١] واتا :هیچ کەسێك بە پێوە نیە.

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە :خۆزگە دەمزانی سەلمەخان خۆڕاگروخاوەن صبر دەبێت یان ناﺋﺎکاتێك کە تووشم دەبوو ئەوەی تووشی هاوڕێنەکانم دەبوو_کە مردنە_ بەڵگەکەی:( أَلا اصْطِبَارَ ) لێرەدا (لا)ی نافیە للجنس عەمەلی لە دوای خۆی کردووە لە کاتێکدا هەمزە چۆتەسەری،چونکە هەمزەکە بۆ پرسیارکردنەو(لا)یەکەش بۆ نەفی کردنە.

[٣] واتا:قسەی عەرەب.

[٤] واتای ئەم قسەیە: خۆزگە ئاویك هەبوایە ئاوێکی سارد.

[٥] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: خۆزگە ئەو تەمەنەی ڕابوردوڕۆی کرابا گەڕانەوەی ودەهاتەوە،بۆ ئەوەی پڕکاتەوە ئەوکەلێنان وهەڵانەی دەستی بێئاگای دروستی کردووە. بەڵگەکەی:( أَلاَ عُمْرَ) لێرەدا هەمزە و(لا)بەکار هاتوون بۆ ئاوات خواستن،ئەمەش زۆرە لەزمانی عەرەبیدا.

***باس نەکرن( حذف )ـی خبری( لا )ـی نافیه للجنس.**

٢٠٥- وَشَاعَ فِي ذَا الْبَابِ إِسْقَاطُ الْخَبَرْ إِذَا الْمُرَادُ مَعْ سُقُوطِهِ ظَهَرْ.[١]

هەرکاتێك بەڵگەهەبوو لەسەرخبری(لا)ـی نافیه للجنس ئەوە پێویستە خبر حذف کرێت لای تەمیمێکان وطائیەکان ،بەڵام بەلای حجازییەکانەوە زۆرە حذف کردنی[٢] نموونەی وەکو ئەوەی بوترێت:( هَلْ مِنْ رجلٍ قائمٌ؟ تۆش لە وەڵامدا دەڵێی:(لارجلَ)،وخبرەی حذف دەکەیت_کەبریتیەلە قائمٌ_یەواجبی لای تەمیمێکان وطائیەکان، وەبەدروست(جائز)ـی لای حجازییەکان،هیچ جیاوازییەك نیە خبرەکە ظرف وجارومجرور نەبێ وەکو نموونە هێنرایەوە ،یان ظرف وجارومجروربێ ،وەکو ئەوەی بوترێ:هلْ عندك رجلٌ؟ یان:هلْ في الدار رجلٌ؟تۆش لەوەڵامدا دەڵێی((لارجُلَ)).

بەڵام ئەگەر بەڵگە نەبێت لەسەر لابردن وباس نەکردنی خبرەکە ئەوە دروست نیە حذف کرێ لای هەمووان،وەکو فەرموودەی سەروەرمان_ صلی الله علیه وسلم_(( لا أَحَدَ أَغْيَرُ مِنَ اللهِ))[٣]،هەروەها وەکو ووتەی شاعر:

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: زۆرە لەم بابەدا_واتا لەبابەتی(لا)ـی نافیه للجنس_ حذف کردن وباس نەکردنی خبر،بە مەرجێك مەبەست وماناکەی دیارو ئاشکرا بێت وبەڵگە هەبێت لەسەر ئەو حذف کردنە.

[٢] واتا:لای حجازییەکان پێویست(واجب)نیە ،بەڵام زۆرە.

[٣] ئەم فەرموودەیە هەریەك لەپێشەوا بوخاری ومسلیم ڕیوایەتیان کردووە، پوختەی ماناکەی:{هیچ کەس لەخوای گەورە بەغیرەت تروتوڕە ترنیە لە بەرامبەر خراپەوگوناه وتاوان}. إعرابەکەی: ﴿لا﴾ نافية للجنس تعمل عمل إن ﴿أحدَ﴾ مبني على الفتح في محل نصب اسمها ﴿أغيرُ﴾ خبرها مرفوع بها ﴿من الله﴾ جار ومجرور متعلقان بأغير .الشاهدفيه:وجوب ذكرخبر لاوهو(اغيرُ) لأنه لاوجود لدليل يدلُّ عليه .

ش١١٦/ وَلاَ كَرِيمَ مِنَ الوِلْدَانِ مَصْبُوحُ.[١]

بــۆ ئەمــەش ئامــاژەی كــرد دانــەر بەووتــەی((إِذَا الْمُــرَادُ مَــعْ سُقُوطِـــهِ ظَهَـــرْ))،بەمەش خۆی پاراست لـەوەی كە باس نـەكردن وحذف كردنـی خبری (لا)بەبیّ بەڵگە دروست نیە وەكو ڕابورد.

تێبینی/ لێرەدا كۆتای بەبابەتی (لا)ــی نافیه للجنس هات.

(١) ماناو بەڵگەی ئەم دێرە: هیچ منداڵێكی بەڕێز شەڕابی بەیانیانی پیّ نەدراوە. بەڵگەكەی:(مصبوحُ) لێرەدا خبری(لا)باسكراوە چونكە ئەگەر باس نەكرایەوحذف كرایە هیچ بەڵگەیەك نەدەبوو لەسەری بۆیە دروست نیە حذف كرێت.

## باسی( ظَنَّ )وهاوشێوەکانی

٢٠٦-انْصِبْ بِفِعْلِ القَلْبِ جُزْءَيِ ابْتِدَا أَعْنِي: رَأَى، خَالَ ،عَلِمْتُ، وَجَدَا
٢٠٧-ظَنَّ ،حَسِبْتُ ،وَزَعَمْتُ ،مَعَ عَدّ حَجَا، دَرَى، وَجَعَلَ اللَّذْ كَاعْتَقَدْ
٢٠٨-وَهَبْ ،تَعَلَّمْ ،وَالّتِي كَصَيَّرا أَيْضاً بِهَا انْصِبْ مُبْتَدَاً وَخَبَرَا.[1]

ئەمە بریتیە لەبەشی سێیەم لەوفعلانەی کە هەڵگرولابەری ابتدان،ئەویش بریتیە لە(ظَنَّ)وهاوشێوەکانی.

ئەمانیش دابەش دەبن بۆ دووبەش:بەشێکیان:کردارەکانی دڵە(أفعال القلوب)[2]،وەدووەمیان:بریتیە لەکردارەکانی گۆڕین(أفعال التحويل)[3].

جاکردارەکانی دڵیش دابەش دەبن بۆ دوو جۆر: یەکێکیان:ئەوانەن بۆ دڵنیابوون(الیقین)بەکاردێن،دانەر پێنجیانی لیّ باس کرد:رأی ،وعَلِمَ ، ووَجَدَ، ودَرَی، وتَعَلَّمْ. دووەمیان:ئەوانەن کەبۆ گومان بەکاردێن،دانەریش هەشتیانی لیّ باس کرد: ظَنَّ ، خَالَ ، حَسِبَ ، زَعَمَ ، عَدَّ ، حَجَا ، جَعَلَ ، هَبْ.

نموونەی(رأی) وەکووتەی شاعر:

ش١١٧/رَأيتُ اللهَ أكبَرَ كُلِّ شيءٍ مُحَاوَلَةً ،وأكْثَرَهُمْ جُنُوداً.[4]

---

[1] کورتەی مانای ئەم سیّ دێڕەی ئەلفیە: ٢٠٦-منصوب بکە بەکردارەکانی دڵ(أفعال القلوب) هەردوو بەشەکەی ڕستەی ناوی(جملة اسمية)،مەبەستم لەوفعلانە هەریەك لە:رأی_زانیم_، خال_خەیالّ وگومانم برد، علمتُ_زانیم_، وجد_دڵنیام. ٢٠٧-هەروەها: ظنَّ وحسِبَ وزعم وعدَّ وحجا_هەرپێنجیان بەواتی گومان دێن_، هەروەها جعل کەبەواتای_زانیم ودڵنیام دیّت_. ٢٠٨-هەروەها هَبْ وتعلّمْ کە هەردووکیان بەمانای _بزانە_دیّت،وەئەوفعلانەش بۆ گۆڕین(التحويل) بەکاردێن بەوانیش منصوب بکە هەریەك لە مبتداوخبر.

[2] مەبەست لەکردارەکانی دڵ ئەوکردارانەن کە بەدڵ ئەنجام دەدرێن .

[3] واتا گۆڕینی ئەو ناوەی بەدوای فعلەکەدا دیّت لەحاڵێتیکەوە بۆحاڵێتیکی تر.

[4] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: زانیم خوای گەورە گەورەتری هەموو شتێکە لەهێزو دەسەڵاتدا،وەدڵنیام لەهەمووان سەربازی زیاترە. بەڵگەکەی:( رأیتُ اللهَ أکبَرَ..) لێرەدا فعلی(رأی)بەکارهاتووە بۆدڵنیابوون ودوومفعولی منصوب کردووە.

لێرەدا(رأی)ی بەكارهێناوە بۆ دڵنیابوون، وەبەكەمی بەكاردێ(رأی) بەمانای گومـان(ظـنَّ)،وەكوفـەرموودەی خـوای گـەورە﴿إِنَّهُـمْ يَرَوْنَـهُ بَعِيـداً﴾[١]، واتا:گومان دەبەن.

وەنموونەی(علم))) عَلِمْتُ زيداً اخاكَ))،وەكو ووتەی شاعر:

ش١١٨/ عَلِمْتُكَ البَاذِلَ المعروفَ فَانْبَعَثَتْ إِلَيْكَ بِي وَاجِفَاتُ الشَّوْقِ والأَمَلِ.[٢]

وەنموونـەی(وجـد)فـەرموودەی خـوای گـەورە﴿وَإِنْ وَجَـدْنَا أَكْثَـرَهُمْ لَفَاسِقِينَ﴾[٣]، وەنموونەی (دری) وەكو ووتەی:

---

[١] ئایەتی ژمارە(٦)ی سورەتی(المعارج)،پوختەی ماناكەی:{بەڕاستی ئەوبێباوەڕانە ئەوڕۆژە بەدوور دەبینن_واتا ڕۆژی دوای_.}إعرابەكەی: ﴿إنّ﴾ حرف توكيد ونصب ، و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل نصب اسمها، ﴿يرون﴾ فعل مضارع مرفوع لتجرده عن الناصب الجازم وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الأمثلة الخمسة ، وهو متصرف من رأى بمعنى ظنّ تنصب مفعولين ، و﴿الواو﴾ ضمير متصل مبني على السكون في محل رفع فاعل ، و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل نصب مفعول به اول ، و﴿بعيداً﴾ مفعول به ثان منصوب . .الشاهدفيها: (يرون) حيث جاء الفعل(رأى) بمعنى (ظنّ) فتعدى إلى مفعولين،والتقدير:إنهم يظنّونه بعيداً.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: دڵنیابووم كەتۆ بەخشندەوچاكەكاری ،بۆیە لەناخما جووڵاو ووروژا بۆلات پاڵنەری حەزوهیوابوون. بەڵگەكەی:(( عَلِمْتُكَ البَاذِلَ..))لێرەد فعلی (علم) بەكارهاتووە بۆدڵنیابوون ودوو مفعولی منصوب كردووە.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش:بێگومان تۆ بەوە ناسراوی كە كەسێكی بەوەفاو پەیمان پارێز بی ئەی عروە،كەواتە دڵخۆشبە وبێگومان دڵخۆش بوونیش بەمە كارێكی چاكە. . بەڵگەكەی:( دُرِيتَ الوَفِيَّ..)لێرەدا فعلی(دری) بۆدڵنیابوون بەكارهاتووەودوو مفعولی منصوب كردووە.

[٣] پێشتر لەشەرح وڕاڤەی دێڕی ژمارە(١٩٢)ی ئەلفیە،ئەم ڕستە قورئانیەمان ماناو إعراب كرد، وەلێرەدا بۆ ئەوە بەكارهاتووە كە فعلی(وجد) بەمانای دڵنیایی بەكارهاتووەودوومفعولی منصوب كردووە.

ش١١٩/دُرِيتَ الوَفِيَّ العهدَ ياعُرْوَ فَاغْتَبِطْ        فإنَّ اغْتِبَاطاً بِالوَفَاءِ حَمِيـدُ [١].

وەنموونەی((تَعَلَّمْ))_كەبەمانای بزانە بێت_وەكو ووتەی :

ش١٢٠/ تَعَلَّمْ شِفَاءَ النَّفْسِ قَهْرَ عَدُوِّهَا    فَبَالِغْ بِلُطْفٍ فِي التَّحَيُّلِ والْمَكْرِ. [٢]

ئەم نموونانە نموونەی ئەو فعلانە بوون كە بۆدڵنیابوون(اليقين) بەكاردێن.

وەنموونـەی ئـەو فعلانـەی بـۆ گومـان بـەكار دێن،ووتـەت:(( خِلْـتُ زيـداً أَخَاكَ))[٣] ، وەبەكەمی فعلی(خال) بەكاردێت بۆ دڵنیابوون، وەكو ووتەی:

ش١٢١/ دَعَانِي الغَوَانِي عَمَّهُنَّ وخِلْتُنِي    لِيَ اسْمٌ فَلاَ أُدْعَى بِهِ وَهْوَ أَوَّلُ. [٤]

وە وەكـو((ظَنَنْـتُ زيـداً صـاحِبَك))،وەبەكـەمی فعلـی(ظَـنّ) بـەكاردێت بـۆ دڵنیـابوون،وەكو فـەرموودەی خـوای گـەورە﴿وَظَنُّـوا أَنْ لاَمَلْجَـأَ مِـنَ اللهِ إِلاَّ إِلَيْـهِ﴾[٥]، وەوەكـو((حَسِبْتُ زيـداً صـاحِبَك))،وەهەنـدێ جـار فعلـی(حسـب) بۆدڵنیابوون بەكاردێت ،وەكو ووتەی:

---

[١] مانا و بەڵگەی ئەم دێڕە :- ناسراوی بەوەی خاوەن پەیمانی ئەی عوروە كەوابوو دڵخۆش بە ، بێگومان دڵخۆشی بە خاوەن پەیمان كارێكی چاكە. بەڵگەكەی :- لێرەدا فعلی (دری) بە مانای بزانە و دڵنیابە بەكارهاتووە و دوو مفعولی منصوب كردووە.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش: بزانە دڵنیابە كە خۆشحاڵی دەروون بە زاڵبوون دەبێت بەسەر دوژمناندا،بۆیە هەمیشە هەوڵدە بەووردی وبەزیتەڵی وزیرەكی بۆ گەشتن بەم كارە. بەڵگەكەی:(( تَعَلَّمْ شِفَاءَ النَّفْسِ قَهْرَ عَدُوِّهَا)) لێرەدا فعلی(تَعَلَّمْ) بەمانای بزانەودڵنیلبە هاتووەو دوو مفعولی منصوب كردووە.

[٣] واتا: وام گومان برد زيد براتە.

[٤] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: بانگیان كردم كچە جوانەكان بە مامە ،وەمن دڵنیام ناوێكی ترم هەیە كە پێی بانك نەكراوم وئەمە یەكەمجارە بەو ناوەوە بانگ كرێم. بەڵگەكەی:(( وخِلْتُنِي لِيَ اسْمٌ..))لێرەدا فعلی(خال) بەكارهاتووە بۆ دڵنیابوون ودوو مفعولی منصوب كردووە.

[٥] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێكە لەئایەتی ژمارە(١١٨)ی(التوبة)، پوختەی ماناكەی{ ئەوان زانیان ودڵنیابوون هیچ پەناگەیەك نیە لەسزای خوا مەگەر پەنای خۆی..}إعرابەكەی: ﴿الواو﴾ حرف عطف ﴿ظنوا﴾ فعل وفاعل ﴿ظن﴾ فعل ماض تنصب مفعولين مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهوره

ش١٢٢/حَسِبْتُ التُّقَى والْجُودَ خَيْرَ تِجَارَة     رَبَاحاً إذَا مَا الْمَــرْءُ أَصْبَحَ ثَـاقِلاَ.[١]

وەنموونەی((زعم))ووتەی:

ش١٢٣/ فَإِنْ تَزْعُمِينِي كُنْتُ أَجْهَلُ فِيكُمُ     فَإِنِّي شَرَيْتُ الحِلْمَ بَعْدَكِ بِالْجَهْلِ.[٢]

وەنموونەی فعلی((عدّ))وەکو ووتەی:

ش١٢٤/ فَلاَ تَعْدُدِ الْمَوْلَى شَرِيكَكَ فِي الغِنَى     وَلكِنَّمَا الْمَوْلَى شَرِيكُكَ فِي العُدْمِ.[٣]

وەنموونەی فعلی((حجا))وەکو ووتەی:

ش١٢٥/ قَدْ كُنْتُ أَحْجُو أَبَا عَمْرٍو أَخاً ثِقَةً     حَتَّى أَلَمَّتْ بِنَــا يَوْماً مُلِمَّـــاتُ.[٤]

---

اشتغال المحل بحركة المناسبة لأن الواو لايناسبها إلا ضم ما قبلها ، و﴿الواو﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ﴿أن﴾ مخففة من الثقيلة تنصب الاسم وترفع الخبر ، واسمها ضمير الشأن محذوف وجوباً ﴿لا﴾ نافية للجنس تنصب الاسم وترفع الخبر ﴿ملجأ﴾ اسمها مبني على الفتح في محل نصب ﴿من الله﴾ جار ومجرور متعلق بمحذوف خبر "لا" ، وأن وما دخلت عليه في تأويل مصدر سد مسد مفعولي ظن ، وجملة لا ملجأ في محل رفع خبر ان المخففة ﴿إلاّ﴾ اداة حصر ﴿إليه﴾ جار ومجرور ﴿إلى﴾ حرف جر ، و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل جر بإلى والجار والمجرور متعلق بما تعلق به خبر "لا" . الشاهدفيها:(ظَنُّوا) حيث ورد هنا بمعنى اليقين.

[١] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: زانیم ودڵنیام کە پارێزکاری وسەخاوەت باشتری بازرگانین لەڕووی خێروقازانجەوە ،وەمرۆڤ ئەمە دەزانێت کاتێك بمرێت. . بەڵگەکەی:( حَسِبْتُ التُّقَى والْجُودَ خَيْرَ تِجَارَةٍ)، لێرەدا فعلی(حسب) بەکارهاتووە بۆ دڵنیابوون ودوو مفعولی منصوب کردووە.

[٢] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش:ئەگەر تۆ پێشتر وات دەزانی من نەفام ونەزانم لەناوتاندا، ئەوە بزانە کە من دوای تۆ گۆڕاوم وبووم بەخاوەن عەقڵ وژیری بەڵگەکەی:(( تَزْعُمِينِي كُنْتُ أَجْهَلُ..)) لێرەدا فعلی زعم بەکارهاتووە بەمضارعی بۆ گومان ودوو مفعولی منصوب کردووە.

[٣] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: وا گومان مەبە دۆست وخۆشەویستت ئەو کەسەیە هاوبەشتە لە خۆشی ودەوڵەمەندیدا، بەڵکو دۆست وخۆشەویستت ئەو کەسەیە هاوبەشتە لە نەبوونیدا. بەڵگەکەی:(( فَلاَ تَعْدُدِ الْمَوْلَى شَرِيكَكَ)) لێرەدا شاعر فعلی(عدّ)ی بە مضارعی بەکارهێناوە بەمانای گومان ودوو مفعولی پێ منصوب کردووە.

[٤] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش: بەڕاستی من وا گومانم دەبرد کە باوکی عەمر برای تەنگانە وجێی متمانە بێت ،هەتاکاتێك تووشی بەڵاو ناڕەحەتی بووین . بەڵگەکەی-

هەروەها نموونەی فعلی((جعل))فەرموودەی خوای گەورە﴿وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثاً﴾[1]،جادانەر مەرجی دانا بۆ(جعل) بەوەی بەمانای بۆچوون (اعتقد)بێت ،بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێ لەو(جعل)ـەی بەمانای گۆڕین(صيّر) دێت

ئەویان لە کردارەکانی گۆڕین(التحويل)ـە،ولە کردارەکانی دڵ نیە.[2]

وەنموونەی فعلی((هَبْ))وەکو ووتەی:

ش١٢٦/ فَقُلْتُ أجِرْنِي أبا مَالِكٍ وَإِلاَّ فَهَبْنِي امْرأً هَالِكاً.[3]

---

-:((أَحْجُو أَبَا عَمْرٍو أَخاً..)) شاعر فعلی(حجا)ـی بە مضارعی بەکارهێناوە بەمانای گومان ودوو مفعولی پێ منصوب کردووە.

[1] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(١٩)ـی(الزخرف)، پوختەی ماناکەی{ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بەخشندەن بێ بڕوایان بە مێینەیان دادەنان}، إعرابەکەی: ﴿الواو﴾ حرف عطف ، و﴿جعلوا﴾ فعل وفاعل ﴿جعل﴾ فعل ماض مبني على فتح مقدر على آخره منع من ظهوره اشتغال المحل بحركة المناسبة لأن الواو لا يناسبها إلا ضم ما قبلها ، و﴿جعل﴾ من أخوات ظن تنصب مفعولين ﴿الواو﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ﴿الملائكة﴾ مفعولها الأول ﴿الذين﴾ اسم موصول في محل نصب نعت للملائكة ﴿هم﴾ ضمير منفصل في محل رفع مبتدأ ﴿عباد﴾ خبر مرفوع بالمبتدأ وهو مضاف و﴿الرحمن﴾ مضاف إليه مجرور وعلامة جره كسر النون تأدباً ﴿إناثاً﴾ مفعول ثان لجعل منصوب ، وجملة المبتدأوالخبر صلة الموصول والعائد هم . الشاهدفيها:( وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ... إِنَاثاً) حيث جاء فعل(جعل) بمعنى اعتقد وهي من أفعال القلوب الدالة على الرجحان، ونصب مفعولين أصلهما مبتدأ وخبر.

[2] فعلی (جعل) لەزمانی عەرەبیدا بۆشەش ماناومەبەست بەکار دێت، :{للظن والرجحان ،و لليقين ، وللتحويل ،وللشروع ،وبمعنى(اوجد)أو(خلق) ،وبمعنى(أعطى)}.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: جاووتم پەنام بە ئەی باوکی مالك ، ئەگەر نا ئەوە وادانە کە من تیا چووم . بەڵگەکەی:( فَهَبْنِي امْرأً)، لێرەدا فعلی(هب) بەکارهاتووە بۆ گومان ودوو مفعولی منصوب کردووە،یەکێکیان (ي)ـی جێناوی کەسی یەکەم(متكلم)ـە، ودووەمیان (امرأً).

جا دانەر ئاگادارى دا بەووتەى((أعنى رأى)) بۆ ئەوەى كە كردارەكانى دڵ هەندێكيان دوو مفعول منصوب دەكەن ئەوانيش بريتين لە(رأى)وئەوانەى تر كەدانەر باسيانى كرد،وەهەندێكى تر لە كردارەكانى دڵ دوو مفعوليان نيە ،هەندێكيان كردارى تێنەپەڕ(لازم)ـن وەكو((جَبُنَ زَيْدُ))[1]،وەهەندێكى تريان تێپەڕ(متعد)ـن بۆ يەك مفعول وەكو((كرِهْتُ زَيْداً)).

ئەمە هەموو ئەوشتانە بوون كە پەيوەنديان بەجۆرى يەكەم لەم بابەتەدا هەبوو كە بريتى بوو لە كردارەكانى دڵ.

بەلاّم كردارەكانى گۆڕين(أفعال التحويل)كە مەبەستى ووتەى دانەر((وَالّتى كَصَيَّرا _تاكۆتاى _))بوو،ئەمانيش پێويستيان بەدوو مفعول كە لەبنەڕەتدا مبتداوخبرن ، هەندێ لەزانايان پێيان وايە ئەم فعلانە حەوتن :١-((صَيَّرَ)) وەكو((صَيَّرتُ الطينَ خَزَفاً))[2]،٢-((جعل)) وەكوفەرموودەى خواى گەورە﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُوراً﴾[3]، ٣-((وهب))وەكو ووتەيان((وَهَبَنِي اللهُ فداءَكَ))،واتا وام لىٚ بكات.

---

[1] لەم ڕستەيەدا فعلى (جبن)_واتا ترسا_ لەو فعلانەيە بەدڵ ئەنجام دەدرێت وفعلێكى لازمەومفعول بە نيە.

[2] واتا: قوڕەكەم كرد بە سواڵە لەت_خشتى گلْ_.

[3] ئايەتى ژمارە(٢٣)ـى سورەتى(الفرقان)،كورتەى واتاكەى{هاتين هەر كردەوەيەكيان كردبوو،هەموويمان وەكو تۆزى پرش وبلاّو لێكرد}. إعرابەكەى: الفاء:حرف عطف ﴿جعلناه﴾فعل وفاعل ومفعول ﴿جعل﴾ فعل ماض من افعال التصيير تنصب مفعولين و﴿نا﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل نصب مفعول به اول ﴿هباءً﴾ مفعول به ثان منصوب ﴿منثوراً﴾ نعت لهباء، تبعه في نصبه .الشاهد فيها: (جَعَلْنَاهُ هَبَاءً) حيث جاء الفعل(جعل)من أفعال التحويل والتصيير،فتعدى إلى مفعولين.

٤-((تَخِذَ))وەكو فەرموودەی خوای گەورە﴿لَتَخِذْتَ عَلَيْهِ أَجْراً﴾[1] ،
٥-((اتَّخَذَ)) وەكو فەرموودەی خوای گەورە﴿ وَاتَّخَذَ اللهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾[2]،
٦-((تَرَكَ)) وەكو فەرموودەی خوای گەورە﴿ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ﴾[3]،وە وەكو ووتەی شاعر:

---

[1] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٧٧)ی(الكهف)، پوختەی ماناكەی{..كرێیەكت لەسەری وەردەگرت}، إعرابەكەی: ﴿اللام﴾ موطئة للقسم ﴿تخذت﴾ فعل وفاعل ﴿تخذ﴾ فعل ماض ينصب مفعولين ، و﴿التاء﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ﴿عليه﴾ جار ومجرور ﴿على﴾ حرف جر ، و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل جر بعلى متعلق بمحذوف في محل نصب مفعول به ثان ﴿اجرا﴾ مفعول به اول منصوب . الشاهد فيها: تخذ فعل من افعال التحويل التي تتعدى إلى مفعولين .

[2] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێكە لەئایەتی ژمارە(١٢٥)ی(النساء)، پوختەی ماناكەی{خوای گەورە ئیبراهمی هەڵبژارد بەدۆست وخۆشەویستی خۆی}،إعرابەكەی وبەڵگەكەی ڕوون وئاشكران.

[3] بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٩٩)ی(الكهف)، پوختەی ماناكەی{واز لەخەڵی دێنین لەوڕۆژەدا دێن ودەچن بەناو یەكتردا وەكو شەپۆلی دەریا}، إعرابەكەی: ﴿الواو﴾ استئنافية ﴿تركنا﴾ فعل وفاعل ﴿ترك﴾ فعل ماض من افعال التصيير تنصب مفعولين و﴿نا﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ﴿بعض﴾ مفعول به أول وهو مضاف ، و﴿الهاء﴾ ضمير متصل في محل جر بالإضافة ، و﴿الميم﴾ علامة الجمع ﴿يوم﴾ ظرف زمان منصوب على الظرفية ﴿يوم﴾ مضاف ، و﴿إذ﴾ مضاف إليه مبني على سكون مقدر منع من ظهوره تنوين العوض عن جملة محذوفة ، أي يومئذ خرجوا من وراء السد ﴿يموج﴾ فعل مضارع مرفوع ، وفاعله مستتر فيه جوازا تقديره هو ﴿في بعض﴾ جار ومجرور متعلق بيموج ، وجملة يموج في محل نصب مفعول ثان لترك . . الشاهد فيها:ترك فعل من أفعال التحويل التي تتعدى إلى مفعولين .

ش١٢٧/ وَرَبَّيْتُهُ حَتَّى إِذَا مَا تَرَكْتُـــهُ أخَا الْقَوْمِ وَاسْتَغْنَى عَنِ الْمَسْحِ شَارِبُهْ .[1]

٧-((ردّ))،وەكو ووتەی:

ش١٢٨/ رَمَى الْحِدْثَانُ نِسْوَةَ آلِ حَرْبٍ بِمِقْدَارٍ سَمَدْنَ لَهُ سُمُــــودا

فَــرَدَّ شُعُورَهُنّ السُّــــودَ بِيضاً . ورَدّ وُجُوهَهُنَّ البِيضَ سُــودا.[2]

* * *

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: من ئەوم بەخێو كرد تاوەكو كاتێك وازم لێ هێنا بوو بە برای خەڵكەكەو بێ نیاز وگەورە بوو وپێویستی بە كەس نەما . بەڵگەكەی(( تَرَكْتُـــهُ أخَا الْقَوْمِ)) فعلی (ترك) بەكارهاتووە بۆواتای گۆڕین(التحويل))ودوو مفعولی منصوب كردووە.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دوو دێڕە: بەڵاوناخۆشیەكانی ژیان وای كرد لەئافرەتانی خێڵی حەرب بەئەندازەیەك غەم وخەفەت بخۆن ، مووە ڕەشەكانیانی سپی كرد وڕووە سپیەكانیانی ڕەش كرد، بەڵگەكەی(( فَــرَدَّ شُعُورَهُنّ السُّــــودَ))و((ورَدّ وُجُوهَهُنَّ البِيضَ))، فعلی (رَدَّ) بەكارهاتووە بۆواتای گۆڕین(التحويل))ودوو مفعولی منصوب كردووە.

## *باسی هەڵوەشاندنەوەوهەڵواسینی
## (التعليق والالغاء) عەمەلی کردارەکانی دڵ

٢٠٩–وَخُصَّ بالتَّعْلِيقِ وَالإِلْغَــاءِ مَا مِنْ قَبْلِ هَبْ وَالأَمْرَ هَبْ قَدْ اُلْزِمَا
٢١٠–كَذَا تَعَلَّمْ ،وَلِغَيْرِ الْمَاضِ مِـن سِوَاهُمَا اجْعَلْ كُــلَّ مَا لَهُ زُكِـنْ.[1]

پێشتر باسکرا کە ئەم فعلانە دوو جۆرن:یەکەمیان کردارەکانی دڵ(أفعال القلوب)،ودووەمیان:کردارەکانی گۆڕین(أفعال التحويل). جا کردارەکانی دڵ دابەش دەبن بۆ دوو جۆر:بگۆڕ(متصرف)،ونەگۆڕ(غير المتصرف). بگۆڕەکان بریتین لە جگە لە فعلی(هَبْ،و تَعَلَّمْ)، ئەو فعلانە بەکاردێن بە ڕابردووی(الماضي)،وەکو((ظننتُ زيداً قائماً))،وەبە ڕانەبردووی (المضارع)،وەکو((أظنُّ زيداًقائماً))،وەبەداخوازی (الأمر)،وەکو((ظُنَّ زيداً قائمًا))،وەبەاسمی فاعل وەکو((أنا ظَانٌّ زيداً قائماً))،وەبەاسمی مفعولی،وەکو((زيدٌ مَظْنُونٌ أبُوهُ قائماً))لێرەدا أبوهُ:مفعولی یەکەمە،ومرفوعە چونکە لەجێی نائب فاعلە،و((قائماً))مفعولی دووەمە، هەروەها بەکاردێت وەکو چاووگ(المصدر))،وەکو((عجبتُ من ظنّك زيداً قائماً))_جا هەموو ئەوحوکم ویاساوبڕیارانەی بۆ ماضییەکەی هەیە بۆ ئەمانی تریش هەیە.
ئەوانەش کەنەگۆڕن دووانن کەبریتین لە: هَبْ،و تَعَلَّمْ کە بەمانای بزانە(اعلم)دێت،

---

[1] کورتەی مانای ئەم دوودێرەی ئەلفیە:٢٠٩– تایبەت بکە بە هەڵواسین_واتا لەکارخستنی عەمەلی ئەم فعلانە تەنها لەڕووی لفظەوە_وهەڵوەشاندنەوە_واتا لەکارخستنی ئەم فعلانە لەڕووی لفظ ومحلەوە_ئەو فعلانەی باسکران _لەدێڕی ٢٠٦و٢٠٧_لەپێش فعلی(هب)، فعلی(هب)هەمیشە بە شێوەی ئەمر بەکاردێت، ٢١٠– هەروەها فعلی(تعلّم)یش بەشێوەی ئەمر بەکاردێت، جابۆ جگە لە ماضي فعلەکانی تر بڕیار بدە هەمووئەو حوکم ویاسایانەی بۆ ماضي هەبوون.

ئەم دووانە تەنها بەشێوەی ئەمر بەکاردێن،وەکو ووتەی:

تَعَلَّمْ شِفَاءَ النَّفْسِ قَهْرَ عَدُوِّهَا فَبَالِغْ بِلُطْفٍ فِي التَّحَيُّلِ والْمَكْرِ.[١]

هەروەها وەکو ووتەی:

فَقُلْتُ ا جِرْنِي أبا مَالِكٍ وَإِلاَّ فَهَبْنِي امْرأً هَالِكاً.[٢]

جائەوکردارانەی بگۆڕن وبەدڵ ئەنجام دەدرێن،تایبەت دەکرێن بە هەڵواسین (التعلیق)وهەڵوەشاندنەوە(الالغاء)[٣]،جا هەڵواسین بریتیە لە:لەکارخستنی فعلەکە لەلفظدا وکارکردنی لەڕووی ماناوە لەبەر ڕێگرێك[٤]،وەکو((ظننتُ لزیدٌ قائمٌ))لێرەدا ڕستەی(لزیدٌ قائمٌ) فعلی(ظنّ) عەمەلی تێدا نەکردووە بەلفظ،لەبەر ڕێگرێك کە بریتیە لە(لام)،بەلاّم ڕستەکە لەمحلی نصبدا یە[٥]،بەبەڵگەی ئەوەی ئەگەر ڕستەی بۆ عطف کەیتەوە بەمنصوبی عطفي دەکەیت،وەکو((ظننْتُ لزیدٌ قائمٌ وعمراً منطلقاً))،کەواتا فعلی(ظَنَّ)عەمەلی کردووە لەڕستەی(لزیدٌ قائمٌ)لەماناذا بەلاّم لەلفظدا عەمەلی نەکردووە.

هەڵوەشاندنەوە(الالغاء)ش بریتیە لە:لەکارخستنی فعلەکە لەڕووی ماناولفظەوە،بەبێ بوونی ڕێگر،وەکو((زیدٌ ظننتُ قائمٌ))،لێرەدا فعلی(ظننتُ) عەمەلی نەکردووە نەلەماناداونەلە لفظدا.

---

[١] پێشتر ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەمان ڕوون کردەوە.

[٢] پێشتر ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەشمان ڕوون کردەوە.

[٣] مەبەست لەهەڵواسین وهەڵوەشاندنەوەی عەمەلی ئم فعلانەیە.

[٤] ئەو ووشانەی دەبنە ڕێگرولەکارخستنی ئەم فعلانە بریتین لە:{لام الابتداء ،لام القسم ،(ما)النافیة ،(لا)و(إنْ) النافیتان الوقعتان في جواب القسم ،الاستفهام }.

[٥] واتا:ڕستەی(لزیدٌ قائمٌ) بۆخۆیان مبتداوخبرن،بەلاّم لەمحلی نصبدا جێی دوو مفعولەکەی(ظنّ)دەگرن.

هەروەها مچارعی ئەم فعلانەش هەمان شێوەی ماضین لەڕووی هەڵواسین وحوکم وبڕیارەکانی تریش،وەکو((أظنُّ لزیدٌ قائمٌ))[1]،وە((زیدٌ أظنُّ قائمٌ))[2]،هەروەها سەرجەم فعلەکانی تری هاوشێوەی(ظنّ).

بەڵام ئەو فعلانەی نەگۆڕ(غیر المتصرفه)ن ئەوە نە هەڵواسین وەنەهەڵوەشاندنەوە تیایاندا ناکرێت،هەروەها کردارەکانی گۆڕین(التحویل)یش هەڵواسین و هەڵوەشاندنەوەیان تێدا ناکرێت،وەکوفعلی((صیّر))وهاوشێوەکانی.

* * *

*هەڵوەشاندنوە(الالغاز)دروست(جائز)ەوهەڵواسین(التعلیق)پێویست(واجب)ە

٢١١-وَجَوِّزِ الإلْغَاءَ لا فِي الابْتِدَا وَانْوِ ضَمِيرَ الشَّأْنِ أَوْ لاَمَ ابْتِدَا

٢١٢-فِي مُوهِمٍ إلْغَاءَ مَا تَقَدَّمَا وَالْتَزِمِ التَّعْلِيقَ قَبْلَ نَفْيِ مَا

٢١٣-وَإِنْ وَلاَ لاَمُ ابْتِداءٍ أَوْ قَسَمْ كَذَا وَالاسْتِفْهَامُ ذَا لَهُ انْحَتَمْ.[3]

دروستە هەڵوەشاندنەوەی ئەم فعلە گۆڕاوانە ئەگەر لەسەرەتاوە نەبن ،وەکو ئەوەی لەناوەڕستەوەبن[4]،وەکو((زیدٌ ظَنَنْتُ قائمٌ))،یان بکەوێتە

---

[1] ئەمە نموونەیە بۆ هەڵواسینی فعلی(ظنّ) بە مضارعی.

[2] ئەمەش نموونەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەی فعلی(ظنّ) بە مضارعی.

[3] پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە:٢١١-بەدروست وڕەوا بزانە هەڵوەشاندنەوە بەڵام لەسەرەتاوەنا_واتا فعلەکە لەسەرەتاوە نەبێت لەناوەڕاستەوە یان لەکۆتاییەوە بێت_،جا ئەگەر هاتوو فعلەکە لەسەرەتاوە بوو وەلەکاخرابوو ئەوە دەبێت تأویلی کەیت بەوەی جێناویکی نادیاری بۆ دانەی یان لامی ابتدا. ٢١٢-بۆ ئەوحاڵەتەی وامەستکرێت هەڵوەشاندنەوەی تێداکرابێت لەسەرەتاوە، هەروەها هەڵواسین پێویستە ئەگەر فعلەکە بکەوێتە پێش(ما)ی نافیە.٢١٣-هەروەها ئەگەر بکەوێتە پێش(إن)ی نافیە ،و(لام)ی ابتدا،وسوێندخواردن(القسم)، هەروەهاپرسیارکردن(الاستفهام)، ئەمانە هەموویان پێویستن.

[4] واتا فعلەکە بکەوێتە نێوان مفعولی یەکەم ومفعولی دووەم کە لە بنەڕەتدا مبتداوخبرن.

كۆتاييەوە،وەكو(زيدٌ قائمٌ ظَنَنْتُ))، جا كاتێك دەكەوێتە ناوەڕاستەوە ÷ئەوە هەندێ فەرموويانە:كاركردن ولەكارخستنی(الاعمال والالغاء)وەكو يەك وان،وەهەندێكی تر فەرموويانە:كاركردنی چاكترە لەكارخستنی، وەئەگەر فعلەكە كەوتە كۆتاييەوە ئەوە لەكارخستنی چاكترە لە كاركردنی، بەڵام ئەگەر فعلەكە كەوتە پێشەوە ئەوە هەڵوەشاندنەوە دروست نيە لای بەصرێكان،كەواتە دروست نيە بڵێيت((ظَنَنْتُ زيدٌ قائمٌ))بەڵكو پێويستە فعلەكە لەم حاڵەتەدا عەمەل بكات،ودەڵێيت((ظَنَنْتُ زيداً قائماً))، جا ئەگەر لەزمانی عەرەبيدا نموونەيەك هات ووای لێدەفامرايەوە كە فعلەكە لەكارخرابوو لەكاتێكدا لە سەرەتاوەبوو ئەوە دەبێ ئەو نموونەيە تأويل بكرێت بەوەی كە جێناوێكی ناديار هەيە[1]، وەكو ووتەی:

ش١٢٩/ أَرْجُو وآمُلُ أَنْ تَدْنُو مَوَدَّتُهَا وَمَا إِخَالُ لَدَيْنَا مِنْكِ تَنْوِيلُ.[2]

جا ڕاڤەوتقديری ڕستەكە((وَمَا إِخَالُهُ لَدَيْنَا مِنْكِ تَنْوِيلُ)) جێناوی(ها) دەبێتە مفعولی يەكەم وڕستەی(لَدَيْنَا مِنْكِ تَنْوِيلُ) لە محلی نصبدا دەبێتە مفعولی دووەم،كەواتا هيچ هەڵوەشاندنەوەی تێدا نەكراوە، يان

[1] ئەو جێناوە ناديارە دەكرێتە مفعولی يەكەم وڕستەكەی دوای فعلەكەش لە محلی نصبدا دەبێتە مفعولی دووەم.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێرە كە بەشێكە لە هۆنراوەی كعبی كوڕی زوهەير كە لەمدح وسەنای پێغەمبەردا_ صلى الله عليه وسلم_ هۆندوێتێوە: هيواوئومێدم وايە كە خۆشەويستی ئەو_واتاپێغەمبەر_بۆ من نزيك بێت، گومانيش نابەم پێمان نەبەخشی. بەڵگەكەی((وَمَا إِخَالُ لَدَيْنَا مِنْكِ تَنْوِيلُ))لێرەدا وا دەردەكەوێ كە فعلی(إخالُ) كە مضارعی(خال)يە لەكارخراوە لە كاتێكدا لەسەرەتاوە هاتووە،بەلأم وانيە بەڵكو ڕستەكەی دوای خۆی كەبريتيە(لَدَيْنَا مِنْكِ تَنْوِيلُ) دەبێتە مفعولی دووەم ومفعولی يەكەميش بريتيە لە جێناوێك ناديار.

دەتوانین تاویل بکرێت بەوەی (لام)ـی ابتدا لەسەر مفعولی فعلەکەیە،وەکو ووتەی:

ش١٣٠/ كَذَاكَ أُدِّبْتُ حتَّى صَارمِنْ خُلُقِي      أَنِّي وَجَدْتُ مِلاَكُ الشِّيمَةِ الأَدَبُ.[1]

جا ڕاڤەوتقدیری ڕستەکە(أَنِّي وَجَدْتُ لَمِلاَكُ الشِّيمَةِ الأَدَبُ)،هەروەها ئەم نموونەیە بۆ هەڵواسین(التعليق)ـە وبۆ هەڵوەشاندنەوە نیە.

بەڵام بەبۆچوونی کوفێکان_وپێشەوا ئەبو بەکری زوبەیدی[2] وغەیری ئەویش_پێیان وای دروستە هەڵوەشاندنەوە ڕوو بدات کاتێك فعلەکەش لە سەرەتاوە بێت،ئەو کات پێویست بە ڕاڤەوتأویل کردنی ئەو دوو دێڕە ناکات[3].

هەروەها دانەر فەرمووی(وَجَوِّزِ الإِلْغَاءَ)بۆ ئەوەی بزانرێت کە هەڵوەشاندنەوە پێویست(لازم)نیەودروستە،کەوات دەتوانیت فعلەکە لەکاربخەیت ودەشتوانی لەکارینەخەی وعەمەلی پێ بکەی،ئەمەش بەپێچەوانەی هەڵواسین کەپێویستە،بۆیە دانەر فەرمووی(وَالْتَزِمِ التَّعْلِيقَ).

کەواتا پێویستە هەڵواسین هەرکاتێك(ما)ـی نافیە کەوتە دوای فعلەکەوە،وەکو((ظننْتُ ما زيدٌ قائمٌ))،یان کاتێك(إن)ـی نافیەی بەدوادا هات

---

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: ئا بەو شێوە ئەدەب دراوم تاوەکو ئەدەب وئاکار جوانی بووە بە ڕەوشتم،بێگومان من وادەزانم بنەماوبناغەی هەموو شتێك بریتیە لە ئەدەب وئاکارجوانی. بەڵگەکەی:( وَجَدْتُ مِلاَكُ الشِّيمَةِ الأَدَبُ) لێرەدا وا دەردەکەوێ کە فعلی(وَجَدَ) لەکارخراوە لە کاتێکدا لەسەرەتاوە هاتووە،بەڵام وانیە بەڵکو ڕستەکەی دوای خۆی کەبریتیە(مِلاَكُ الشِّيمَةِ الأَدَبُ) دەبێتە مفعولی دووەم ومفعولی یەکەمیش بریتیە لە جێناوێك نادیار.

[2] یەکێکە لەپێشەوایانی زانستەکانی زمانی عەرەبی وشعروئەدەب ،ناوی تەواوی محمدی کوڕی حسنی کوڕی عُبیدالله)یە ولەوولاتی ئەندەلس لەدایك بووەوخاوەنی چەند کتێبێکە لەزانستەکانی زمان وئەدەب، ساڵی ٣٧٩ك /٩٨٩ز کۆچی دوای کردووە.

[3] واتا شاهدی ژمارە:١٢٩و١٣٠.

وەكو((عَلِمتُ إنْ زيدٌ قائمٌ))،وەنموونەیان بۆ هێناوەتەوە بە فەرموودەی خوای گەورە﴿وَتَظُنُّونَ إنْ لَبِثْتُمْ إلاَّ قَلِيلاً﴾[1]،هەندێ لەزانایان فەرموویانە ئەم نموونەیە بەهیچ شێوەیەك هەڵواسینی تێدا نیە ،لەبەر ئەوەی مەرجی هەڵواسین ئەوەیە هەرکاتێك هۆکاری هەڵواسینەکەت حذف کرد فعلە عەمەلی خۆی بکاتەوەودوو مفعول منصوب بکات،وەکو((ظننتُ ما زیدٌ قائمٌ)) ئەگەرلەم نموونەیە (ما)حذف کەیت دەڵێیت((ظننتُ زیداً قائماً))،بەڵام لەم ئایەتەدا وانیە،چونکە ئەگەر هۆکاری هەڵواسینەکە_کەبریتیە لە إن_حذف کەیت ئەوە فعلی(تظنون) ناتوانێت عەمەل بکات لە(لبثتم)،چونکە ناوترێت(وتظنون لبثتم)،خاوەنی ئەم بۆچوونە وای ووتووە،بەڵام پێدەچێت بۆچوونەکەی پێچەوانەی شتێك بێت کە وەکو یەکدەنگی زانایانی لەسەر بێت_ئەویش ئەوەیە بۆهەڵواسین ئەو مەرجەی باسیان کرد[2] وا نیەوپێویست نیە بۆی_،هەروەها نموونە هێنانەوەی نحوزانان بە ئایەتە پیرۆزەکەوهاووێنەی بەڵگەن بۆ ئەمە.

هەروەها فعلەکە هەڵدەواسرێت ئەگەر لەدوایەوە(لا)ی نافیە بێت،وەکو((ظَنَنْتُ لا زيدٌ قائمٌ ولا عمرٌو))، یان لەدوایەوە(لام)ی ابتدا

---

[1] ئەم ڕستەیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٥٢)ی سورەتی (الاسراء)،کورتەی ماناکەی{وە وادەزانن وگومان دەبەن کە نەماونەتەوە لەدونیادا ماوەیەکی کەم نەبێت}، إعرابەکەی: تظنون/ فعل وفاعل. إن/ حرف نفي بمعنى ما .لبثتم/ فعل وفاعل. إلاّ/ اداة حصر. قليلاً/ نعت لمفعول مطلق محذوف والتقدير:لبثنا قليلا .وجملة(إنْ لَبِثْتُمْ إلاَّ قَلِيلاً) سدّت مسدّ مفعولي تظنون.الشاهد فيها:الفعل (تظنون)علّق عن العمل لفظاً لا محلاً لاعتراض (إنْ) التي لهاصدر الكلام بينه وبين معموليه.

[2] ئەو مەرجەی کە بیتی بووە: هەرکاتێك هۆکاری هەڵواسینەکەت حذف کرد فعلە عەمەلی خۆی بکاتەوەودوو مفعول منصوب بکات.

بێت،وەكو((ظننتُ لزيدٌ قائمٌ ))،يان لەدوايەوە(لام)ی سوێند خواردن(القسم)بێت،وەكو((عَلِمْتُ لَيقومَنَّ زيدٌ))وەهيچ كام لە نحوزانان لامی سوێندخواردنيان بە هۆكاری هەڵواسين هەژمارنەكردووە[1] ،

يان ئەگەر پرسياركردن(الاستفهام)لەدوای فعلەكەوە هات،پرسياركردنيش سێ جۆرە:يەكەميان:ئەوەيە يەكێ لەدوومفعولەكە ناوی پرسياركردن بێ،وەكو((علمتُ أيُّهم ابوك))،دووەم: ئەوەيە يەكێ لەدوو مفعولەكە[1] إضافەكرابێ بۆ لای ناوی پرسياركردن،وەكو((علمتُ غلامُ أيِّهم ابوك))، سێيەم:ئەوەيە يەكێك لەدوو مفعولەكە حەرفی پرسياركردنی لەسەربێت،وەكو((علمتُ أزيدٌ عندك أم عمرٌو ؟))وە وەكو((علمتُ هَلْ زيدٌ قائمٌ أم عمرٌو ؟)).

* * *

---

[1] بەڵام هەريەك لە ابن مالك وابن هشام وهەندێ لوزانايانی تر لامی سوێنديان بە هۆكاری هەڵواسين داناوە،بەڵام ابن عقيل خۆی وزۆرێك لە زانايانی پێيان وانيە.

[2] واتا:ئەو دوو مفعولەی لەبنەڕەتدا مبتداوخبرن وفعلەكەش لەسەريان لەكارخراوە.

***چ كاتێك فعلى( علم )و( ظَنّ ) يەك مفعوليان دەبىٚ؟**

٢١٤ –لِعْلِمٍ عِرْفَانٍ وَظَنٍّ تُهَمَهْ          تَعْــدِيَةٌ لِوَاحِــدٍ مُلْتَزَمَهْ.[١]

هەركاتىٚ فعلى((علم)) بەماناى ناسى وزانين(عرف)بىٚ ئەوە تێپەڕ دەكات بۆ يەك مفعول،وەكو ووتەت((علمتُ زيداً))واتا:ناسيم،وە وەكوفەرموودەى خواى گەورە﴿وَاللهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئاً﴾[٢]، هەروەها فعلى((ظَنَّ))ئەگەر بەماناى تۆمەتبارى كرد بىٚ ئەوە يەك مفعولى هەيە،وەكو ووتەت((ظننت زيداً))واتا:تۆمەتبارم كرد،وە وەكوفەرموودەى خواى گەورە﴿وَمَا هُوَ عَلَى الْغَيْبِ بِظَنِينٍ﴾[٣]،واتا:تۆمەتبارنيە.

---

[١] پوختەى ماناى ئەم دێڕەى ئەلفيە: فعلى(علم) ئەگەر بەماناى ناسى(عرف) بىٚ ، وفعلى(ظنّ) بەماناى تۆمەتبارى كرد(اتّهم) بىٚ ئەوە تێپەڕ دەكەن بۆ يەك مفعول،واتا پێويستيان بە دوو مفعول نيە.

[٢] بەشێكە لە ئايەتى ژمارە(٧٨)ى سورەتى(النحل)،پوختەى ماناكەى{خواى گەورە ئێوەى لەسكى دايكتان دەرهێناوە كە هيچتان نەدەزانى}، إعرابەكەى: ﴿الواو﴾ استئنافية ﴿الله﴾ مبتدا مرفوع ﴿أخرج﴾ فعل ماض فاعله مستتر فيه جوازاً تقديره هو ، و﴿الكاف﴾ ضمير متصل في محل نصب مفعول به ، و﴿الميم﴾ علامة الجمع ، وجملة الفعل والفاعل في محل رفع خبر المبتدا ﴿من بطون﴾ جار ومجرور متعلق بأخرج ﴿بطون﴾ مضاف ، و﴿امهات﴾ مضاف إليه مجرور ﴿امهات﴾ مضاف ، و﴿الكاف﴾ ضمير متصل في محل جر بالإضافة ، و﴿الميم﴾ علامة الجمع ﴿لا﴾ نافية ﴿تعلمون﴾ فعل مضارع مرفوع بثبات النون ، و﴿الواو﴾ضميرمتصل في محل رفع فاعل ﴿شيئاً﴾مفعول به منصوب . الشاهد فيها:(تعلمون) هنا تعدّى إلى مفعولٍ واحد،لأنه بمعنى عرف.

[٣] ئايەتى ژمارە(٢٤)ى سورەتى(التكوير)،كورتەى ماناكەى{ئەو_واتاپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم_لەگەياندنى سروشت(الوحى)تۆمەتبار نيە}وەئەگەر بە(بضنين) بخوێنرێتەوە ئەوە ماناكەى:لەگەياندنى سروشتدا ڕژدوچروك نيە.

***چ کاتێك فعلی( رأی ) دوومفعول دەخوازێ؟**

**٢١٥-وَلِرَأَى الرُّؤْيَـــا انْمِ مَا لِعَلِمَا طَالِبَ مَفْعُولَيْنِ مِنْ قَبْلُ انْتَمَى.**[1]

هەرکاتێ فعلی(رأی) بۆ خەوبینین بەکارهات ئەوە تێپەڕ دەکات بۆ دوو مفعول،وەکو چۆن فعلی(علم)کە پێشتر باسکرا تێپەڕدەکات بۆ دوومفعول،بۆئەمەش ئامـاژەی کرددانـەر بەووتـەی((وَلِـرَأَى الرُّؤْيَـــا انْمِ))واتا:دانە بۆفعلی(رأی)کە چاووگ(مصدر)ەکەی بریتیە لەخەوبینین ئەوەی هەیە بۆ فعلی(علم)کەدوومفعولی هەیە،جا دانەر بۆ(رأی)کە بەمانای خەوبینین بێ فەرمووی ئەو(رأی)یەی چاووگەکەی(الرؤيا)یە، لەبەرئەوەی(الرؤيا)هەرچەندە بۆ شتی تریش بەکاردێت بەڵام واباووزۆرە کەچاووگ بێ خەوبینین، جانموونەی(رأی)کە بەمانای خەوبینین بێت ودوومفعولی هەبێ فەرموودەی خوای گەورە﴿إِنِّي أَرَانِي أَعْصِرُ خَمْراً﴾[2]،لێرەدا جێناوی(یا)مفعولی یەکەمەو،ڕستەی(أَعْصِرُ خَمْراً)لەمحلی نصبدا مفعولی دووەمە، هەروەها وەکو ووتەی:

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: فعلی(رأی) ئەگەر بەمانا بینینی خەوبێت ،ئەوە بڕیاری فعلی(علم)ەی بۆ بدە کە پێشتر باسکرا ،کە بریتی بوو لەداخوازی کردنی دوو مفعول.

[2] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لەئایەتی ژمارە(٣٦)ی سورەتی(یوسف)،کورتەی ماناکەی{بەڕاستی لەخەومدا خۆمم دی ترێم دەگوشی کە دەبێ بەعەرەق}، إعرابەکەی: ﴿إنّ﴾ حرف توكيد ونصب و﴿الياء﴾ ضمير متصل في محل نصب اسمها ﴿ارى﴾ فعل مضارع تنصب مفعولين ، و﴿النون﴾ للوقاية ، و﴿الياء﴾ ضمير متصل في محل نصب مفعول به اول والفاعل ضمير مستتر وجوباً تقديره انا ﴿اعصر﴾ فعل مضارع مرفوع وفاعله مستتر فيه وجوباً تقديره "انا" ﴿خمراً﴾ مفعول به منصوب ، وجملة لراني في محل رفع خبر إن وجملة "اعصرخمراً" في محل نصب مفعول ثان لأرى . الشاهد فيها :( أَرَانِي) هنا حُلميه متعديه إلى مفعولين.

ش١٣١/ أَبُو حَنَشٍ يُؤَرِّقُنِي ،وطَلْقٌ وَعَمَّـــــارٌ ،وآونَــــــةً أثالاَ
أَرَاهُمْ رُفْقَتِي حَتَّى إِذَا مَـا تَجَافَى اللَّيلُ وَانْخَزَلَ انْخِزَالا
إِذَا أَنَا كَالَّذِي يَجْرِي لِـوِرْدٍ إِلَى آلٍ فَلَـمْ يُـدْرِكْ بِلاَ لا .[(١)]

لێرەدا جێناوی(هُم)لەڕستەی(أَرَاهُمْ)مفعولی یەکەمەو،و(رُفْقَتِي)مفعولی دووەمە.

* * *

## *باسی حذف کردنی مفعول

٢١٦-وَلاَ تُجِزْ هُنَـا بِلاَ دَلِيل سُقُوطَ مَفْعُولَيْـنِ أَوْ مَفْعُولِ.[(٢)]

لەم بابەتەدا دروست نیە لابردن وحذف کردنی دوو مفعولەکە،یان یەکێکیان، مەگەر بەڵگە هەبێ لەسەر ئەو حذف کردنە. جا نموونەی حذف کردنی هەردوو مفعولەکە بە بوونی بەڵگە بوترێ((هَلْ ظننْتَ زيداً قائماً ؟)) تۆش لەوەڵامدا بڵێیت((ظننْتُ))تقدیری وڕاڤەکەی((ظننْتُ زيداً قائماً)) لێرەدا دوو مفعولەکەت حذف کردوە چونکە بەڵگە هەیە لەسەری، وە وەکو ووتەی:

ش١٣٢/ بِأَيِّ كِتَابٍ أَمْ بِأَيَّــــةِ سُنَّةٍ تَرَى حُبَّهُمْ عاراً عَلَيَّ وَتَحْسَبُ.[(٣)]

---

[(١)] مانای ئەم دێڕانە: هەریەك لە{أبو حنش وطلق وعمّاروأُثال}کەناوی چوار پیاوی برادەری شاعرن،ماوەیەك خەوم دەزڕینن، من لەخەودا ئەوان دەبینم دۆست ورەفیقمن،هەتا کاتێك شەو دەڕوات وڕۆژ دەردەچێ، کتوپڕ من وەکو ئەو کەسە وام کە تینووەو دەچێ بۆ تەڕاویلکە(السراب)وتەڕایی دەست ناکەوێ،مەبەستی ئەوەیە برادەرەکانی تەنها لەخەودا دەبینێ. بەڵگەکەی:( أَرَاهُمْ رُفْقَتِي)لێرەدا فعلی رای بەمانای خەوبینین دێ ودوو مفعولی منصوب کردووە.

[(٢)] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: بەدروست وڕەوا مەزانە لێرەدا_واتا لەبابەتی ظنّ واخواتها_ بەبێ بەڵگە، لابردن وحذف کردنی دوو مفعولەکە یان یەك مفعولیان.

[(٣)] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: جا بەکام پەیام وبەکام سوننەت،پێت وایە خۆشەویستیم بۆیان ئەنگییەو واگومان دەبەی. بەڵگەکەی: لێرەدا فعلی(تَحْسَبُ) دوو مفعولەکەی حذف کراوە چونکە پێشتر ئاماژەی پێکراوە.

واتا ((وَتَحْسَبُ حُبَّهُمْ عاراً عَلَيَّ))ودوو مفعولەکەی حذف کراوە_کە بریتین لە(حُبَّهُمْ)و(عاراً عَلَيَّ)_ چونکە پێشتر باسکراوە.

وەنموونەی حذف کردنی یەك لە مفعولەکان بە بەڵگەوە ئەوەیە بوترێ((هل ظننتَ احداً قائماً ؟))وبڵێیت((ظننتُ زیداً))واتا: ظننتُ زیداً قائماً،ومفعولێکیانت حذف کردووە چونکە بەڵگەی هەیە،وە وەکو ووتەی :

١٣٣- ولَقَدْ نَزَلْتِ _فَلاَ تَظُنِّى غَيْرَه_ مِنِّى بِمَنْزِلَةِ الْمُحِبِّ الْمُكْرَمِ.[1]

واتا ((فَلاَ تَظُنِّى غَيْرَه واقعاً))لێرەدا(غيرَهُ)مفعولی یەکەمەو،(واقعاً) مفعولی دووەمە.جا ئەمەی دانەر باسی کرد بۆچوونی ڕاست ودروستە لە ڕای زۆربەی نحو زانان.

وەئەگەر بەڵگە نەبوو لەسەر حذف کردنەکە ئەوە دروست نیە هەردووکیان یان یەکێکیان حذف کرێت،کەوابوو دروست نیە بڵێیت((ظننتُ))،هەروەها((ظننتُ زیداً))ومەبەستت ئەوە بێت بڵێ((ظننتُ زیداً قائماً)).

* * *

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێرەش: بێگومان تۆ لە دڵمدا خۆشەویست وبەڕێزی ، جگە لەمە گومانی تر نەبەی و وابزانی خۆشەویست نیت. بەڵگەکەی: لێرەدا فعلی(تظنُّ) مفعولێکی حذف کراوە چونکە پێشتر ئاماژەی پێکراوە.

## *بەکارهێنانی فعلی( تقولُ )وەکو( تظنُّ)

٢١٧_ وَكَتَظُنُّ اجْعَــــلْ تَقُولُ إنْ وَلِي مُسْتَفْهَماً بِـــهِ وَلَمْ يَنْفَصِـــــلِ

٢١٨- بِغَيْرِ ظرفٍ أَوْ كَظرفٍ أَوْ عَمَلْ وَإِنْ بِبَعْضِ ذِي فَصَلْتَ يُحْتَمَلْ.[١]

ووشەی(قول)وپێکهاتەکانی حاڵیان وایە ئەگەر لەدوایانەوە ڕستەیەك هات ئەو ڕستەیە بگێڕدرێتەوە[٢]،وەکو((قال زیدٌ عمرٌو منطلقٌ))[٣]،وە((تقولُ زیدٌ منطلقٌ))،بەڵام ڕستەکەی دوای(قول) لە محلی نصبدا دەبێتە مفعول به.

هەروەها دروستە بەکارهێنانی(قول) وەکو فعلی(ظنّ)،ئەوکات ڕستەکەی دوای دەبنە دوومفعول بۆی ومنصوبیان دەکات وەك چۆن(تظنّ)منصوبیان دەکات.

جائەوەی باوە دەربارەی ئەمە[٤]،ئەوەیە لەناوعەرەبدا دوو بۆچوون هەیە:یەکێکیان_کە بۆچوونی زۆرینەی عەرەبە_بەکارنایات(قول)وەکو(ظنّ)،مەگەر بەچەند مەرجێك کە دانەر چواریانی باسکرد،کە زۆرینەی نحوزانان باسیان کردووە،یەکەم: دەبێت فعلەکە مضارع بێت ،دووەم: بۆکەسی دووەم(المخاطب)بێت،بۆ ئەم دوو مەرجەش ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی(اجْعَــــلْ تَقُولُ)چونکە فعلی(تقول)مضارعەو،بۆکەسی دووەمە.

---

[١] پوختەی مانای ئەم دوو دێرەی ئەلفیە:٢١٧- وەکوفعلی(تظنّ) بەکاربێنە فعلی(تقول)، بەچوار مەرج:١-دەبێت مضارع بێت. ٢- فعلەکە بۆ کەسی دووەم(المخاطب)بێت.٣- لەدوای پرسیارکردن(الاستفهام)ـەوە بێت. ٤-بەین(فاصل)نەکەوتبێتە نێوان فعلەکەواستفهامەکە. ٢١٨-مەگەر ئەو بەین(فاصل)ـە،ظرف بێت ،یان شتێك بێت وەکو ظرف وابێت واتاجارومجرور، یان معمولی فعلێك بێت،هەر کاتێ یەکێ لەمانە کەوتە نێوان فعلەکەواستفهامەکە ئەوە دروستە.

[٢] مەبەست لەگێڕانەوەی ڕستە(حکایة الجمل)لەزمانی عەرەبیدا ئەوەیە ئەو ڕستەیە وەکو چۆن هاتووە بگێڕدرێتەوە بەبێ گۆڕینی حاڵەتی إعرابی ،وەهەموو کاتێك ڕستەکە مبنیە بەپێی شوێن(محل)ـەکە.

[٣] إعرابی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیە:قالَ/ فعل ماضٍ مبين على الفتح. زيدٌ/فاعل مرفوع. (عمروٌ منطلقٌ)جملة محكية مبني في محل نصب مفعول به.

[٤] واتا دەربارەی بەکارهێنانی (قول)وەکو(ظنّ).

سێیەم:دەبێ لە پێش فعلەکەوە پرسیارکردن(الاستفهام)هەبێ،بۆئەمەش ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی((إنْ وَلِی مُسْتَفْهَماً))،مەرجی چوارەم: نابێت بەین خرێتە نێوانیان_واتا نێوان پرسیارکردنەکەوفعلەکە_مەگەر ئەو بەینە ظرف بێت یان،جارومجرور بێت ،یان کارتێکراو(معمول)ـی فعل بێت،جا ئەگەر بەین(فاصل)کە یەکێك بێت لەمانە ئەوە زیانی نیە،ئەمەیە مەبەست لەووتەی((وَلَمْ یَنْفَصِلِ بِغَیْرِ ظرفٍ_تاکۆتایی )) . جانموونەی ئەوەی هەموو مەرجەکانی تێدا بێ ((اتقول عَمراً منطلقاً ؟))[1]،لێرەدا(عَمراً):دەبێتە مفعولی یەکەم،و(منطلقاً)دەبێتە مفعولی دووەم،وە وەکو ووتەی:

ش١٣٤/ متی تقولُ القُلُصَ الرَّواسِمَا     یَحْمِلْنَ أُمَّ قَاسِمٍ وقَاسِمَا.[2]

جائەگەرفعلەکە مضارع نەبێ،وەکو((قَال زیدٌ عمرٌو مُنطلقٌ))ئەوە دروست نیە فعلی(قال)دوو مفعولەکە منصوب کات لای ئەمانە[3]،هەروەها ئەگەر فعلە مضارعە بە حەرفی(تـ)دەستی پێنەکردبوو،وەکو((یقولُ زیدٌ عمرٌو مُنطلقٌ))،هەروەها ئەگەر پرسیارکردنی لە پێشەوە نەبوو،وەکو((أنت تقول عمرٌو منطلقٌ))،هەروەها ئەگەر استفهام لە پێشێوە بوو بەڵام بەین(فاصل)کرابوون بە جگە لە ظرف،وجارومجرور،ومعمولی فعلەکە،وەکو((أأنت تقول عمرٌو منطلقٌ؟))،بەڵام ئەگەر بەین کرابوون بەیەکێ لەوانە[4] ئەوە زیانی نیەودروستە،وەکو((أعندك تقول زیداً مُنطلقاً ؟))،وە((أفي الدار تقول زیداً مُنطلقاً))، وە((أعمراً تقول مُنطلقاً ؟))،وە وەکو ووتەی:

---

[1] واتا:ئایە تۆ گومان دەبەی عەمر دەرچبێ.

[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێرە: چ کاتێ گومان دەبەی ووشترە لاوە خێراکان هەڵگرن ولەمن نزیك کەنەوە دایکی قاسم وقاسم. بەڵگەکەی(( تقولُ القُلُصَ الرَّواسِمَا یَحْمِلْنَ))،فعلی (تقولُ)وەکو (تظن)بەکار هاتووە دوو مفعولی منصوب کردووە، یەکەمیان (القُلُصَ) ودووەمیان رستەی(یَحْمِلْنَ).

[3] لای زۆرینەی زانایان.

[4] واتا بە یەکێ لە: ظرف،وجارومجرور،ومعمولي فعلەکە.

ش١٣٥/ أَجُهَّالاً تقولُ بَنِي لُؤَيّ     لَعَمْرُ أَبِيكَ أَمْ مُتَجَاهِلِينَا. [١]

لەم دێڕەدا(بَنِي لُؤَيّ)مفعولی یەكەمەو(جُهَّالاً)مفعولي دووەمە.

جا هەركاتيك كۆبووە هەموو ئەومەرجانەی باسكران ئەوە دروستە منصوب كردنی دوو مفعولەكە بڵێيت((اتقولُ زيداً مُنطلقاً))،وەدروستيشە مرفوعيان كەيت لەسەرگێڕانەوە(الحكايه)،وەكو((اتقولُ زيدٌ مُنطلقٌ)).

* * *

٢١٩- وَأُجْرِيَ القَوْلُ كَظَنّ مُطْلَقَــــاً     عِنْدَ سُلَيْمٍ نَحْوُ قُلْ ذَا مُشْفِقَا. [٢]

ئامارە دەكات بۆ بۆچوونی دووەمی عەرەبەكان دەربارەی(قول)،ئەويش بريتيە لە بۆچوونی سولەيم،كە بەكاردێنن (قول)وەكو بەكارهێنانی(ظن) لەومنصوب كردنی دوو مفعول،بەڕەهايی وبەبێ مەرج،واتا:ئەگەر مضارع بێ، يان مضارع نەبێ،تێيدا بێ ئەو مەرجانەی باسكران ،يان تێيدا نەبێ، ئەويش وەكو نموونەی((قُلْ ذَا مُشْفِقَا))،لێرەدا(ذَا)مفعولی یەكەمەو(مُشْفِقَا)مفعولی دووەمە، وە وەكو ووتەی:

ش١٣٦/ قَالَتْ وَكُنْتُ رَجُلاً فَطِيناً     هَــذَا لَعَمْــرُ اللهِ إِسْرَائِينَا. [٣]

(هذا)مفعولی یەكەمە بۆ فعلی(قالت)و(إسرائينا):مفعولی دوومە.

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: ئايە واگومان دەبەی نەوەی لوئەی_واتا قوڕەيش_نەزانن لەم كارەياندا، بەگيانی باوكت قەسەم ئەمان خۆيان نەزان دەكەن ونەزان نين. بەڵگەكەی((أَجُهَّالاً تقولُ بَنِي لُؤَيّ)) ،لێرەدا فعلی(تقول)عەمەلی(تظن)ی كردووە ودوو مفعولی منصوب كردووە،لەكاتێكدا بەين(فاصل) هەيە لەنێوان فعلەكەو استفهامەكە، بەڵام فاصلەكە _كەبريتيە لە(جهالا)_معمولی فعلەكەيە.

[٢] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفيە:فعلی(قول) وەكو(ظنّ) بەكار دێ بەڕەهايی_واتا بەبێ مەرج_،لای هۆزی(سُليم)،وەكو نموونەی(قُلْ ذَا مُشْفِقَا)واتا:گومان بە كە ئەو دەترسێ.

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: گومانی بردو ووتی_لەكاتێكدا من كەسێكی تێگەشتوو بووم_:سوێند بەخوا ئەمە لەنەوەی ئيسرائيلە. بەڵگەكەی(قَالَتْ... هَـذَا... إِسْرَائِينَا.) لێرەدا (قالت)عەمەلی (ظن)ـەی كردووە ودوو مفعولی منصوب كردووە.

# بابەتی (أعلمُ وأری)

٢٢٠_ إِلَى ثَلاَثَـــــــةٍ رَأَى وَعَلِمَا        عَدَّوْا إِذَا صَارَا أَرَى وَأَعْلَمَا.[١]

ئامـاژە دەكـات ابـن مالـك لـەم بەشـە بـۆ ئـەو فعلانـەی تێپـەڕن بـۆ سـێ مفعول،باسی حەوت فعل دەكات، لەوانە((أعلم وأری))،باسی ئەوەی كرد بنەڕەتیان بریتیەلە(علم،ورأی)،وە بەهۆی حەرفی هەمزەكەوە تێپەر دەبن بۆ سێ مفعول،چونكە پێش هاتنی هەمزەكە تێپەڕدەبوون بۆ دوو مفعول،وەكو((عَلِم زیدٌ عمراً منطلقاً،ورأی خالدٌ بكراًأخاك))،جا كاتێك كە هەمزەی گواستنەوە(النقل)[٢] چۆتە سەریان مفعولی سێیەمی بۆیان زیادكردووە،ئەوەی كە پێشتر فاعل بووە پێش زیادكردنی هەمزەكە، ئەمەش وەكو نموونەی((أَعْلَمْتُ زیداً عمرًا منطلقاً))وە((أَرَیْتُ خالدا بكرا اخاك))،لەم دوو نموونەیەدا هەریەك لە(زیداً)و(خالداً):مفعولی یەكەمن،كە پێشتر فاعل بوون كاتێك ووتت((علم زیدٌ،ورأی خالدٌ)).

بەم شێوەیە ئیشی هەمزە،كە:ئەوەی پێشتر فاعل بووە دەیكاتە مفعول،جا ئەگەر فعلەكە پێش هاتنی هەمزەكە تێنەپەڕ(لازم)بووبێ ئەوە دوای هەمزەكە دەبێتە تێپەڕبۆ یەك مفعول،وەكو((خرج زیدٌ،واخرجتُ زیداً))،وەئەگەر پێشتر تێپەڕبووبێ بۆ یەك مفعول دوای هاتنی هەمزەكە تێپەر دەبێ بۆ دوو مفعول،وەكو((لبس زیدٌ جُبّەً))دەڵێیت((البستُ زیداً جبّەً))،دواتریش باسی دەكەین،وەئەگەرپێشتر

---

[١] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: تێپەڕ دەبن بۆ سێ مفعول هەردوو فعلی(رأی وعلم)،كاتێك بكرێنە(أعلم وأری). واتا:هەردوو فعلی(أعلم وأری) لە زمانی عەرەبیدا پێویستیان بە سێ مفعولە.

[٢] مەبەست لەگواستنەوە ئەوەیە ئەو هەمزەیە فاعلەكە دەكاتە مفعول ،ومفعولی یەكەم دەكاتە دووەم ،وبەوشێوەیە.

تێپەڕبووبێ بۆ دوو مفعول ئەوەدوای هاتنی هەمزەکە تێپەڕ دەبێ بۆسێ مفعول،وەکو باسکرا لە((أعلم،وأری)).

* * *

*مفعولی دووەم وسێیەمی(اعلم وأری) هەمان حوکمی مفعولی یەکەم ودووەمی(علم ورأی)ی هەیە.

٢٢١-وَمَا لِمَفْعُولَيْ عَلِمْتُ مُطْلَقَا لِلثَّانِ وَالثَّالِثِ أَيْضاً حُقِّقَا.[1]

واتا:جێگیردەبێ بۆ مفعولی دووەم وسێیەم لە مفعولەکانی((أعلم وأری))،ئەوەی هەبوو بۆ دوو مفعولەکەی((علم ،ورأی)):لەوەی لە بنەڕەتدا مبتداوخبرن ،وەلەوەی دروستە هەڵوەشاندنەوەوهەڵواسین(الالغاء والتعليق)بکرێن، وە لە حذف کردنی هەردووکیان یان یەکێکیان،ئەگەر بەڵگە هەبێ،نموونە بۆئەمە((أعلمْتُ زيداً عمراً قائماً))لێرەدا مفعولی دووەم وسێیەم لەم سێ مفعولە لە بنەڕەتدا مبتداوخبرن_کەبریتین لە((عمروٌ قائمٌ))_،وەدروستە هەڵوەشاندنەوەی کارتێکەر(العامل)ـەکەیان،وەکو((عمرٌو اعلمتُ زيداً قائمٌ))،وە وەکو ووتەیان((البركةُ أَعْلَمَنَا اللهُ مع الأَكَابِرِ))[2]، لێرەداجێناوی((نا)):مفعولی یەکەمە،و((البركە)):مبتدایە،و((مع الأکابر)) ظرفەولەمحلدا خبرە،ئەم دووانە لەبنەڕەتدا مفعول بوون،وئەصلی ووتەکەش((أعلمَنا اللهُ البركةَ مع الأكابِرِ))،هەروەها دروستە هەڵواسرێن،ودەڵێیت((اعلمْتُ زيداً لعمرٌو قائمٌ)). وەنموونەی حذف کردنیان بە بەڵگە ئەوەیە بوترێت: هل اعلمْتَ احداً عمراً قائماً ؟تۆش دەڵێیت: اعلمتُ زيداً،وەنموونەی حذف کردنی یەکێکیان بەبەڵگە ئەوەیە بڵێیت((اعلمتُ زيداً عمراً))واتا:قائماً،يان((أعلمتُ زيداًقائماً))واتا:عمراً قائماً.

* * *

---

[1] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:هەموو ئەوحوکم وبڕیارانەی هەبوون بۆ دوومفعولی(علمتُ)بەڕەهایی هەن بۆ مفعولی دووەم وسێیەمی(اعلم واری).

[2] واتای ئەم ووتەیەی عەرەب: خوای گەورە فێری فەڕوبەرەکەتی کردووین لەگەڵ گەورەکان.

٢٢٢- وَإِنْ تَعَدَّيَـــا لِوَاحِـــدِ بِـلاَ هَمْـــزٍ فَلاِثْنَيْنِ بِهِ تَوَصَّـــلاَ
٢٢٣- وَالثَّانِ مِنْهُمَا كَثَانِي اثْنَــيْ كَسَا فَهْوَ بِهِ فِي كُلِّ حُكْمٍ ذُو ائْتِسَا.[1]

پێــشتر رابــورد کــە هــەردووفعلی(رأی،وعلــم) ئەگــەر هــەمزەی گواستنەوە(النقل)بچێتە سەریان ئەوە تێپەڕ دەکەن بۆ سێ مفعول، وەلەم دوو دێڕەدا ئامارەی کرد بۆ ئەوەی ئەم دوو فعلە کاتێك وان ئەگەر پێش هاتنی هەمزەکە دوو مفعولیان هەبووبێ،بەڵام ئەگەر پێش هەمزەکە یەك مفعولیان هەبووبێ_وەکو ئەوەی((رأی))بەمانای بینینی چاو(ابصر)بێ، نموونەی((رأی زیدٌعمراً))،وە(علم)بەمانای ناسین وزانین(عرف)بێ، نموونەی((عَلِمَ زیدٌ الحقَّ))_ئەوە لەم کاتەدا دوای هاتنی هەمزەکە تێپەڕدەبن بۆدوو مفعول،وەکو((أریتُ زیداً عمراً ))[2]،وە وەکو((أعلمتُ زیداً الحقَّ))[3]، جامفعولی دووەمی ئەم دووانە وەکو مفعولی دووەمی فعلی((کسا))و((أعطی))وایە،وەکو((کسوتُ زیداً جُبەً))،وە((أعطیتُ زیداً درْهماً)):لەو ڕوو وەوەی کە دروست نیە بکرێتە خبر بۆ مفعولی یەکەم[4]،کەوابوو دروست نیە بڵێی(زیدٌ الحقُّ))هەروەکو((زیدٌ

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە.٢٢٢-ئەگەر فعلی(اعلم وأری)پێشتر_واتا پێش هاتنی هەمزەکە_یەك مفعولیان هەبووبێ ئەوە بەهاتنی هەمزەکە تێپەڕدەبن بۆ دوو مفعول. ٢٢٣-مفعولی دووەمی(أعلم وأری)وەکو مفعولی دووەمی فعلی(کسا)وایە لەوڕوو وەوەی نابێتە خبر ونابێ حذف کرێ.

[2] واتای ئەم ڕستەیە:عەمرم نیشانی زەید دا.

[3] واتا: حەق وڕاستیم بە زەید ناسان.

[4] پێشتر لە شەرح وڕاقەی دێڕی ژمارە(٦٤و٦٥)ی ئەلفیە _لە پەراوێزەکەدا_باسی ئەوەمان کرد ئەو فعلانەی تێپەڕن بۆ دوو مفعول دوو جۆرن:١-دوو مفعولەکەیان لە ئەصڵدا مبتداوخبرن.٢-دوو مفعولەکەیان لە ئەصلدا مبتداو خبر نین، وە کو فعلی(کسا وأعطی...هتد).

درهمٌ))،هەروەها لەو ڕووەوە دروستە حذف ی مفعولی دووەم بکەیت لەگەڵ مفعولی یەکەم،وەدروستە مفعولی دووەم حذف کەیت ومفعولی یەکەم بهێڵیتەوە،وەدروستە مفعولی یەکەم حذف کەیت ومفعولی دووەم بهێڵیتەوە،هەرچەندە بەڵگەش نەبێ لەسەر حذف کردنەکە،جانموونەی حذف کردنی هەردووکیان((أعلمتُ ،وأعطيْتُ))،وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى﴾[1]،وەنموونەی حذف کردنی مفعولی دووەم وهێشتنەوەی یەکەم((أعلمْتُ زيداً،وأعطيتُ زيداً))،وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى﴾[2]

---

[1] ئایەتی ژمارە(٥)ی سورەتی(اللّيل)،پوختەی ماناکەی{جا ئەو کەسەی ماڵ_ ببەخشێ ولەخوابترسێ وپارێزکاربێ}، إعرابەکەی: ﴿الفاء﴾ استئنافية ﴿أما﴾ حرف شرط ، وتفصيل ﴿مَنْ﴾ إسم موصول بمعنى الذي في محل رفع مبتدا ﴿اعطى﴾ فعل ماض مبني على فتح مقدر على الألف منع من ظهوره التعذر ، وفاعله مستتر فيه جوازاً تقديره هو ، وجملة الفعل والفاعل صلة الموصول ، و﴿اتقى﴾ ﴿الواو﴾ حرف عطف ﴿اتقى﴾ فعل ماض مبني على فتح مقدر على الألف منع من ظهورها التعذر وخبر المبتدا قوله تعالى { فسنيسره لليسرى } .الشاهد فيها:جواز حذف المفعول من الفعل مع عدم وجود دليل عليه

[2] ئایەتی ژمارە(٥)ی سورەتی(الضحى)،پوختەی ماناکەی{سوێند بەخوا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ کەڕازی بیت}، إعرابەکەی: ﴿اللام﴾ موطئة للقسم ﴿سوف﴾ للتسويف وهو الزمن البعيد ﴿يعطي﴾ فعل مضارع مرفوع لتجرده عن الناصب والجازم وعلامة رفعه ضمة مقدرة على آخره منع من ظهورها الثقل ، و﴿الكاف﴾ ضمير متصل في محل نصب مفعول به أول لأعطى والمفعول الثاني محذوف ﴿رب﴾ فاعل مرفوع ﴿رب﴾ مضاف ، و﴿الكاف﴾ ضمير متصل في محل جر بالإضافة ﴿فترضى﴾ ﴿الفاء﴾ حرف عطف ﴿ترضى﴾ فعل مضارع مرفوع لتجرده عن الناصب والجازم وعلامة رفعه ضمة مقدرة على الألف منع من ظهورها التعذر ، وفاعله مستتر فيه وجوباً تقديره أنت. الشاهد فيها:حذف المفعول الثاني للفعل(أعطى).

وەنموونـەی حـذف كردنـی مفعـولی یەكـەم وهێـشتنەوەی دووەم((أعلمـتُ الحـقَّ، واعطیتُ درهماً))،وە وەكو فەرموودەی خوای گەورە﴿حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾[1]،ئەمەبوو مانای ووتەی دانەر((والثاني منهما_تاكۆتای دێرەكە[2]))

* * *

٢٢٤–وكَأَرَى السَّابِقِ نَبَّا أَخْبَرَا    حَدَّثَ أَنْبَأَ كَذَاكَ خَبَّرَا.[3]

پێـشتر دانـەر باسـی كـرد كـە ئـەو فعلانـەی تێپـەڕن بـۆ سـێ مفعـول حەوتن،وەباسی((أعلم،وأرى))كرا،جالەم دێڕەدا باسی پێنچەكەی تری كرد،ئەوانیش بریتین لە((نبّأ))وەكو((نَبَّأْتُ زيداً عمراً قائماً))[4]،وە وەكو ووتەی شاعر:

ش١٣٧/نُبِّئْتُ زُرْعَةَ _والسَّفَاهَةُ كَاسْمِهَا    يُهْـــدِي إِلَيَّ غَرَائِبَ الأَشْعَارِ.[5]

---

[1] بەشێكە لەئایەتی ژمارە(٢٩)ی سورەتی(التوبە)،كورتەی ماناكەی{هەتا باج وسەرانە دەدەن بەدەستی خۆیان وبە ملكەچی لەكاتێكدا ئەوان سەرشۆڕو ڕیسوان.} إعرابەكەی: ﴿حتى﴾ حرف غاية وجر ﴿يعطوا﴾ فعل مضارع منصوب بأن مضمرة وجوباً بعد حتى وعلامة نصبه حذف النون لأنه من الأمثلة الخمسة ، و﴿الواو﴾ ضمير متصل في محل رفع فاعل ﴿الجزية﴾ مفعول به أول ، والمفعول الثاني محذوف ﴿عن يد﴾ جار ومجرور متعلق بمحذوف حال من الفاعل في يعطوا ، وأن ومادخلت عليه في تأويل مصدر مجرور بحتى ﴿وهم صاغرون﴾ ﴿الواو﴾ حالية ﴿هم﴾ ضميرمنفصل في محل رفع مبتدأ .﴿صاغرون﴾ خبر مرفوع وعلامة رفعه الواو نيابة عن الضمة لأنه جمع مذكر سالم ، وجملة "وهم صاغرون" في محل نصب حال . . الشاهد فيها: حذف المفعول الاول للفعل(يُعطى).

[2] واتا:دێڕی ژمارە(٢٢٣)ی ئەلفیە،كە مانامان كرد.

[3] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:وەكو فعلی(ارى)وان_لەڕوو وەوەی كە سێ مفعول منصوب دەكەن_ئەم پێنج فعلە{ نَبَّا، أَخْبَرَا،حَدَّثَ، أَنْبَأَ ،خَبَّرَا}.

[4] واتای ئەم ڕستەیە:هەواڵم دا بە زید كە عەمر وەستاوە.

[5] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:هەواڵم پێدراوە زرعە_ناوی كسێكە_كە ناو وناوەڕۆكی ناشیرینە،بۆم دەنێرێ هۆنراوەوقسەی نابەجێ. بەڵگەكەی: فعلی(نبّأ)سێ مفعولی منصوب كردووە،یەكەمیان بریتیەلە جێناوی(تُ)،دووەمیان(زُرعة)،وسێیەمیان ڕستەی (يُهدی إليّ..).

هەروەها((أخبر))وەكو((أخبرتُ زيداً أخاك مُنطلقاً))،وە وەكو وتەی شاعر:

ش١٣٨/وَمَا عليكَ _إذا أُخْبَرْتِنِي دَنِفاً وغَابَ بَعْلُكِ يوماً_ أَنْ تَعُودِينِي.[1]

هەروەها((حَدَّث))وەكو وتەت((حَدَّثْتُ زيداً بَكْراً مُقيماً))،وە وەكو وتەی شاعر:

ش١٣٩/أَوْ مَنَعْتُمْ مَا تُسْأَلُونَ فَمَنْ حُدِّ ثْتُمُوهُ لَهُ عَلَيْـــــــــنَا الوَلاَءُ.[2]

هەروەها((أَنْبَأَ))وەكو وتەت((أَنْبَأْتُ عبدَالله زيداً مُسَافِراً))،وە وەكو وتەی شاعر:

ش١٤٠/وَأُنْبِئْتُ قَيْساً وَلَمْ أَبْلُهُ كَمَا زَعَمُوا خَيْرَ أَهْلِ الْيَمَنْ .[3]

هەروەها((خَبَّرَ))وەكو وتەت((خَبَّرْتُ زيداً عَمراً غَائِباً))،وە وەكو وتەی شاعر:

ش١٤١/ وَخُبِّرْتُ سَوْدَاءَ الغَمِيمِ مَرِيضَةً فَأَقْبَلْتُ مِنْ أَهْلِي بِمِصْرَ أَعُودُهَا.[4]

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:هیچت لەسەرنیەوتووشی هیچ نابی_كاتێ هەواڵی من زانی كە سوتاوم ونەخۆشی تۆم_ڕۆژێ مێردەكەت لەماڵ نەبێ سەردانم بكەی ولە نەخۆشییەكەم بپرسی. بەڵگەكەی:فعلی(أخبر)سێ مفعولی منصوب كردووە، یەكەمیان جێناوی(تِ)كەنائب فاعلەولە محلدا مفعولی یەكەمە،دووەمیان جێناوی(ی)ی لكاوە بەفعلی(أُخْبَرْتِنِي)،وەسێیەمیان بریتیەلە(دَنِفاً).

[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: ئایە ڕێگری دەكەن لەوەی داواتان لێدەكرێ،جا كێ پێی ڕاگەیاندوون كە كەسانێك هەبن بەسەر ئێمەدا زاڵ بوون،واتا كەس نەبووە بەسەر ئێمەدا زاڵ بێت. بەڵگەكەی: فعلی(حدّث)سێ مفعولی منصوب كردووە،یەكەمیان جێناوی(تُ)كەنائب فاعلەولە محلدا مفعولی یەكەمە،دووەمیان جێناوی(ها)ی لكاوە بەفعلی(حدَّث)ەوە،سێیەمیان ڕستەی(لَهُ عَلَيْنَا الوَلاَءُ).

[3] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش: هەواڵم پێدراكە قەیس _لە كاتێكدا تاقیم نەكردەوە_ وەكو ووتراوە باشترین خەڵكی یەمەنن. بەڵگەكەی: فعلی(أَنْبَأَ)سێ مفعولی منصوب كردووە،یەكەمیان جێناوی(تُ)كەنائب فاعلەولە محلدا مفعولی یەكەمە،دووەمیان (قَيْساً) ،سێیەمیان(خَيْرَ أَهْلِ الْيَمَنْ).

[4] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش:هەواڵم پێدرا كە خۆشەویستەكەم ئافرەتە ڕەشەكەی غەمیم_ناوی شوێنێكە_نەخۆشە، بۆیە منیش گەڕامەوە لە ناو كەس وكاری خۆم لە مصردا و سەردانیم كرد. بەڵگەكەی :فعلی(خَبَّر)سێ مفعولی منصوب كردووە،-

جا دانەر بۆیە فەرمووی((وَكَأَرَى السَّابِقِ))،چونکە پێشتر باسکرا کە فعلی((أرى))هەندێ جار سێ مفعولی هەیەوهەندێ جاریش دوو مفعولی هەیە،دانەریش لە سەرەتاوە باسی سێ مفعولییەکەی کرد،بۆیە لێرەدا ئاگاداری کردین کە ئەم پێنج فعلە[1]،وەکو فعلی((أرى))ن کە پێشتر باسکرا،کە بریتی بوو لە تێپەڕ بۆلای سێ مفعول، نەوەك ئەو((ارى))یەی کە لەدواتر باسی کرد،کە تێپەڕە بۆ دوو مفعول.

* * *

-یەکەمیان جێناوی(تُ)کەنائب فاعلەولە محلدا مفعولی یەکەمە،دووەمیان (سَوْدَاءَ الغَمِيمِ) ،وسێیەمیان(مَرِيضَةً).

[1] واتا: { نَبَّأ، أَخْبَرَا،حَدَّثَ، أَنْبَأَ ،خَبَّرَا} .

# الفاعل[(١)]

٢٢٥ – الفَاعِلُ الَّذِي كَمَرْفُوعَىْ أَتَى زَيْدٌ، مُنيراً وَجْهُهُ نِعْــمَ الفَتَى.[(٢)]

كاتێك تەواو بوو لە قسەوباسی (نواسخی ابتدا)،دەستی كرد بە باسی ئەو شتەی كە فعلی تەواو(الفعل التام) داخوازی دەكات_ئەویش بریتیە لە فاعل،یان جێگری فاعل_،دواتر لە دوای ئەم باسە باسی جێگری فاعلیش دێت.

جا فاعل بریتیە لە:ناوێك،كە پاڵ درا بێت بۆلای كاریٚ،بە ڕێگەوشێوەی(فَعَلَ) ،یان هاوشێوەی(فَعَلَ)[(٣)]،وەحوكمی فاعلیش ئەوەیە كە مرفوعە، جامەبەست لە ناو[(٤)]:ئەو ناوانەن ڕاستەوخۆ ناون(الاسم

---

[(١)] لەسەرەتاوە باسی ئەوەمان كرد كە خوێندنی ڕێزمانی هەر زمانێك بۆ ئەوەیە فێری ئەو زمانە بی، واتا فێری قسەكردن وتێگەشتن لەو زمانە بەشێوەیەكی ڕاست ودروست،قسەكردن(الكلام)پێشی دەوترێت ڕستە(الجملة)،جا لەزمانی عەرەبیدا بە شێوەیەكی گشتی دوو جۆر ڕستە هەیە:١-ڕستەی ناوی(الجملة الاسمية)،كە لەمبتدا+خبر پێك دێت وپێشتر بە تفصيل باسكرا.٢-ڕستەی كرداری(الجمل الفعلية) كە لە فعل+فاعل پێكدێت، لەم بەشەدا باسی(فاعل)دەكەرێت بە تفصيل،كە یەكێكە لەو ناوانەی پێیان دەوترێ(المرفوعات). جا لەزمانی كوردیدا بە فاعل دەوترێ(بكەر)واتا ئەو كەسەی كردارەكەی ئەنجام داوە،وەلە زمانی عەرەبیدا حوكم وماناى تايبەتی خۆی هەیە كە لە شەرحەكەدا باسی دەكەین_إنشاءالله_

[(٢)] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: فاعل بریتیە لە هەموو ئەو ناوانەی مرفوعن بە هاوشێوەی ئەم سێ ناوەی لەم سێ ڕستەیەدا هاتوون،١-وەكو ناوی(زيدٌ)لەڕستەی ((أَتَى زَيْدٌ ))،٢-وەناوی(وجهُهُ)لەڕستەی((مُنيراً وَجْهُهُ))كە عاملەكەی بریتیە لە(مُنيراً) اسمی فاعلە وفاعلەكەی مرفوع كردووە،٣-وە ناوی(الفتى) لەڕستەی((نِعْــمَ الفَتَى)).

[(٣)] مەبەست لەهاوشێوەی فعلە ئەوناوانەیە كە هەمان عەمەلی(فعل)ەكەیان دەكەن، ئەوانەش بریتین لە {اسم الفاعل ، صيغة المبالغة ،الصفة المشبهة ، المصدر، أسماء الأفعال ،افعل التفضيل} ،كە ابن عقيل دواتر نموونە بۆ هەموویان باس دەكات.

[(٤)] لێرەوە ابن عقيل شەرح وڕاڤەی پێناسەی فاعل دەكات.

الصریح)،وەکو((قام زیدٌ))، وەئەو ناوانەی ناڕاستەوخۆن وتأویل دەکرێن(المؤول)[١]،وەکو((یُعْجبني انْ تقومَ))واتا:قیامُكَ.

کەواتە دەردەچێ بە((پاڵ درابێت بۆلای کارێك))ئەو ناوەی کە فعلی بۆلا پاڵ نەدرابێ وەکو((زیدٌ اخوك))[٢]، یان ڕستەی بۆلا پاڵ درا بێ،وەکو((زیدٌ قام أبوهُ))یان((زیدٌ قام))،یان شتێك هێزی ڕستەی هەبێت وەکو((زیدٌ قائمٌ غُلامُهُ))یان((زیدٌ قائمٌ))[٣] واتا:ئەو(هو)، هەروەها دەردەچێ بەووتەمان((بە ڕێگەوشێوەی فَعَلَ))ئەو ناوەی فعلێکی بۆلا پاڵ درابێ بەڕێگەی فُعِلَ،ئەویش بریتیەلە نائب فاعل،وەکو((ضُرِبَ زیدٌ)).

وەمەبەست لەهاوشێوەی ئەوفعلەی باسکرا:اسمی فاعلە،وەکو((أقائمٌ الزیدانِ))[٤]،وەصفەی مشبە،وەکو((زیدٌ حَسَنٌ وجهُهُ))[٥]،وە مصدر،وەکو((عجبْتُ مِنْ ضَرْبِ زَیدٍ عَمراً))[٦]،وە اسمي فعل[٧]،وەکو ((هیهاتَ العَقِیقُ))[٨]،وە ظرف وجارومجرور، وەکو((زیدٌ عندك

---

[١] اسمی مؤول لە زمانی عەرەبیدا بریتیە لە:حەرفە مصدرییەکان وئەوەی لە دوایانەوە دێت،حەرفە مصدرییەکانیش بریتین لە{انْ،انَّ ،کي،ما،لو}.

[٢] واتا:لەم ڕستەیەدا زیدٌ هەرچەندە ناوە بەڵام نابێتە فاعل چونکە فعلی بۆلا پاڵ نەدراوە،بەڵکو خبری بۆلا پاڵ دراوە.

[٣] لەم چوار نموونەیەشدا(زیدٌ) نابێتە بکەر(فاعل)چونکە فعلی بۆ لا پاڵنەدراوە.

[٤] لەم ڕستەیەدا((الزیدان))دەبێتە فاعل بۆ((قائمٌ))چونکە((قائمٌ))اسمی فاعلەو پێویستی بە فاعلە،واتاهەمان عەمەلی فعلەکەی دەکات.

[٥] لەم ڕستەیەشدا(وجهُ)دەبێتە فاعل بۆ(حسنٌ)،لەبەر ئەوەی حسنٌ صفەی مشبەهەیە وهەمان عەمەلی فعلەکەی دەکات.

[٦] لەم ڕستەتەشدا (زید)هەرچەندە بە لفظ مجرورە بەڵام لەماناداا فاعلە بۆ(ضربِ)، لەإعرابدا دەڵێین:مجرور لفظاً مرفوع محلاً وهو فاعل لـ(ضربِ).

[٧] پێشتر باسی اسمی فعلمان کرد.

[٨] لەم ڕستەیەشدا((العقیقُ))دەبێتە فاعل بۆ(هیهات).

أبوهُ))[1]،يان((فِي الدار غلامـاهُ))[2]،وه افعلى تفضيل،وەكو((مررتُ بالأفضلِ أبوهُ))[3]،لێرەدا أبوهُ:دەبێتە مرفوعى الافضل،بۆ ئەمانەی باسکرا ئامـاژەی کـرد دانـەر((هـەموو ئـەو ناوانـەی مرفـوعن بـە هاوشـێوەی...تـا کۆتـای دێرەکە)).

وەمەبەست لە ناوە مرفوعەکە ئەوانەن کە مرفوعن بە فعل، یان مرفوعن بە هاوشـێوەی فعـل،وەکو باسـکرا، وەدانـەر بۆمرفـوعی فعـل دوو نموونـەی هێنایەوە:یەکێکیان مرفوعە

بـەفعلی گـۆڕاو((متـصرف))،وەکـو((أتـى زيـدٌ))،وە دووەمیـان مرفوعـە بـە فعلێکـی نـەگۆڕ((جامـد))،وەکـو((نِعْـمَ الفتـى))،وە نموونـەی بـۆ مرفـوع بـە هاوشێوەی فعل هێنایەوە بە ڕستەی((مُنيراً وَجْهُهُ)).

* * *

---

[1] لەم ڕستەیەدا:أبوهُ دەبێتە فاعل بۆ(عند)ئەگەر بڵێین(عند)بۆ خۆی خبرە،وەدەبێتە فاعل بۆ ناوێکی حذف کراو،ئەگەر بڵێین(عند)بۆ خۆی خبر نیە بەڵکە متعلقە بە ناوێکی محذوف ئەو ناوە خبرە ،پێشتر لە شەرح وڕاڤەی دێڕی(١٢٣)ـی ئەلفیە بە تفصیل باسمان کرد.

[2] ئەمییش بەهەمان شێوەی ڕستەی پێشوو ترە.

[3] لەم ڕستەیەدا:أبوهُ دەبێتە فاعل بۆ الافضل،چونکە الافضل اسمى تفضيلة وهەمان عەمەلی فعلەکەی دەکات.

***هەموو فاعلێك دەبێت فعلێك لە پێشیەوە بێ**

**٢٢٦-وَبَعْدَ فِعْلٍ فَاعِلٌ فَإِنْ ظَهَر ٭ فَهْوَ وَإِلاّ فَضَمِيرٌ اسْتَتَـــــرْ.[١]**

حوکمی فاعل ئەوەیە کە لە عاملەکەی[٢]_کە فعلە یان ناوێکی هاوشێوەی فعل_دواکەوێت وەکو((قامَ الزیدانِ ،وزیدٌ قائمٌ غلاماهُ،قامَ زیدٌ))،وەدروست نیە فاعل پێش عاملەکەی کەوێت،کەواتا ناتوانی بڵێیت((الزیدانِ قامَ))وە((زیدٌ غلاماهُ قائمٌ))وە((زیدٌقامَ))،وەدروست نیە لەم نموونانەدا((زیدٌ))فاعل بێت وپێشکەوتبێت،بەڵکو دەبێتە مبتدا،وفعلەکەی دوای خۆی جێناوێکی نادیار(ضمیرمستتر)ی مرفوع کردووە،وەتقدیرەکەشی((زیدٌقامَ هو))،ئەمەش ڕاوبۆچوونی زانابەصرییەکانە،بەڵام لای زاناکوفییەکان دروستە فاعل پێش فعلەکەی کەوێت لەهەموو ئەو نموونانەی باسکران.

جاسوودو مانای ئەم ڕاجیاییە[٣] دەردەکەوێت لە جگە لەنموونەی کۆتای_کەنموونەی تاك بوونی فاعلە_کە بریتیەلە((زیدٌقامَ))،کەواتا لەسەر بۆچوونی کوفییەکان دەڵێیت((الزیدان قَامَ ، والزیدون قامَ))،وەلەسەر بۆچوونی بەصرییەکان دەڵێیت((الزیدانِ قاما ،والزیدونَ قاموا))لێرەدا ئەلیف وواو[٤] دەلکێنی بە فعلەکەوە،ئەلیف و واوەکە دەبنە فاعل،ئەمەیە مانای ووتەی دانەر((وَبَعْدَ فِعْلٍ فَاعِلٌ..)).

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:لەدوای فعلەوە فاعل دێ_واتا فاعل پێش فعل ناکەوێت_ جا ئەگەر فاعلەکەناوێکی دیارو ئاشکرا بوو ئەوە ئەو ناوە فاعلە،بەڵام ئەگەر فاعلەکە دیار نەبوو ئەوە جێناوێکی نادیارە.

[٢] مەبەست لە عاملی فاعل ئەو شتەیە کە عەمەلی تێدا دەکات ومرفوعی دەکات ،ئەویش بریتیە لە فعل وهاوشێوەکانی.

[٣] واتا:ڕاجیایی بەصرییەکان وکوفییەکان دەربارەی پێشکەوتنی فاعل.

[٤] واتا: ألف الاثنين و واوالجماعة.

هەروەها ئاماژەی کرد بەووتەی((فَإِنْ ظَهَر_تاکۆتای))،بۆئەوەی کە فعل وهاوشێوەی فعل پێویستی بە مرفوعێکە،جا ئەگەر مرفوعەکە ناوێکی دیاروئاشکرابوو ئەوە پێویست بە جێناوناکات،وەکو((قامَ زیدٌ))،وەئەگەر مرفوعەکەدیاروئاشکرا نەبوو ئەوە دەبێت جێناوێك بێتە فاعل، وەکو((زیدٌقامَ))،واتا:ئەو(هو).

* * *

## *باسی حاڵەتی فعل کاتێك فاعل بۆ دووان یان کۆ بێت

٢٢٧- وَجَرِّدِ الفِعْلَ إذَا مَا أُسْنِدَا          لاثْنَيْنِ أَوْ جَمْعٍ كَ "فَازَ الشُّهَدَا "

٢٢٨-وَقَدْ يُقَالُ سَعِدَا وَسَعِدُوا          وَالفِعْلُ للظَّاهِرِ بَعْدُ مُسْنَدُ.[1]

بۆچوونی زۆرینەی عەرەب وایە کاتێك فعل پاڵدرا بۆ لای ناوێکی ئاشکرا(الاسم الظاهر)_ئەو ناوەش بۆدووان یان بۆ کۆ بێ_ئەوە پێویستە ئەو فعلە خالی بێ لەنیشانەوجێناوی دووان وکۆ،هەروەکو چۆن پاڵ دەدرێ بۆ لای تاك،کەواتا دەڵێیت((قامَ الزیدانِ ، وقامَ الزیدونَ، وقامتْ الهنداتُ)) ، هەروەك چۆن دەڵێیت((قامَ زیدٌ))،وەلەسەر بۆچوونی ئەمانە[2] نابێ بڵێی((قاما الزیدان)) وەنابێ بڵێی (( قاموا الزیدون))، وەنابێ بڵێی(( قُمْنَ الهنداتُ))،لێرەدا نیشانەیەك دەلکێنی بەفعلەکەوە ئەو فعلەی فاعلەکەی ناوە ئاشکراکەیە،وئەو جێناوەی لکاوە بەفعلەکەوە_کەبریتین لە ئەلیف،و

---

[1] کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٢٧-پەتی وخالی بکە فعل_واتاجێناوی پێوە مەکە_ کاتێ پاڵدرا بۆلای دووان یان بۆلای کۆ وەکو((فَازَ الشُّهَدَا)) واتا: سەرفرازبوون شەهیدان.

٢٢٨-وەهەندێ جاریش دەوترێ:سعدا،وسعدوا_واتا جێناودەلکێنی بەفعلەکەوە_، بەڵام لەم کاتەشدا فاعلی فعلەکە ناوە ئاشکراکەیە نەوەك جێناوەکەی پێوەی لکاوە.

[2] واتا:بۆچوونی زۆرینەی عەرەب.

واو،و نون_دەبنە نیشانەیەك بۆ ئەوەی كە فاعلەكە دووان یان كۆیە،بەڵكو لەم كاتەدا ناوە ئاشكراكەی دواكەوتووە[1] دەبێتە مبتدای مؤخر وفعلەكەی پێشی وئەوەی لكاوە بە فعلەكەوە لە محلدا دەبنە خبری مقدّم بۆ ئەو مبتدایە.

وە دەكرێ بە شێوەیەكی تریش إعراب بكرێ،ئەویش بریتیە لەوەی ئەوجێناوەی لكاوە بە فعلەكەوە ببێتە فاعل بۆ فعلەكەو،ناوە ئاشكراكەش ببێتە بری(بدل)بۆ ئەو جێناوە_مەبەستم لە جێناوی ئەلیف،و واو،و نونە_. هەروەها بۆچوونی دەستەیەكی تر لە عەرەب[2]_ئەوانیش بریتین لە نەوەی حارثي كوڕی كعب[3]،وەكو پێشەوا صەففار لە شرحی كتێبەكەیدا گێڕاویێتیەوە_ ئەوەیە كە فعل ئەگەر پاڵدرا بۆ لای ناوێكی ئاشكرا_وناوەكەش بۆ دووان،یان بۆ كۆ بوو_ئەوكات نیشانەی دووان یان كۆ دێنین بۆ فعلەكە،ودەڵێیت((قاما الزیدانِ، وقاموا الزیدون، وقُمْنَ الهنداتُ)) لەم كاتەدا ئەلیف،و واو،و نونەكە دەبنە حەرفێك بۆ بەڵگە بوون لەسەر دووان بوون وكۆ(جمع)بوون،هەروەكو حەرفی (تاء) لەڕستەی((قامتْ هندٌ))حەرفێكە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بكەرەكە مێیە لای هەموو عەرەب،وەناوی دوای فعلەكە[4] دەبێتە عامل(فاعل)ی فعلەكە،هەروەكو چۆن((هندٌ))دەبێتە فاعل بۆفعلی((قامتْ))،وە وەكو ووتەی:

---

[1] كە بریتیە لە(الزیدان)لەڕستەی((قامَ الزیدانِ)).

[2] واتا:ئەمە بۆچوونی سێیەمە دەربارەی إعرابی ڕستەی((قاما الزیدان)).

[3] هۆزێكن لە هۆزەكانی عەرەبی یەمەن،ئەوانەن كە پادشایەكی ستەم كار سوتاندنی، قورئانی پیرۆز لە سورەتی(البروج)دا باسیان دەكات.

[4] واتا:ناوی(الزیدان ،والزیدون،والهنداتُ).

ش١٤٢/ تَوَلَّى قِتَالَ الْمَارِقِيـــنَ بِنَفْسِهِ وَقَدْ أَسْلَمَاهُ مُبْعَدٌ وحَمِيـــمُ.[١]

هەروەها وەکو ووتەی :

ش١٤٣/ يَلُومُونَنِي فِى اشْتِرَاءِ النَّخِيـ لِ أَهْلِى فَكُلُّـــهُمُ يَعْـــذِلُ.[٢]

وە ووتەی:

ش١٤٤/ رَأَيْنَ الغَوَانِي الشَّيْبَ لاَحَ بِعَارِضِى فَأَعْرَضْنَ عَنِّى بِالْخُدُودِ النَّوَاضِرِ.[٣]

جـا لـەم نموونانـەی باسـکران،ناوی((مُبْعَـدٌ وحَمِيـــمُ))مرفـوعن بـە فعلـی(أَسْلَمَاهُ)وە ئـەلیفی(اسلماهُ) تـەنها حـەرفێکـە بـۆ ئـەوەی بزانرێـت کـە فاعلەکـە دووانـە، هەروەهالـە نموونـەی دووەمـدا نـاوی(أهلـی)مرفوعـە بـە فعلی(يَلُومُونَنِي)وە واوی جماعەکە تـەنها حـەرفێکـە بـۆ ئـەوەی بزانرێت کە فاعل کۆ(جمع)ـە،هەروەها لـە نموونـەی سێیەمدا نـاوی(الغَوَانِي)مرفوعـە بـە فعلی(رَأَيْنَ)وە نونی نسوەکە تەنها حەرفێکە بۆ ئەوەی بزانرێت کە فاعلەکە کـۆی مـیّ(جمـع مؤنـث)ـە، جـا بـۆ ئـەم بۆچـوونە ئامـاژەی کـرد دانـەر بەووتەی((وَقَدْ يُقَالُ سَعِـــدَا وَسَعِدُوا _تاکۆتای دێڕەکە)).

---

[١] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە:خۆی سەرپەرشتی _واتا مصعبی کوڕی زوبیر ڕەزای خوا لەخۆیی وباوکی بێ_کوشتاری یاخییانی کرد، بەڵام دایان بەدەستەوە دوور ونزیك. بەڵگەکەی:(( وَقَدْ أَسْلَمَاهُ مُبْعَدٌ))لێرەدا فعلی أسلم جێناوی ئەلیفی پێوە لکاوە لەکاتێکدا فاعلەکەی بریتیە لە ناوە ئاشکراکە واتا_مبعدٌ_،کەواتا ئەلیفەکە نابێتە فاعل.

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: سەرزەنشتم دەکەن کەس وکارم لەسەر کڕینی دار خورما،هەموویان تێکڕا. بەڵگەکەی:(( يَلُومُونَنِي... أَهْلِى))لێرەدا فعلی(يلومُ)واوی جماعەی پێوە لکاوە لەکاتێکدا فاعلەکەی بریتیەلە(أهلی)،واتا واوی جماعەکە نابێتە فاعل.

[٣] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش: بینییان کچە جوانەکان مووی سپی ئەدرەوشێتەوە لە ڕیشم،بۆیە پشتیان تێکردم بە ڕوومەتە گەشاوەکانیان. بەڵگەکەی:(( رَأَيْنَ الغَوَانِي)) لێرەشدا فعلی(رَأَيْنَ) نونی نسوەی پێوە لکاوە لەکاتێکدا فاعلەکەی بریتیەلە (الغواني)، واتا نونی نسوەکە نابێتە فاعل.

مانای وایه هەندێ جار لەدوای ئەوفعلەی کە پاڵدراو(المسند)ـە بۆ لای ناوێکی ئاشکرا نیشانەیەك دێ بۆ دووان،یان بۆ کۆ،وە فامرایەوە لە وتەی((وَقَدْ يُقَالُ))واتا ((کەم جار دەوترێ))کە ئەم حاڵەتە کەمە،هەر وایە. جا دانەر بۆیە فەرمووی((وَالفِعْلُ للظّاهِرِ بَعْدُ مُسْنَدُ))بۆ ئەوەی ئاگادارمان کات ئەم جۆرە لێکدانە کەمە کاتێك فعلەکە پاڵدەی بۆ لای ناوێك ئاشکرا،بەڵام ئەگەر فعلەکە پاڵدەی بۆلای ئەو جێناوەی پێوەی لکاوە_واتائەلیف،و واو،و نونی نسوە_ودواتر ناوە ئاشکراکە بکەیتە مبتدا،یان بیکەیتە بری(بدل)ی جێناوەکە،ئەوە لەم کاتەدا کەم نیە، هەروەهانحوزانان بەم خوێندن وبۆچوونە کەمە دەڵێن خوێندنەوەی ((اكلوني البراغيثُ))[1] ،وە دانەر بۆ ئەم بۆچوونە لەهەندێ لەکتێبەکانی دەستەواژەی(( يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ))[2]،ی

---

[1] ئەم ڕستەیە کە بەواتای((کێچ خواردمی))دێت ،کراوە بەناو بۆ بۆچوون وخوێندنەوەی هەندێلە عەرەب کە پێیان وایە فعل ئەگەر پاڵدرێ بۆ لای دووان یان کۆ دروستە ئەوفعلە نیشانەی دووانی یان کۆ بچێتە سەری،ئەم بۆچوونەش پێچەوانەی بۆچوونی زۆرینەی زانایانە.

[2] ئەم دەستە واژەیە لە بنەڕەتدا فەرمووەی پێغەمبەرە_ﷺ_وهەریەك لە ئیمامی بوخاری ومسلم ڕیوایەتیان کردووە،پوختەی ماناکەی:{بەرووداوا دێنە لاتان مەلائیکەتەکان بەشەو وبەڕۆژ..}.إعرابی فەرموودەکە :يتعاقبون/ فعل مضارع مرفوع،وعلامة رفعه ثبوت النون لانه من الأفعال الخمسة. والواو/ علامة الجمع في لغةٍ، فيكم/جارومجرور متعلقان بـ(يتعاقبون). ملائكةٌ/ فاعل مرفوع. باللَيل/جارومجرور متعلقان بـ(يتعاقبون). و/حرف عطف. ملائكةٌ/معطوفة على ملائكة الاولى. بالنهار/ جارومجرور متعلقان بـ(يتعاقبون). الشاهد فيه:( يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ..)الاصل عند النحاة انّ الفعل إذا أسند الى فاعل ظاهر مثنّى او جمعٍ،جرّد من علامة التثنية والجمع، غير انّ قوماً من العرب_وهم طيئ او ازدشنوءة_ يلحقون الفعل علامة التثنية والجمع ،فسمّيت لغتهم(اكلوني البراغيثُ))' او((يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ)).

بەکارهێناوە جا((البراغیث))دەبێتە فاعل بۆ فعلی(أکلونی)،وە ((ملائکة))دەبێە فاعل بۆ فعلی((یَتَعَاقَبُونَ))،دانەر پێی وایە[1].

* * *

## *باسی حذف کردنی فعلی فاعلەکە

٢٢٩-وَيَرْفَعُ الفَاعِلَ فِعْلٌ أُضْمِرَا كَمِثْلِ زَيْدٌ فِي جواب مَنْ قَرَا.[2]

هەرکاتێك بەڵگە هەبێ لەسەر فعل ئەوە دروستە ئەو فعلە حذف کرێ،وفاعلەکەی بمێنێتەوە،وەکو ئەوەی پێت بوترێ ((مَنْ قَرَا))؟،تۆش لە وەڵامدا بڵێی((زَيْدٌ))،تقدیرەکەشی((قرأ زیدٌ))،هەندێ جاریش پێویست(واجب)ە فعلەکە حذف کرێ،وەکو فەرمایشتی خوای گەورە﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ﴾[3]،لێرەدا((أحدٌ))فاعلە بۆ فعلێکی حذف کراو بەواجبی، وتقدیرەکەی((وإنْ استجارَكَ أحدٌ استجارَكَ))،هەروەها هەموو ناوێکی مرفوع کەوتە دوای((إنْ))یان((إذا))ی مەرج(الشرطیة)ئەوە مرفوع

---

[1] لێرەدا بۆیە پێشەوا ابن عقیل وا دەڵێ چونکە ابن عقیل ئەم بۆچوونەی لا پەسەند نیە وپێی وانیە لە فەرموودەکەدا(ملائکة) فاعلی((یَتَعَاقَبُونَ))بێت.

[2] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:مرفوع دەکات فاعل فعلێکی نادیاروشاراوە،لە نموونەی((زیدٌ)) لەوەڵامی((من قرأ))،واتا لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ناڵێین (قرازیدٌ)، بەڵکو فعلەکە حذف دەکەین.

[3] ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە(٦)ی،سورەتی(التوبة)،کورتەی ماناکەی{ئەگەر کەسێك لە هاوبەش دانەرەکان داوای هاوسێیەتی وپەنادانی لێ کردی...}،إعرابەکەی: و/حسب ماقبلها. إنْ/ حرف شرط جازم مبني على السكون. أحدٌ/ فاعل لفعل محذوف يفسّره الفعل الذي يليه ،والتقدير(وإن استجارك أحدٌ استجارك).من المشركين/جارومجرور مبني في محل رفع نعت لـ(أحد). استجارَ/فعل ماضٍ مبني على الفتح،وفاعله ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره(هو). ك/ضمير متصل مبني في محل نصب مفعول به. الشاهد فيها:أحدٌ :حيث حذف فعله وجوباً،لأنه واقع بعد(إنْ)الشرطية.

دەبێت بە فعلێکی حذف کراو بە واجبی ،نموونەی ئەمە لە((إذا))دا فەرموودەی خوای گەورە﴿إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ﴾[1]،لێرەدا((السماء))فاعلە ومرفوعە بۆ فعلێکی محذوف بەواجبی،وتقدیرەکەی((إذَا انْشَقَّتْ السَّمَاءُ انْشَقَّتْ))،ئەمەش ڕای زۆرینەی زانایانە،دواتر قسەش لەسەر ئەم بابەتە دێت لە باس وبابەتی(الاشتغال)،إنْشاءالله تعالى.

## *ئەگەر فاعل مؤنث بوو ئەوە فعلەکە( تاي تانيثى )پێوەدەلکێت

٢٣٠- وَتَاءُ تأنيث تَلِي الْمَاضِي إِذَا كَانَ لأُنْثَى كـ " أَبَتْ هِنْدُ الأَذَى "[2].

ئەگەر پاڵدرێت فعلی ماضی بۆ لای مێینە ئەوە ئەو فعلە پێوەی دەلکێت تایەکی ساکن بۆ ئەوەی بزانرێت کە بکەرەکە مێیە،جا جیاوازی نیە لەوەی مێینەکە حقیقی بێ یان مجازی[3]،وەکو((قامتْ هندٌ))،وە((طلعتِ الشَّمْسُ))، بەڵام لکانی تای تأنیپ بە فعلەوە دوو حاڵەتی هەیە:حاڵەتی پەیوەست(لزوم)،وەحاڵەتی دروستی(جواز)،دواتر باسی دێ.

* * *

---

[1] ئایەتی ژمارە(١)ی،سورەتی (الانشقاق)،کورتەی ماناکەی{کاتێك کە ئاسمان لەت بوو}، إعرابەکەی:إذا/ظرف لمایستقبل من الزمان تضمَّن معنى الشرط. السماءُ/فاعل لفعل محذوف وجوباً يفسّره الفعل الذي يليه ،والتقدير(إذَا انْشَقَّتْ السَّمَاءُ انْشَقَّتْ). انشقَّتْ/فعل ماضٍ مبني على الفتح،والتاء/تاء التأنيث الساكنة لامحل لها من الاعراب،وفاعله ضمير مستتر تقديره هي. الشاهد فيها: إذَا السَّمَاءُ: السماء مرفوع بفعل محذوف وجوباً،وكل اسمٍ وقع بعد((إذا))أو ((إنْ)) الشرطية فإنه مرفوع بفعل محذوف وجوباً.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەلکێت(تای تانیث)بە فعلی ماضیەوە کاتێك فاعلەکە مێ(مؤنث)بێت،وەکو((أَبَتْ هِنْدُ الأَذَى))واتا:هند ڕێگری دەکات لەوەی ئازار درێت.

[3] مەبەست لە مؤنثی حقیقی ئەوەیە کە بکرێت نێرومێی لێك جیا بکرێتەوە،بەهۆی ڕەگەزەوە یان بەهۆی حەرفی تای خڕەوە، بەڵام مؤنثی مجازی بە هۆی ماناوبیستنەوە لە عەرەب(السماع)جیا دەکرێتەوە.

٢٣١- وَإِنَّمَا تَلْزَمُ فِعْـــلَ مُضْمَرِ مُتَّصِلٍ أَوْ مُفْهِمٍ ذَاتَ حِـرِ.[(١)]

لكاندنى(تاى تأنيث)پەيوەستە بە فعلى ماضى لەدوو كاتدا:

يەكەميان: كاتێك فعلەكە پاڵدرێ بۆ لاى جێناوێكى لكاوبۆ مێ،لەم كاتەدا جياوازى نيە لەنێوان مؤنثي حقيقى ومجازى،كەوابوو دەڵێيت((هندٌ قامتْ ، الشمس طلعتْ))،لێرەدا دروست نيە بڵێى((قام))و((طلع))،بەلاَم ئەگەر جێناوەكە سەربەخۆ بوو ئەوە تاى تأنيث نالكێ بەفعلەكەوە،وەكو((هندٌ ما قام إلا هى)).

دووەم:ئەگەر فاعلەكە ناوێكى ئاشكرا (ظاهر)بوو بۆ مؤنثى حقيقى،وەكو((قامت هندٌ))،جا ئەمەبوو مەبەست لەووتەى دانەر((مُفْهِمٍ ذَاتَ حِـرِ))،وەئەصڵى ووشەى حِرِ((حـرح))[(٢)] بووەوحەرفى كۆتاى لێ حذف كراوە.

وەفامرايەوە لە قسەى دانەر كە تاى تأنيث بۆ جگەلەم دوو شوێنە پەيوەست نيە،كەواتا ئەگەر ناوەكە ئاشكرا بووبۆ مؤنثى مجازى ئەوە دەتوانى تاى تأنيث نەلكێنى بە فعلەكەوە،دەڵێيت((طلعَ الشمسُ،وطلعتِ الشمسُ))،هەروەها ئەگەر ناوەكە (جمع)بوو،دواتر بە تفصيل باس دەكرێ.

* * *

---

[(١)] پوختەى ماناى ئەم ديرەى ئەلفيە: لكاندنى(تاى تأنيث)پەيوەستە بۆ ئەو فعلەى پاڵدرابێت بۆ لاى جێناوى لكاو، وەبۆ ئەو فعلەى فاعلەكەى مؤنثى حقيقى بێت.

[(٢)] ووشەى حرح لە زمانى عەرەبيدا واتا:داوێنى ئافرەت.

٢٣٢-وَقَدْ يُبِيحُ الفَصْلُ تَرْكَ التَّاءِ فِي نَحْوِ أَتَى القَاضِيَ بِنْتُ الوَاقِفِ.[(١)]
ئەگەر بەین کرا لە نێوان فعل وفاعلی مێینەی حقیقی بە جگە لە(إلاّ)،ئەوە دەتوانی تای تأنیث بلکێنی بە فعلەکەوەودەشتوانی حذف ی کەیت،وە باشتر وایە پێوەی بلکێ،دەڵێیت((أَتَى القَاضِيَ بِنْتُ الوَاقِفِ))،وەباشتر وایە بڵێی((اتَتْ))، وە وەکو((قامَ اليومَ هندٌ))وەباشتر وایە بڵێی((قامتْ)).

* * *

٢٣٣- والْحذف مَعْ فَصْلٍ بِإِلاَّ فُضِّلاَ كـ " مَا زَكَا إِلاَّ فَتَاةُ ابْنِ الْعَلاَ ".[(٢)]
ئەگەر بەین خرایە نێوان فعل وفاعلە مؤنثەکەی بە(إلاّ)ئەوە دروست نیە لکاندنی تا[(٣)] لای زۆربەی زانایان،کەوابوو دەڵێیت(( ما قام إلا هندٌ ، ما طلع إلا الشّمسُ))،وەدروست نیە((ما قامتْ إلا هندٌ)) ، وە(( ما طلعتْ إلا الشّمسُ)) ،بەلاّم لە شعردا هاتووە،وەکو ووتەی:
ش١٤٥/ وما بَقِيَتْ إلا الضُّلُوعُ الْجَرَاشِعُ .[(٤)]

---

[(١)] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:دروستە ورەوایە تای تأنیث نەلکێنی بە فعلەکەوە ئەگەرفعلەکە بەین(فصل)کرابوو لەگەڵ فاعلەکەدا،وەکو نموونەی((أَتَى القَاضِيَ بِنْتُ الوَاقِفِ))واتا:چوو بۆ لای دادوەر کچی وەقف کارەکە_واقف دوو واتای هەیە:١- واتا:وەستاو.٢-ئەو کەسەی شتێك وەقف دەكات ودەیکاتە خێر.

[(٢)] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: نەلکاندنی تای تأنیث بەفعلەوە لەکاتێکدا بەین خرێتە نێوان فعل وفاعلەکەی بە(إلاّ) چاکترە،وەکو نموونەی((مَا زَكَا إِلاَّ فَتَاةُ ابْنِ الْعَلاَ))واتا:پاك نەبۆتەوە جگە لە کچەکەی کوڕی عەلا.

[(٣)] واتا:لکاندنی تای تأنیث بە فعلەکەوە.

[(٤)] ماناوبەڵگەی ئەم نیو دێڕە :نەماوەتەوە لە ووشترەکەم جگە لە پەراسووی ئاووساو. بەڵگەکەی:فعلی(بَقِيَتْ)تای تأنیثی پێوە لکاوە لە کاتێکدا بەین کراوەتە نێوانی لەگەڵ فاعلەکە بە(إلاّ)،ئەمەش لای زۆربەی زانایان دروست نیە مەگەر لەشعرد.

جا قسەی دانەر ((کەفەرمووی نە لکاندن وحذف کردن چاکترە)) وای لێدەفامرێتەوە کە لکاندنیش دروست بێت،بەڵام وا نیە،چونکە ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە نە لکاندن چاکترە بەو پێیەی هاتووە لە هۆنراوەوپەخشان(النظم والنثر)،بەڵام لکاندن تەنها لە شعردا هاتووە،ئەوە ڕاست وتەواوە،بەڵام ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت نە لکاندن زۆرترە لە لکاندن ئەوە ڕاست وتەواو نیە،چونکە لکاندن زۆر کەمە.

* * *

٢٣٤-وَالْحذفُ قَدْ يَأْتِي بِلاَ فَصْلٍ وَمَعْ     ضَمِيرِ ذِي الْمَجَازِ فِي شِعْرٍ وَقَـعْ .[١]

کەم جار حذف دەکرێت تای تأنیث لەوفعلەی پاڵدراوە بۆ لای مؤنثی حقیقی بەبێ بەین لە نێوان فعل وفاعلەکە،ئەمەش زۆر کەمە،پێشەوا سیبویە گێڕاوێتیەوە((قالَ فلانةُ))، هەروەها حذف دەکرێت (تا) لە کاتێکدا فعلەکە پاڵدرابێ بۆ لای جێناوێکی مؤنثی مجازي ،ئەمەش تایبەتە بە شعر،وەکو ووتەی:

ش١٤٦/ فَلاَ مُزْنَةٌ وَدَقَتْ وَدْقَهَا     وَلاَ أَرْضَ أَبْقَلَ إِبْقَالَهَا.[٢]

* * *

٢٣٥- وَالتَّاءُ مَعْ جَمْعٍ سِوَى السَّالِمِ مِـنْ . مذكر كَالتَّاءِ مَـعْ إِحْدَى اللَّبِنْ

٢٣٦-وَالْحذف فِي نِعْمَ الْفَتَاةُ اسْتَحْسَنُوا     لأَنَّ قَصْدَ الْجِنْسِ فِيـــــهِ بَيِّنْ.[٣]

---

[١] پوختەی ماناى ئەم دێڕەى ئەلفیە: نە لکاندنی تای تأنیث بە فعلەوە بەبێ بەین کردنی فعل وفاعلەکەی لەکاتێکدا فاعلەکەش مؤنث بێت بە کەمی هاتووە، هەروەها کاتێکیش فعلەکە پاڵدرێت بۆ لای جێناوی مؤنثی مجازی لە شعردا.

[٢] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: هیچ هەورێك بارانی نەبارانیوە وەکو بارانی ئەو، وە هیچ زەوییەك نەیڕواندووە وەکو ڕواندنی ئەو. بەڵگەکەی(( وَلاَ أَرْضَ أَبْقَلَ))فعلی ابقل پاڵدراوە بۆ لای جێناوێکی نادیارو تای تأنیثی پێوە نەلکاوە.

[٣] پوختەی ماناى ئەم دوودێڕەی ئەلفیە: ٢٣٥-حوکمی (تا) لەگەڵ کۆ(جمع) جگە لە جمعی مذکری سالم وەکوحوکمی(تا)وایەلەگەڵ مفردی لَبِنْ کە((لَبِنة))،واتا دەتوانی-

هەرکاتێك پاڵدرا فعل بۆ لای ناوێکی کۆ(جمع)،ئەوە ئەو جمعە :یان جمعی مذکري سالمە،یان نا،جا ئەگەر جمعی مذکري سالم بێ ئەوە دروست نیە تای تأنیث بلکێت بە فعلەکەوە،کەوابوو دەڵێی((قامَ الزیدون))،وەدروست نیە بڵێی((قامتْ))،بەلاّم ئەگەر جمعي مذکري سالم نەبوو_بەوەی کە جمعی تکسیر بێ بۆ نێر وەکو(الرجال))،یان بۆ مێ وەکو((هنود))،یان جمعی مۆنثی سالم بێ وەکو((الهندات))_ئەوە دەتوانی تای پێوە بلکێنی ودەشتوانی پێوەی نەلکێنی،کەوابوو دەڵێی((قامَ الرجالُ وقامتِ الرجالُ وقام الهُنُودُ وقامتِ الهنودُ وقامَ الهِنْداتُ وقامتِ الهنداتُ))،کاتێك تای پێوە بێ ئەوە بە((جماعە))لێك دەدرێتەوە،وەکاتێك تای پێوە نەبێ ئەوە بە((جمع))لێکدەدرێتەوە.

هەروەها ئاماژەی کردبە ووتەی((کَالتَّاءِ مَـعْ إِحْدَى اللَّبِنْ))بۆ ئەوەی کە لکاندنی تا لەگەڵ جمعی تکسیروجمعی مۆنثدا وەکو لکاندنی تا وایە لەگەڵ ناوی مۆنثی ئاشکرا(ظاهر)ی مجازی وەکو ناوی((لَبِنَة))[1]،جا هەروەك چۆن دەڵێی((کُسِرَتِ اللبنةُ، وکُسِرَ اللبنةُ)) دەڵێی(( قامَ الرجالُ وقامتِ الرجالُ))،هەروەها بۆ هەموو ئەو نموونانەی تر کە باسکران.

هەروەها ئاماژەی کرد بەووتەی((وَالْحذف فی نِعْمَ الْفَتَاةُ))تا کۆتای دێرەکە،بۆئەوەی کە دروستە لە فعلی((نعم))وهاوشێوەکانی[2]_کاتێ فاعلەکەی مۆنث بێت_تای پێوە بلکێنی وپێوەی نەلکێ،هەرچەندە فاعلەکە

---

-تای پێوە کەیت ودەتوانی حذف ی کەیت.٢٣٦-هەروەها حذف کردنی تا لە وێنەی((نِعْمَ الْفَتَاةُ)) بە جوان دانراوە،چونکە لێرەدا مەبەست ڕەگەز(جنس)ە ومەبەست کەسێکی دیاری کراو نیە.

[1] ووشەی((لَبِنة))واتا:خشت ،جا ئەم ووشەیە مۆنثیی مجازییە چونکە نێرومێی نیە.

[2] واتا:افعالی مدح وذم کە بریتین لە{نِعمَ وحبّذا_بۆ مدح_، وە بئسَ ولاحبّذا_بۆ ذم_} .

حقیقیش بێ،کەوابوو دەڵێی((نِعْمَ المرأةُ هندٌ ، ونِعْمَتِ المرأةُ هندٌ))،جا ئەمە بۆیە دروستە چونکە فاعلەکە مەبەست پێی لە خۆگرتن وگشتگیری هەموو ڕەگەزە(استغراق الجنس)،بۆیە حوکمەکەی وەکو جمعی تکسیر وایە لە ڕووی لکاندن ونەلکاندنی( تا)،چونکە لە جمعی تکسیر دەچێ لەوەی کە مەبەست پێی یەك کەس نیە بەڵکو مەبەست پێی چەندکەسێکە،وەمەبەست لە ووتەی((اسْتَحْسَنُوا))ئەوەیە کە نەلکاندنی تا لێرەو هاوشێوەکانی[1] جوان ودروستە،بەڵام لکاندنی تا جوانترە.

* * *

***بنەڕەت( أصل ) لە فاعلدا ئەوەیە ڕاستەوخۆ لە دوای فعلەوە بێ**

٢٣٧–وَالأَصْلُ فى الفَاعِلِ أَنْ يَتَّصِلاَ وَالأَصْلُ فى الْمَفْعُولِ أَنْ يَنْفَصِلاَ

٢٣٨–وَقَدْ يُجَاءُ بِخِلاَفِ الأَصْـــلِ وَقَدْ يَجِى الْمَفْعُولُ قَبْلَ الفِعْـــلِ.[2]

ئەصل وبنەڕەت لە فاعلدا ئەوەیە ڕاستەوخۆ لەدوای فعلەکەیەوە بێ وهیچ شتێك نەکەوێتە نێوانیان،چونکە فاعل وەکو بەشێك لە فعلەکەیە،بۆیە کۆتای فعل زەنەدار(ساکن)دەکرێ بۆ فاعل کاتێك فاعلەکە جێناوی لکاوبێ بۆکەسی یەکەم((متکلم))بێ،یان بۆ کەسی دووەم((مخاطب)) بێ، وەکو((ضَرَبْتُ ، وضَرَبْتَ))،جابۆیە کۆتای فعل زەنەدار(ساکن)کراوە لێرەدا چونکە پێیان جوان نەبووەوناشیرینە چوار حەرفی بزواو(متحرك)بە دوای

[1] واتا: لە فعلی نِعْمَ وهاوشێوەکانی.

[2] پوختەی مانای ئەم دوودێڕەی ئەلفیە:٢٣٧–بنەڕەت لە فاعل ئەوەیە ڕاستەوخۆ بەدوای فعلەکەیدا بێ،وە بنەڕەت لە مفعول ئەوەیە ڕاستەوخۆ بە دوای فعلەکەیدا نایات. ٢٣٨–وە هەندێ جار بە پێچەوانەوەی ئەم بنەڕەتەوە دێت_واتا مفعول پێش فاعل دەکەوێ_، وە هەندێ جاریش مفعول پێش فعلەکەی دەکەوێت.

یەکدا بیٚ،ئەم یاسایەش[1] لە ئەصلدا بۆکاتێکە لە یەك ووشەدا بێت،کەواتە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە فعل وفاعلەکە وەکو یەك ووشە وان.

هەروەها ئەصل لە مفعولدا ئەوەیە ڕاستەوخۆ لەدوای فعلەوە نەیات:بەڵکو بکەوێتە دوای فاعلەوە،وەدروستە مفعول پێش فاعل کەوێت ئەگەر خالی بێت لەوەی کە لەمەودوا باسی دەکات،کەواتا دەڵێی((ضَربَ زیداً عمرٌو))،ئەمەبوو مەبەست لە ووتەی((وَقَدْ یُجَاءُ بِخِلاَفِ الأَصْلِ)).

هەروەها ئاماژەی کرد بە ووتەی((وَقَدْ یَجِی الْمَفْعُولُ قَبْلَ الفِعْلِ)) بۆ ئەوەی کە مفعول هەندیٚ جار پێش فعل دەکەوێت،ئەمەش دوو جۆرە:

یەکەمیان:پێویست(واجب)ـە پێش کەوتنی،ئەمەش کاتیٚ کە مفعولەکە اسمی شرط[2] بێت،وەکو((أیّاً تَضربْ أضربْ))،یان اسمی استفهام بێت،وەکو((أيَّ رجلٍ ضربْتَ؟))،یان جێناوی سەربەخۆ((ضمیر منفصل)) بێت ئەگەر پێش نەکەویٚ دەبێتە لکاو،وەکو﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾،لێرەدا ئەگەر مفعولەکە[3] دواکەوێت دەبێت ببێتە جێناوی لکاو،دەبێت بوتریٚ((نَعْبُدُكَ))،بۆیە پێویستە پێشکەوێت،بەپێچەوانەی((الدرهمُ إیّاهُ أعطیتُك))لێرەدا پێویست نیە پێشکەوتنی((إیّاهُ))چونکە ئەگەر دواکەوێت ئەوە دروستە سەربەخۆ بێت ودروستیشە لکاو بێت،بەو شێوەی باسکرا لە بابەتی جێناوەکان((المضمرات))[4]،ووتمان دەتوانی بڵێی(( الدرهم

---

[1] واتا:ئەوەی چوار حەرفی بزواو(متحرك) نابێت بە دوای یەکدا بیٚ.

[2] واتا ئەو ناوانەی کە بۆ مەرج بەکار دێن،کە ئەمانەن{ مَنْ، ما، مَهْمَا، ايُّ، اينَ، انّى، حَيْثُما، مَتى، إذا، كيْفَما}،جا ئەم ناوانە هەموویان مبنین،جگە لە((ايُّ)).

[3] واتا: إِيَّاكَ.

[4] لەشەرح وڕاڤەی دێڕی ژمارە((٦٤و٦٥))ی ئەلفیەدا باسمان کرد.

اعطیتکه ، واعطیتك إیاه)). دووەمیان:ئەوەیە کە دروستە پێشکەوێت ودروستیشە پێشنەکەوێت،وەکو
((ضربَ زیدٌ عمراً)) وەدەتوانی بڵێی((عمراً ضربَ زیدٌ))

* * *

### *باسی ئەو شوێنەی کە دروست نیە مفعول پێشکەوێت..

٢٣٩- وَأَخِّرِ الْمَفْعُولَ إِنْ لَبْسٌ حُذِرْ     أَوْ أُضْمِرَ الْفَاعِلُ غَيْرَ مُنْحَصِرْ.[١]

پێویستە پێشخستنی فاعل بە سەر مفعول دا کاتێك ترسی لێ تێك چوون هەبوولەگەڵ یەکتردا،وەك ئەوەی إعرابیان نادیار بوو،وەهیچ بەڵگەیەك نەبوو بۆ ڕوون کردنەوەی فاعل لە مفعول،وەکو((ضَرَبَ مُوسى عیسى))لێرەدا پێویستە ((موسى)) فاعل بێت و((عیسى))مفعول بێت،ئەمەش بۆچوونی زۆرینەی زانایانە،بەڵام هەندێ لە زانایان لەم کاتەشدا بە دروستی دەزانن پێشکەوتنی مفعول،بەڵگەشیان ئەوەیە کە عەرەب مەبەستیان هەیە لە لێتێك چوون هەروەکو چۆن مەبەستیان هەیە لە ڕوونکردنەوە.[٢]

بەڵام لە کاتێکدا بەڵگە هەبوو لەسەر جیاکردنەوەی فاعلەکە لە مفعولەکە ئەوە دروستە پێشخستنی مفعولەکەودواخستنی،کەوابوو دەڵێی((اکلَ موسى الكُمَّثرَى ،اکلَ الكُمَّثرَى موسى ))[٣]،ئەمەبوو مانای ووتەی((وَأَخِّرِ الْمَفْعُولَ إِنْ لَبْسٌ حُذِرْ)).

---

[١] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:دوا بخە مفعول کاتێك ترسی لێ تێك چوون هەبوو،هەروەها ئەگەر فاعل جێناو بوو وەحصر نەکرابوو._دواتر باسی حصر دەکەین إنشاءالله_.

[٢] ئەم بۆچوونە لاوازە،چونکە ئەصل لە قسەدا ئەوەیە ڕوون وئاشکرا بێت.

[٣] ووشەی((الكُمَّثرَى))واتا:هەرمێ، لە ئەحمەدیدا دەڵێ: (عُرموط وكُمّثرى)هەرمـــێ ( فرس)ئەسپە چ نێر چ مێ.

هەروەها واتای ووتەی((أَوْ أُضْمِرَ الْفَاعِلُ غَيْرَ مُنْحَصِرْ)) ئەوەیەکەپێویستە پێشکەوتنی فاعل ودواکەوتنی مفعول ئەگەر فاعلەکە جێناوێکی حصر[1] کراو نەبوو،وەکو((ضربْتُ زيداً))،بەلاٌم ئەگەر جێناوەکە حصرکراوبوو ئەوە پێویستە دوابکەوێت ومفعولەکە پێشکەوێت،وەکو((ما ضربَ زيداً الاّ أنا)).

* * *

٢٤٠- وَمَــا بِإلاَّ أَوْ بِإِنَّمَا انْحَصَرْ    أَخِّرْ وَقَدْ يَسْبِقُ إِنْ قَصْدٌ ظَهَر.[2]

دانــەر دەفــەرموێ:ئەگــەر فاعـل یــان مفعــول حــصر کرێــت بــە ((إلاّ))یــان ((إنّمَا))[3]،ئەوە پێویستە دوا کەوێت،وە هەندێ جاریش فاعل یان مفعولی حصرکراو پێش حصر نەکراو دەکەوێت،ئەگەر حصرکراو دیارو ئاشکرا بێ،ئەمەش کاتێك حصرەکە بە((إلاّ))بێت،بەلاٌم ئەگەر حصرەکە بە(( إنّما)) بێــت ئــەوە دروســت نیــە حــصرکراو پــێش کەوێت،چــونکە حــصر بــە((إنّمــا))کاتێــك دەردەکــەوێت دواکەوتبێت،بەپێــچەوانەی حــصرکراو بە((إلاّ))کـە دەناسـرێتەوە بـەوەی کـە لـەدوای((إلاّ))ـەوە دێت،کـەواتا پـێش کەوێت یان نا دەناسرێتەوە.

---

[1] مەبەست لە حصر:کورت هەڵهێنانی حوکمەکەیە لەو شتەدا ولادانێتی لە غەیری خۆی.

[2] پوختەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:ئەوەی بەهۆی((إلاّ))یان((إنّمَا))ـەوە حصر کرابێت_ جا حصرکراوەکە فاعل بێت یان مفعول بێت_ئەوە پێویستە دوابکەوێت، وەهەندێ جار پێش دەکەوێت ئەگەر ماناومەبەستەکە ڕوون ودیار بێت.

[3] لەزمانی عەرەبیدا حصر کردن بە پێنج شت دەکرێت:{١- إلاّ کە نفی لەپێشیەوە هەبێ،٢- إنّمَا،٣-عطف کردن بە حەرفی((لا وبل))،٤-پێش خستنی معمول ،٥-پێناسەکردن(التعريف)ی هەردوو بەشەکەی ڕستە.} ،دیارە بەزۆری ((إلاّ))و((إنّمَا)) بەکار دێت.

جا نموونەی فاعلی حصرکراو بە((إنّما))ووتەت((إنّما ضربَ عمراً زیدٌ))[1]،وەنموونەی مفعولی حصرکراو بە((إنّما))(( إنما ضربَ زیدٌ عمراً))[2]،وەنموونەی فاعلی حصرکراو بە((إلاّ))((ما ضربَ عمراً إلا زیدٌ))، وەنموونەی مفعولی حصرکراو بە((إلاّ))((ما ضربَ زیدٌ إلا عمراً))، هەروەها نموونەی پێشکەوتنی فاعلی حصرکراو بە((إلاّ))ووتەت((ما ضربَ إلا عمروٌ زیداً))،وە وەکو ووتەی:

ش١٤٧/فَلَمْ يَدْرِ إلا اللهُ ما هَيَّجَتْ لَنَا عَشِيَّةَ آنَاءُ الدِّيَارِ وَشَامُهَا.[3]

وەنموونەی پێشکەوتنی مفعولی حصرکراوبە((إلاّ))(( ما ضربَ إلا عمراً زیدٌ))،وە وەکو ووتەی:

ش١٤٨/ تَزَوَّدْتُ مِن لَيْلَى بِتَكْلِيمِ سَاعَةٍ فَمَا زَادَ إلا ضِعْفَ ما بِي كَلاَمُهَا.[4]

ئەمە بوو ماناو واتای قسەی دانەر، جا بزانە کە حصرکراو بە((إنّما)) هیچ ڕاجیای نیە لەدروستی پێش کەوتنی،بەلاّم حصرکراو بە((إلاّ))،سێ بۆچوون وڕای تێدایە:

یەکەمیان:-کە بۆچوونی زۆرینەی بەصرێکان،وپێشەوا فەڕاو(ابن الانباری)ـە_دەڵێن حصرکراو بە((إلاّ))بەدەر نیە لەوەی کە فاعلە یان

---

[1] واتا: تەنها زید لە عەمری داوە.

[2] واتا: زید تەنها لە عەمری داوە.

[3] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: تەنها خوا دەزانێ چەندێ کەیف خۆش بووین،ئەو ئێوارەی کە بردمانە سەر لە نزیك شوێنەوار ونیشانەکانی ماڵی خۆشەویست. بەڵگەکەی(( فَلَمْ يَدْرِ إلا اللهُ....))لێرەدا فاعلی حصرکراو بە((إلاّ))ی پێش خستووە بەسەر مفعولەکەدا.

[4] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕەش: تێربووم لە لیلی بە قسەکردنی ساعاتێك ،بەلاّم قسەکردنەکەی تەنها لاوازییەکەمی زیادکرد. بەڵگەکەی:(( فَمَا زَادَ إلا ضِعْفَ ما بِي كَلاَمُهَا))،مفعولی حصرکراو پێش کەوتووە.

مفعولە،جا ئەگەر فاعل بێت ئەوە دروست نیە پێشکەوێت،کەوابوو دروست نیە بڵێی((ما ضَرَبَ إلّا زیدٌ عَمراً))،وە ووتەی شاعریش :( فَلَمْ یَدْرِ إلا اللهُ ما هَیَّجَتْ لَنَا)[1]،تأویل وراڤە دەکرێت بەوەی کە((ما هَیَّجَتْ))مفعولە[2] بۆ فعلێکی محذوف،وتقدیرەکەی((دَرَی ما هَیَّجَتْ))،کەواتا فاعلی حصرکراو پێش مفعولەکە نەکەوتووە،چونکە((ما هَیَّجَتْ))نەبۆتە مفعول بۆ ئەو فعلەی باسکراوە، بەلاّم ئەگەر حصرکراو بە((إلاّ))مفعول بێت ئەوە دروستە پێشکەوێت، وەکو((ما ضربَ إلا عمراً زیدٌ)).

دووەم:_کە بۆچوونی پێشەوا کساییە_کە پێی وایە حصرکراو بە((إلاّ)) دروستە پێشکەوێت فاعل بێت یان مفعول بێت.

سێیەم:_کە بۆچوونی هەندێ لە بەصرێکانە،ورای هەڵبژێراوی هەر یەك لە پێشەوا جزولی وشەلەوبینە_کە پێیان وای حصرکراو بە((إلاّ)) دروست نیەپێشکەوێت فاعل بێت یان مفعول بێت.

* * *

٢٤١- وشَاعَ نَحْوُ ((خَافَ رَبَّهُ عُمَرْ)) وَشَذَّ نَحْوُ ((زَانَ نَوْرُهُ الشَّجَر)).[3]

واتا: زۆرە لە زمانی عەرەبیدا پێشکەوتنی مفعولێك کە لە خۆی گرتبێ جێناوێك کە دەگەرێتەوە بۆ فاعلێك کە دوا کەوتووە،ئەمەش وەکو((خَافَ

---

[1] لە شاهدی ژمارە ١٤٧ئاماژەکان پێکرد.

[2] دیارە ((ما))موصولەیە ولە محلی نصبدا مفعولە،إعرابی تەواوی دێرەکە لە کتێبەکەدا کراوە.

[3] کورتەی مانای ئەم دێرەی ئەلفیە:زۆرە لە زمانی عەرەبیدا وێنەی رستەی((خَافَ رَبَّهُ عُمَرْ)واتا:پێشکەوتنی مفعولێك کە جێناوێکی پێوە لکا بێت وبگەرێتەوە بۆ فاعل، بەلاّم زۆرکەمە هاو شێوەی رستەی((زَانَ نَوْرُهُ الشَّجَر))واتا:لکاندنی جێناوێك بە فاعلەوە کە دەگەرێتەوە بۆ مفعولەکە.

رَبَّـهُ عُمَـرُ))،لێـرەدا ((رَبَّـهُ))مفعولە،ولـەخۆی گرتـووە جێناوێـك دەگەڕێتـەوە بۆ((عُمَرُ))کە فاعلە،جا ئەمە بۆیە دروستە_هەرچەندە گەڕانەوەی جێناوی تێدایە بۆ دوای خۆی لە لفظ دا[1]_،لەبەر
ئەوەی فاعل لە بنەڕەتدا لەپێشەوەی مفعولە،کەواتا لە پلەدا لـە پێشەوەیە هەرچەندە لە لفظدا لە دواوەیە.
جا ئەگەر مفعولەکە لـە خۆی گرتبوو جێناوێك کە دەگەڕایەوە بۆ ناوێکی لکاو بە فاعلەوە،ئایا لەم کاتەدا دروستە مفعول پێش فاعل کەوێت؟لەمەدا ڕاجیـای هەیە،ئەمـەش وەکـو((ضَـربَ غلامَهَـا جَـارُ هنـدٍ))[2]،جائەوانـەی بەدروستی دەزانن_ئەمیش ڕاستە_بەڵگەیان ئەوەیە دەڵێن مادام جێناوەکە دەگەڕێتـەوە بۆ نـاوێکی لکـاو بـە شـتێکەوە کـە پلەکـەی لەپێشەوەیە وەکـو ئـەوە وایـە بگەڕێتـەوە بـۆ شـتەکە خۆی،چـونکە لکـاو بەوشـتەی پلەکـەی لەپێشە وەکو خۆی وایە.
وە ووتەی دانەر((وَشَذَّ_تا کۆتای دێڕەکە))واتا شاذوکەمە گەڕانەوەی جێنـاوی لکـاو بــە فــاعلی پێــشکەوتووبۆمفعولی دوا کەوتوو،ئەمــەش وەکــو((زَانَ نَــوْرُهُ الـشَّجَر))[3]لێـرەدا جێنـاوی(هـا)ـی لکـاو بـە((نَـوْرُه))_کـە فاعلـە_دەگەڕێتـەوە بۆ((الشَّجَر))کە مفعولـە،جا ئەمە بۆیـە شـاذە چونکە گەڕانـەوەی جێنـاوی تێدایـە بۆ شـتێك کـە لەدواوەیـە لـە پلـەولفظـدا،لەبـەر ئـەوەی((الـشجر))مفعولە،ولـە لفـظدا لەدواوەیە،وە لە بنەڕتدا مفعول دەبێت ڕاستەوخۆ لە دوای فعلەوە نەیات بەڵکو فاعل بکەوێتە نێوانیان،هەروەها لە پلە(رُتبة)شدا لەدواوەیە،جا ئەم بابەتە لای زۆرینەی نحوزانـان دروسـت نیە،وەئەگـەر شـتێکی وا هـاتبێ لـە زمـانی عەرەبیـدا تـأویلی

---

[1] پێشتر لە شەرح وراقەی دێری ژمارە(١٣٣)ـی ئەلفیە باسمان کرد کە جێناو دەبێت بگەڕێتەوە بۆ ناوی پێش خۆی.
[2] واتا: دراوسێکەی ماڵی هند لە منداڵەکەی هندی داوە.
[3] واتا:جوانە گوڵی سپی درەختەکە ،ووشەی((نَوْرُ))واتا: گوڵی سپی.

دەکەن،بەلاَم لای هەر یەك لە پێشەوا (ابوعبدالله الطوال)لە کوفێکان،و(ابو الفتح بن جنی)دروستە،ودانەریش هاوڕایانە،نموونەی ئەوەی کە هاتووە لەعەرەبەوە ووتەی:

ش١٤٩/ لَمَّا رَأَى طَالِبُوهُ مُصْعَباً ذُعِرُوا     وَكَادَ لَوْ سَاعَدَ الْمَقْدُورُ يَنْتَصِرُ.[1]

وە وەکو ووتەی:

ش١٥٠/كَسَا حِلْمُهُ ذَا الحِلْمِ أَثْوَابَ سُؤْدَدٍ     ورَقَّى نَدَاهُ ذَا النَّدَى فِى ذُرَى الْمَجْدِ.[2]

هەروەها وەکو ووتەی:

ش١٥١/ وَلَوْ أَنَّ مَجْداً أَخْلَدَ الدَّهْرَ وَاحِدا     مِنَ النَّاسِ أَبْقَى مَجْدُهُ الدَّهْرَ مُطْعِمَا .[3]

وە وەکو ووتەی:

ش١٥٢/ جَزَى رَبُّهُ عَنِّى عَدِيَّ بنَ حاتِمٍ     جَـزَاءَ الكِلاَبِ العَاوِيَاتِ وقَدْ فَعَلْ.[4]

---

[1] ماناو بەلگەی ئەم دێرە: کاتێ کە دوژمنانی مُصعبی کوڕی زوبەیر_ڕەزای خوایان لیّ بیّ_مصعبیان بینی ترسان،وەنزیك بوو گەر یارمەتی دەری هەبوایە سەرکەوێت. بەلگەکەی((رَأَى طَالِبُوهُ مُصْعَباً))لێرەدا فاعل جێناوێکی پێوە لکاوە دەگەڕێتەوە بۆ مفعول لەکاتێکدا مفعولەکە لەدواوەیە لە پلەولفظدا،ئەمەش لای هەندی زانا دروستە وەکو باسمان کرد.

[2] ماناو بەلگەی ئەم دێرەش:پۆشی هێدیی ولەسەرخۆی بە خاوەنەکەی پۆشاکی گەورەی وشکۆیی،وە بەرزی کردەوە سەخاوەت وپیاوەتی خاوەنەکەی بە چلەپۆپە ی گەورەیی. بەلگەکەی (( كَسَا حِلْمُهُ ذَا الحِلْمِ ،وە ورَقَّى نَدَاهُ ذَا النَّدَى ))، لەهەردوو ڕستەکەدا فاعل جێناوێکی پێوە لکاوە دەگەڕێتەوە بۆ مفعول لەکاتێکدا مفعولەکە لەدواوەیە لە پلەولفظدا،ئەمەش لای هەندێ لە زانایان دروستە وەکو باسمان کرد.

[3] ماناو بەلگەی ئەم دێرە:ئەگەر پیاوەتی وچاکەکردن کەسێکی بهێلاَیەتەوە لە ژیاندا ئەوە مُطعمی کوڕی عدی دەبوو،واتا کەس نەمر نیە هەرچەندە چاکەکار بێت لەگەلّ خەلّکیدا. بەلگەکەی((أَبْقَى مَجْدُهُ الدَّهْرَ مُطْعِمَا)) لێرەدا فاعل جێناوێکی پێوە لکاوە دەگەڕێتەوە بۆ مفعول لەکاتێکدا مفعولەکە لەدواوەیە لە پلەولفظدا.

[4] ماناو بەلگەی ئەم دێرە:یاخوا خوا پادشتی عدی کوڕی حاتم بداتەوە لە بری من،وەکو پاداشتی سەگە هارەکان،وەبێگومان پادشتی دایەوە. بەلگەکەی((جَزَى رَبُّهُ عَنِّى عَدِيَّ ..)) لێرەدا فاعل جێناوێکی پێوە لکاوە دەگەڕێتەوە بۆ مفعول لەکاتێکدا مفعولەکە لەدواوەیە لە پلەولفظدا.

وه وەکو ووتەی:

ش١٥٣/ جَزَى بَنُوهُ أَبَا الغِيلاَنِ عنْ كِـــبَرٍ    وَحُسْنِ فِعْـــــلٍ كَمَا يُجْزَى سِنِمَّارُ[1]

بەڵام ئەگەر جێناوە لکاوەکە بە فاعلە پێشکەوتووەکەوە دەگەڕایەوە بۆ شتێکی لکاو بە مفعولەکەوە ئەوە دروست نیە،وەکو((ضَربَ بعلُها صاحبَ هندٍ))،جا هەندێ لە زانایان دەربارەی ئەمەش ڕاجیاییان گێڕاوەتەوە،بەڵام ڕاست وایە دروست نیە.

*لێرەدا باسی فاعل کۆتایی هات.

[1] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش: پاداشتیان دایەوە نەوەکانی باوکی غیلان لە پیریدا ولە بری چاکە کردنی هەروەکو پاداشتی سنمّار_دەڵێن سنمّار پیاوێکی ڕۆمی لێزان بووە لە بیناسازیداو کۆشکێکی گەورە بۆ پادشای حیرە دروست دەکات ودوای تەواو بوونی کۆشکەکە پادشا لەسەری کۆشکەکەوە دەیخاتە خوارەوەودەمرێت بۆ ئەوەی کۆشکی وا بۆ کەسی تر دروست نەکات،جا ئەمە کراوەتە مەسەل بۆ هەرکەسێك بە خراپی پاداشتی درێتەوە. بەڵگەکەی((جَزَىَ بَنُوهُ أَبَا الغِيلاَنِ...))وەکو دێڕەکانی پێشوو تر وایە.

# النائب عن الفاعل[1]

٢٤٢-يَنُوبُ مَفْعُولٌ بِهِ عَنْ فَاعِـلِ        فِيمَا لَهُ كَنِيلَ خَيْـــرُ نَائِلِ.[2]

حذف دەکرێ فاعل و مفعولیش لە جێی دادەنیشێ ،ئەو کات دەیدرێتێ ئەو حوکم وبڕیارانەی بۆ فاعل هەیە:لەوەی کە پێویستە مرفوع بێت،وە لەدوای عاملەکەیەوە بێ،وە دروست نیە حذف کرێ،ئەمەش وەکو((نِيـلَ خَيـــرُ نَائِلِ))لێرەدا خيرُنائلِ:مفعولەولەجێی فاعل دانیشتووە،وەئەصڵی ڕستەکە((نالَ زيدٌ خيرَ نَائِلٍ))فاعل حذف کراوە_کە بریتیە لە((زيدٌ))_وە مفعول به لە جێی دانیشتووە_کەبریتیەلە((خيرَ نَائِلٍ))_وەدروستیش نیە پێشکەوێت،کەوابوو دروست نیە بڵێی((خيرَ نَائِلٍ نِيلَ))وببێتە مفعول وپێشکەوتبێ،بەڵکو لەم کاتەدا دەبێتە مبتدا،و خبرەکەشی ڕستەکەی دوای خۆیەتی_کەبریتیە لە((نِيـلَ))،وە مفعولەکەی لەجێی فاعلە جێناوێکی نادیار((مستتر))ە_وتقدیرەکەی((نِيـلَ هو))،هەروەها دروست نیە((خَيـــرُ نَائِلِ))حذف کرێت وبڵێی: نِيـلَ.

* * *

[1] مەبەست لە نائب فاعل ئەو ناوەیە کە پێشتر (مفعول به) بووەو دوای حذف کردنی فاعل لە ڕستەکەدا کراوەتە جێی فاعل،وەهەندێ لە زانایان وەکو پێشەوا سیبویە ناوی ناوە((المفعول الذي لم يُسَمَّ فاعلُه))،وە بۆیە پێی دەوترێت نائب فاعل چونکە لەجێی بکەر دانراوە، جا لە زمانی عەرەبیدا لە بەر چەند مەبەستێك فاعل حذف دەکرێت لەوانە:١-ئەگەر شتەکە زۆر دیاروزانراو بێ،وەکو((خُلِقَ الانسانُ))،٢-بکەر((فاعل))ەکە نادیارونەزانراو بێت ،وەکو((سُرِقَ البيتُ))٣-یان حەز نەکەی ناوی فاعلەکە بێنی،وەکو((قُتِلَ اللِّصُ))،وەچەند مەبەستێکی تر.

[2] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:دادەنیشێ مفعول به لە جێی فاعل،وەهەموو ئەوحوکم وبڕیارانەی هەیە بۆ فاعل بۆ ئەمیش هەیە،وەکو((نِيـلَ خَيـــرُ نَائِلِ))واتا:دەست کەوت باشترین دەستکەوت.فعلی( نِيـلَ)مبنی مجهولی(نال)یە.

## *باسی شێوەی ئەو فعلەی بکەرەکەی نادیارە

٢٤٣- فَأَوَّلَ الفِعْلِ اضْمُمَنْ وَالْمُتَّصِلْ      بِالآخِرِ اكْسِرْ فى مُضِيِّ كَوُصِلْ

٢٤٤-وَاجْعَلْهُ مِنْ مُضَــارِعٍ مُنْفَتِحَا      كَيَنْتَحِي الْمَقُولِ فِيـــهِ يُنْتَحَى.[1]

ئەو فعلەی بکەرەکەی دیارنیە هەموو کاتێ حەرفی یەکەمی بۆر((ضمة))ی هەیە بە ڕەهایی:واتا ماضی بێ یان مضارع، وە حەرفی پێش کۆتایی ژێر((کسرة))ـی هەیە لە ماضی دا،وسەر((فتحە))ـی هەیە لە مضارع. نموونەی ئەمە لە ماضیدا فعلی((وَصَلَ)):دەبێتە((وُصِلَ))،وە لە مضارع فعلی((يَنْتَحِي))دەبێتە((يُنْتَحَى)).

* * *

٢٤٥- وَالثَّانِيَ التَّالِيَ تَا الْمُطَاوَعَهْ      كالأوَّلِ اجْعَلْـهُ بِـــلاَ مُنَازَعَهْ

٢٤٦-وَثَالِثَ الَّذِي بِهَمْزِ الوَصْـلِ      كَالأَوَّلِ اجْعَلَنَّـــهُ كَاسْتُحْلِي.[2]

ئەگەر فعلی بکەر نادیار بە (تا)ـی مطاوعة[3] دەستی پێکرد ئەوە حەرفی یەکەم ودووەمی بۆر((ضمة))ی هەیە،ئەمەش وەکو ووتەت لە فعلی((تَدَحْرَجَ)): تُدُحْرِجَ))،وە لەفعلی((تَكَسَّرَ)):(( تُكُسِّرَ))،وە لە فعلی((تَغَافَلَ)):(( تُغُوفِلَ)).

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٤٣/حەرفی یەکەمی فعلەکە_واتا ئەو فعلەی بکەرنادیارە_ضمةی بۆدانا،وە حەرفی پێش کۆتای کەسرە داربکە لە ماضیدا وەکو ((وُصِلَ)). ٢٤٤/بەڵام حەرفی پێش کۆتای لە مضارعدا مفتوح بکە وەکو فعلی(( يَنْتَحِي)) کە_مبني معلومة_ئەکەر بکرێتە بکەر نادیار دەوترێ((يُنْتَحَى))واتا:داتاشرا.

[2] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٤٥/هەروەها حەرفی دووەمیش کە بەدوای(تای مطاوعة)_مەبەست پێی ئەم سێ وزنەیە{ تفعللَ،تَفَعَّلَ،تفاعلَ }_وەکو حەرفی یەکەم وایە واتا:بۆر((ضمة))ەی هەیە بەبێ ڕاجیای. ٢٤٦/ هەروەها حەرفی سێیەمی ئەو فعلەی بە همزەی وصل دەست پێدەکات وەکو حەرفی یەکەم وایە واتا بۆر((ضمة))ـی هەیە وەکوفعلی((اسْتُحْلِيَ)).

[3]ووشەی(( مطاوعة))لە ڕێزمانی عەرەبیدا واتا:دەرکەوتنی شوێنەواری فعلەکە لە فاعلەکەدا،جا ئەو فعلانەی بۆ مطاوعة بەکار دێن وبە حەرفی(تا)دەست پێدەکەن سیانن{ تفعللَ،تَفَعَّلَ،تفاعلَ } .

هەروەها ئەگەر فعلەكە بە همزەی وصل دەستی پێكرد ئەوە حەرفی یەكەم وسێیەمی بۆر((ضـمة))ی هەیە،ئەمەش وەكو ووتەت لە فعلی((اسْتَحْلَى)) ((اُسْتُحْلِيَ))،وەلە فعلی((اقْتَدَرَ))((اقْتُدِرَ))،وەلەفعلی((انْطَلَقَ ))((انْطُلِقَ)).

* * *

٢٤٧- وَاكْسِرْ أَوِ اشْمِمْ فَا ثُلاَثِيِّ أُعِلّ    عَيْناً وَضَمٌّ جَا كَ" بُوعَ" فَاحْتُمِلْ.[1]

ئەگەر فعلی بكەر نادیار سێ حەرفی (ثلاثي) بوو وە حەرفی دووەمی بزوێن(معتل)بوو كە پێی دەوترێت(معتل العین)،ئەوە بیستراوە لە خوێندنەوە حەرفی یەكەمی(فاءالفعل) سێ شێوە:

١- كسرەی تەواو:وەكو((قِيلَ و بِيعَ))،وە وەكو ووتەی:

ش١٥٤/ حِيكَتْ عَلَى نِيرَيْنِ إِذْ تُحَاكُ    تَخْتَبِطُ الشَّـــوْكَ ولا تُشَاكُ.[2]

٢-ضمه ی تەواو،وەكو((قُولَ و بُوعَ))،وە وەكو ووتەی:

ش١٥٥/ لَيْتَ وَهَلْ يَنْفَعُ شَيْئاً لَيْتُ    لَيْتَ شَبَاباً بُوعَ فَاشْتَرَيْتُ.[3]

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەگەر ئەو فعلەسێ حەرفییەی(ثلاثي) دەیكەینە بكەر نادیار حەرفی دووەمی بزوێن(معتل)بوو كە پێی دەوترێت(معتل العین)،ئەوە حەرفی یەكەمی(فاءالفعل)بە سێ شێوە دەخوێنرێتەوە:١-بەكسرە تەواو.٢-یان بە إشمام واتا نەكسرەی تەواو ونە ((ضمة))ى تەواو.٣-بە ((ضمة))ى تەواو.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە:ئەوعەبایە دووراوە بە تەواوی وجوانی كاتێ كە دووراوە،بۆیە دڕكی بەر دەكەوێ ودڕك ناگرێ. بەڵگەكەی: ((حِيكَتْ))فعلێكی ثلاثيةومعتل العينە وئەصلەكەی(حاك)یەوكاتێ كراوە بە بكەر نادیار حەرفی یەكەمی كسرەی تەواوی وەرگرتووە.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕەش: خۆزگە،جا ئایە خۆزگە هیچ سوودێكی هەیە؟ خۆزگە لاوێتی بفرۆشرایە وكڕیبام. بەڵگەكەی:((بُوعَ)) فعلێكی ثلاثية ومعتل العينە وئەصلەكەی(باع)یەوكاتێ كراوە بە بكەر نادیار حەرفی یەكەمی ضمه ی تەواوی وەرگرتووە.

ئەمەش[1] خوێندنەوەی هەر یەك لە نەوەی دەبیر ونەوەی فقعەسە{كە هەردوكیان لە زمان پاراوەكانی نەوەی ئەسەدن}.

٣-إشمام[2]كردن_بریتیە لەخوێندنەوەی (فاء الفعل)ـەكە بە حەرەكەیەك لە نێوان ضمە وكسرە_ئەمەش تەنها لە خوێندنەوە دەردەكەوێت ،ولەنووسین دەرناكەوێت،وە خوێندراوەتەوە لە خوێندنەوەی حەوت قورئان خوێنەكە((القراء السبعە))فەرموودەی خوای گەورە﴿ وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ﴾[3].

٢٤٨- وَإِنْ بِشَكْلٍ خِيفَ لَبْسٌ يُجْتَنَبْ     وَمَا لِبَاعَ قَــدْ يُرَى لِنَحْوِ حَبّ.[4]

---

[1] واتا:خوێندنەوەی بە ضمە ی تەواو.

[2] ووشەی الاشمام لای نەحوییەكان وقورئان خوێنەكان بریتیە لەوەی دنگێكی زمانەوانی بە تارمایی دەنگێكی تر ڕەنگ بگریێ ،وە بەلای زانایانی تەجویدەوە بریتیە لەوەی بە دولێو بە سكون ئاماژە بكرێ بۆ بزوێنە بۆرێك لە كۆتای وشە لەسەر ڕاوەستاوەكە بەبێ ئەوەی دەنگی بۆرە (ضمە)كە ببیسترێ.

[3] بەشێكە لە ئایەتی ژمارە(٤٤)ی سورەتی(هود)، پوختەی ماناكەی{پاشان ووترا ئەی زەوی ئاوەكەت هەڵمژە ،وئەی ئاسمان باران مەبارێنە،ئیتر لافاوەكە ڕۆچوو بەناخی زەویدا كارەكە تەواو بوو_مەبەست لافاوەكەی قەومی نوح پێغەمبەرە_علیە السلام_}.إعرابەكەی: وقيلَ/و:حسب ماقبلها. قيلَ/فعل ماضٍ مبني للمجهول،ونائب فاعله ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره((هو)). يا/حرف نداء .ارضُ/منادى نكرة مقصودة مبني على الضم. ابلعي/ فعل امر مبني على حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة ،والياء/ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل .ماءَ/مفعول به،وهو مضاف ، كِ/ضمير متصل مبني في محل جر مضاف إليه. ويا/و:حرف عطف. يا:حرف نداء. سماءُ/ إعرابه مثل ارضُ. واقلعي/مثل ابلعي. وغِيضَ/و:حرف عطف ،غيض:فعل ماضٍ مبني للمجهول. الماءُ/نائب فاعل مرفوع. الشاهد فيها ((قِيلَ و غِيضَ))،حيث قرئا بالاشمام وهو الاتيان بالحركة بين الضم والكسر،ولايظهر ذلك في الخط،بل يظهر في اللفظ فقط.

[4] كورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەگەر خوێندنەوەی( فاءالفعل)بەیەكێ لەو سێ شێوانەی باسكرا ببێتە هۆی لێ تێكچوون ئەوە خۆیی لێ دوور دەگیرێ، وە ئەو سێ-

هەرکاتێ فعلێکی ثلاثی معتل العین_دوای ئەوەی دەکرێتە بکەر نادیار_ پاڵدرا بۆ لای جێناوێکی لکاوی کەسی یەکەم((متکلم))،یان کەسی دووەم((مخاطب))،یان کەسی سێیەم((غائب))،ئەوە ئەو فعلە یان (واو)یە یان (یاء)یە.[١]

جائەگەر فعلەکە واوی بێ_وەکو((سام))کەلە((السوم))ـەوە[٢]_ئەوە واجبە لای دانەر_حەرفی((فا))کە بە مکسوری یان بە اشمام بخوێنرێتەوەکەوابوو دەڵێیت((سِمْتُ))،وەدروست نیە بە ضمە کە تەواو بخوێنرێتەوە،کەوابوو ناڵێیت((سُمْتُ))،بۆ ئەوەی لەگەڵ فعلی بکەر دیارا تێکەڵاو نەبێ،چونکە ئەگەر بە ضمە بخوێنرێتەوە ئەوە دەبێتە بکەردیار،وەکو((سُمْتُ العبْدَ))[٣].

بەڵام ئەگەر فعلە ثلاثیەکە(یائی)بێت_وەکو((باع))کەلە((البیع))ـەوە وەرگیراوە_ئەوە واجبە لای دانەر_ حەرفی((فا))کە بە مضمومی یان بە اشمام بخوێنرێتەوەکەوابوودەڵێیت((بُعْتَ یاعبْدُ))[٤]،وەدروست نیە بە کسرەی تەواو بخوێنرێتەوە، کەوابوو ناڵێیت((بِعْتَ))،بۆ ئەوەی لەگەڵ فعلی بکەر دیاردا تێکەڵاو نەبێ،چونکە ئەگەر بە کسرە بخوێنرێتەوە ئەوە دەبێتە بکەردیار،وەکو((بِعْتُ الثوبَ)). ئەمە بوو مانای وتەی دانەر((وَإِنْ بِشَکْلٍ خِیفَ لَبْسٌ یُجْتَنَبْ))واتا:ئەگەر بەشێوەیەك لەو شێوانەی باسکران_مەبەستم ضمە ی تەواو،وکسرە تەواو،واشمام کردن_ ترسی لێ

-شێوە خوێندنەوەی هەیە بۆ فعلی(باع) بۆ فعلی((حَبَّ))وهاوشێوەکانی_کە بریتیە لە هەموو فعلێکی ثلاثي مضاعف_دروستە.

[١] واتا:عین الفعل یان حەرفی واوە یان یایە.

[٢] فعلی ((سام،یسومُ))بەم مانایانە دێت:{بەرەو پێش ڕۆیشتن، خێرای با، کارەکەی خستە ئەستۆی، رانواندن((عرض))ی کاڵاو شت ومەك، ئازاد کردنی کۆیلە...هتد}.

[٣] واتا:کۆیلەکەم ئازاد کرد.

[٤] واتا:فرۆشرای بەندەکەم.

تێکچوون هەبوو ئەوە لادەدەین بۆ شێوەیەکی تر لە شێوەکان کە لێ تێکچوونی نەبێ.

ئەمە بۆچوونی دانەر بوو،بەلأم جگە لە دانەر فەرموویانە خوێندنەوەی((فا))بە مکسوری لە فعلی(واو)ی،بە مضمومی لە فعلی(یاء)ی،وە اشمام کردن ،ئەمە قسەی هەڵبژێراوە،بەلأم واجب نیە،بەڵکو دروستە لە واویدا بە ضمە،ولە یایدا بە کسرە بخوێنرێتەوە.

وە مانای ووتەی دانەر((وَمَا لِبَاعَ قَـدْ يُرَى لِنَحْوِ حَبّ))واتا :ئەوەی کە هەبوو بۆ ((فاءالفعل))لە فعلی((باع))_کە بریتی بوو لە دروستی خوێندنەوەی بە ضمە ي تەواو،وکسرەی تەواو،واشمام کردن_جێگیر دەبێ بۆ((فاءالفعل))لە فعلی مضاعف[1] ،وەکو نموونەی ((حَبَّ))،دەڵێیت(( حُبَّ))، و((حِبَّ))، وەدەتوانی اشمامی بکەی.[2]

* * *

٢٤٩- وَمَا لِفَا بَاعَ لِمَا العَيْنُ تَلِـي فِي اخْتَارَ وَانْقَادَ وَشِبْهٍ يَنْجَلِي.[3]

---

[1] فعلی مضاعف لە زمانی عەرەبیدا بەو فعلە دەوترێت کە ((عین الفعل ولام الفعل))ەکەی واتا پیتی دووەم وسێیەمی لەیەك بن ،وەکو{ردّ ،مدّ ،عدّ...}،ووشەی مضاعف واتا دووبارە،ئەمە ئەگەر فعلەکە ثلاثی بێت ،بەلأم ئەگەر چوارپیتی(الرباعی) بێت ئەوە ئەو فعلەیە کە پیتی یەکەم وسێیەمی،وە پیتی دووەم وچوارەمی لەیەك بن،وەکو{زَلْزَلَ ،رَفْرَفَ ،صَرْصَرَ...} .

[2] پێشتر مانای اشمامان کرد،کە بریتی بوو لە خوێندنەوە بەشێوەیەك نە کسرەی تەواو بێت وەنە ضمە ی تەواو،ئەم شێوەیە لە هەندێ ووشەوبەکارهێنانی خەڵکی گەرمیانی خۆمان بەکار دێت.

[3] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەوەی کە باسکرا_ لە سێ شێوە خوێندنەوە_ بۆ حەرف (فا)لە فعلی (باع)جێگیر دەبێ بۆ ئەو حەرفەی لەدوای(عین الفعل)ی فعلی(اختار وانقاد)وهاوشێوەکانیان_واتا ئەو فعلەی لەسەر وزنی افتعل وانفعل بێت و((عین الفعل))ەکەی حەرفی بزوێن((علە))بێ_ .

واتا: جێگیر دەبێ_لەکاتی بکەر نادیاری_بۆ ئەو حەرفەی لەدوای (عین الفعل)ـی ئەوفعلانەی لەسەر وزنی((افْتَعَلَ))یان((انْفَعَلَ))دێن_و(عین الفعل)ـەکەی حەرفێ بزوێن بێت_ئەوەی کە جێگیر بوو بۆ((فاء الفعل))لە فعلی((باع))لەدروستێتی خوێندنەوەی بە ضمە ی تەواو،وکسرەی تەواو،ئەمەش وەکو((اخْتَارَ، وَانْقَادَ))وهاوشێوەکانیان،کەواتا دروستە لە خوێندنەوەی حەرفێ((تا وقاف))[1] سێ شێوە: ضمة ی تەواو،وەکو((واُخْتُور))و((اُنْقُودَ))،وەکسرەی تەواووەکو((اخْتِيرَ)) و((انْقِيدَ))،وە اشمام کردن ،جا لە کاتی اشمام کردندا همزەکە حەرەکەی حەرفێ((تا وقاف))ـەکە وەردەگرێ.

---

[1] مەبەست :((تا))ـی اختار و((قاف))ـی انقاد یە.

***باسی ئەو شتانەی دەگونجێن بۆ (نائب فاعل)،یان جۆرەکانی نائب فاعل**

**٢٥٠-وَقَابِلٌ مِنْ ظرفٍ أَوْ مِنْ مَصْدَرِ أَوْ حَــــرْفِ جَرّ بِنِيَابَةٍ حَرِى.[1]**

**پێشتر باسمان کرد ئەگەر فعل بکرێتە بکەر نادیار ئەوە مفعول بە لە جێی فاعل دادەنرێت،جا لەم دێڕەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەگەر لە ڕستەیەکدا مفعول نەبوو،ئەوە ظرف یان مصدر یان جارومجرور لەجێی فاعل دادەنرێن،وە بەمەرجی داناوە بۆ هەریەك لەم سیانە بەوەی بگونجێن بۆ نائب فاعلێتی،جا خۆی پاراست لەوەی ناگونجێت بۆ نائب فاعلێتی،وەکو ئەو ظرفانەی گۆڕانکارییان بە سەردا نایات مەبەست:ئەو ظرفانەیە کە پەیوەست(لازم)ـن بە منصوب بوون[2]،وەکو((سحر))[3]،ئەگەر مەبەست**

---

[1] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: (نائب فاعل)ێتی وەردەگرێ هەریەك لە ئاوەڵفەرمان((ظرف))،وچاووگ((مصدر))،وجارومجرور،بەمەرجێ بگونجێن بۆ بوون بە نائب فاعلێتی.

[2] ظرف لەزمانی عەرەبیدا لەڕووی دەرچوونیان لە ظرفیەت وبوون بەفاعل یان مفعول یان شتێکی تر،وەدەرنەچوونیان دوو جۆرن:

١-((غیر متصرف))مەبەست ئەو ظرفانەیە کە تەنها بەظرفیەت بوون بەکاردێن ونابن بە شتێکی تر ،وەکو ئەوەی ببنە فاعل یان مفعول، ئەمیش دوو جۆری هەیە:

ا/ جۆرێکیان تەنها لەمحلی نصبی ظرفیەت دان ،ئەوانیش وەکو{قَطُّ، عوضُ ،إذا ،سحرُ} ،ئەمانەش دروست نیە مجروربن بە حەرف جەری((مِنْ)) .

ب/جۆری دووەمیان دەکرێ مجرور بن بە حەرف جەری((مِنْ))،وە دەکرێ لەمحلی نصبی ظرفیەت دابن،ئەمانیش وەکو{عِنْدَ ،ثَمَّ}.

٢-((متصرف))،واتا ئەوظرفانەی گۆڕانیان بەسەردا دێت و بە پێی عامل لەڕستەدا دەگۆڕێن، ئەمانیش بریتین لە{زمن ،وقت ،ساعة ، یوم ،دهر ،حین ،}.

[3] ووشەی((سحر)) کە بەواتای:کازیوەوسپێدەی بەیان دێ ، بە دوو شێوە بەکاردێ:١-ئەگەر مەبەست ڕۆژێکی دیاری کراو بێت ئەوە دەبێتە ظرفێکی غیر متصرف وتنوین وکسرە وەرناگرێت. ٢-وەئەگەر مەبەست پێی ڕۆژێك بێت-

ڕۆژێکی دیاری کراو،وه وەکو((عندك))،کەوابوو دروست نیە بڵێی((جُلِسَ عِنْدَكَ))،وه دروست نیە بڵێی((رُكِبَ سَحَرُ))،بۆ ئەوەی دەرنەچێ ئەم دووانە[1] لەوەی کە جێگیر بووە بۆیان لەزمانی عەرەبیدا لەوەی کە پەیوەستن بە منصوب بوون بە ظرفیەت، هەروەها وەکو ئەو ئەو مصدەرانەی گۆڕانیان بەسەردا نایات،وەکو((مَعَاذَ اللهِ))،کەوابوو دروست نیە((مَعَاذ اللهِ ))مرفوع کرێ،لەبەر ئەو هۆیەی بۆ ظرف باسمان کرد[2]،هەروەها ئەو ووشانەی کە سوودومانایان نیە:لە ظرف ومصدر وجارومجرور دروست نیە بکرێنە نائب فاعل،کەوابوو دروست نیە بڵێی((سِيْرَ وقتٌ))وه((ضُرِبَ ضَرْبٌ))وه((جُلِسَ فِي دارٍ))،چونکە مانایان نیە. جانموونەی ئەوەی کە گونجاوە ببێتە نائب فاعل لەوانەی باسکران،ووتەت((سِيْرَ يومُ الجمعةِ، وضُرِبَ ضَرْبٌ شديدٌ، ومُرَّ بِزيدٍ)).

* * *

٢٥١_وَلاَ يَنُوبُ بَعْضُ هَذِي إِنْ وُجِدْ   فِي اللَّفْظِ مَفْعُولٌ بِهِ وَقَدْ يَرِدْ.[3]

بۆچوونی بەصرێکان _جگە لە پێشەوا ئەخفەش_وایە ئەگەر فعل کرایە بکەر نادیار ولەڕستەکەدا ومفعول به،ومصدر،وظرف،وجارومجرور،هەبوو ئەوە پێویستە مفعول بە لەجێی فاعل دانرێت،کەوابوو دەڵێی: ضُرِب زيدٌ

---

وديارێکراو نەبێت ئەوە متصرفە و تنوين وكسرەش وەردەگرێ. جا لێرەدا مەبەست پێی جۆری یەکەمەو نابێتە نائب فاعل.

[1] واتا: سحر ،وعندك.

[2] ئەوەی کە ووترا هەندێ ووشە هەیە لەزمانی عەرەبیدا بە یەك جۆر وبۆ یەك شت بەکاردێن وهەوڵدرێت لەو شتە دەرنەکرێن.

[3] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: نابنە نائب فاعل ئەوانەی باسکران _، واتا: ((ظرف))،و ((مصدر))،وجارومجرور_ئەگەر لەڕستەکەدا مفعول بە هەبوو،وە دەکرێ بە کەمی ببێت.

ضرباً شديداً يومَ الجمعةِ أمامَ الأميرِ في دارِه)) وەدروست نیە جگە لە مفعول بە لەجێی فاعل دانرێت لەكاتێكدا مفعول بە هەبێ،وە ئەوەی هاتووە بەوشێوەیە ئەوە یان ڕیزپەڕ((شاذ))ە یان ((تأويل)) كراوە.

وە بۆچوونی كوفێكان وایە كە دروستە جگە لەمفعول بە لە جێی فاعل دانرێت،هەرچەندە مفعول بە هەبێ:جا ئەو مفعولە پێشكەوتبێ یان دوا كەوتبێ،كەوابوو دەڵێی((ضُرِبَ ضَرْبٌ شديدٌ زيداً ،و ضُرِبَ زيداً ضَرْبٌ شديدٌ))،هەروەها بۆ ئەوانی تریش ،وە بەڵگەیان هێناوەتەوە بە خوێندنەوەی((أبی جعفر))[1]:بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە﴿لِيُجْزى قَوْماً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[2]،وە وەكو ووتەی شاعر

ش١٥٦/ لَمْ يُعْنَ بِالْعَلْيَاءِ إِلاَّ سَيِّداً وَلاَ شَفَى ذَا الغَيِّ إِلاَّ ذُو هُدَى.[3]

---

[1] یەكێكە لە دە قورئان خوێنەكە((القرّاء العشرة))، و پێشەوای قورئان خوێنانی مەدینەی منوّرە بووە،ویەكێكە لە شوێنكەوتووان((التابعين))،ساڵی ١٣٢ك،كۆچی دوای كردووە.

[2] بەشێكە لەئایەتی ژمارە(١٤)ی،سورەتی(الجاثية)،كورتەی ماناكەی { بۆ ئەوەی پاداشتی خەڵكانێ بدرێتەوە بە گوێرەی ئەوەی كردوویانە}،إعرابەكەی: لـ/ حرف تعليل .يُجزى/ فعل مضارع للمجهول منصوب بـ(أن)مضمرة جوازاً بعد اللام، وعلامة نصبه الفتحة المقدرة على الألف للتعذر، قوماً/مفعول به منصوب.بما/جارومجرور متعلقان بـ(يجزى)،مبني في محل رفع نائب فاعل. كانوا/ كان:فعل ماضي ناقص مبني على الضم لاتصاله بواو الجماعة .والواو/ضمير متصل مبني في محل رفع اسم كان .يكسبون/فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه ثبوت النون لأنه من الأفعال الخمسة،والواو:في محل رفع فاعل ،والجملة الفعلية((يكسبون)) في محل نصب خبر كان،وجملة((كانوا يكسبون)) لامحل لها من الاعراب لأنه صلة الموصول. الشاهد فيها :((ليُجزى))بصيغة المجهول على قراءة ابي جعفر،وهو دليل مذهب الكوفيين على انه يجوز إقامة غير المفعول به مقام الفاعل مع وجود المفعول.

[3] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە : تەنها كەسانی گەورە بایەخ دەدەن بە گەورەیی وشكۆیی،وە تەنها خاوەن ڕێنمایی دەتوانێ چارەسەری گومڕا بكات. بەڵگەكەی ((لَمْ يُعْنَ بِالْعَلْيَاءِ...))لێرەدا جارومجرور بووە بە نائب فاعل،لەكاتێكدا لە ڕستەكە مفعول هەیە كە((سَيِّداً)).

وه بۆ چوونى پێشەوا ئەخفەش[١]،وایه كه ئەگەر جگه له مفعول به لەڕستەكەدا پێش مفعولەكه كەوت ئەوه هەر كامێكیانت بوێ دروسته بكرێته نائب فاعل،كەوابوو دەڵێی: ضُرِبَ في الدار زيدٌ،وه ضُرِبَ في الدار زيداً ،بەڵام ئەگەر پێش نەكەوت ئەوه پێویسته تەنها مفعول به ببێته نائب فاعل،وەكو((ضُرِبَ زيدٌ في الدار))وەدروست نيه بڵێی((ضُرِبَ زيداً في الدار)).

* * *

٢٥٢- وَبِاتِّفَاقٍ قَدْ يَنُوبُ الثَّانِ مِنْ    بَابِ كَسَا فِيمَا الْتِبَاسُهُ أُمِنْ.[٢]

هەركاتێ فعلى تێپەڕ بۆ دوو مفعول كرا به بكەر نادیار:ئەوه یان له بابى((أعطى))یه،وه یان له بابى((ظنّ))یه[٣]،جا ئەگەر لەبابى((أعطى))بوو_كه مەبەستى ئەم دێڕەیه_ئەوه دانەر ووتى كه دروسته مفعولى یەكەم ببێته نائب فاعل وه دروسته مفعولى دووەم ببێت به یەكدەنگى زانایان،كەوابوو دەڵێی((كُسِيَ زيدٌ جُبَّةً، وأُعْطِيَ عمرٌو درهماً))، وه دەتوانى مفعولى دووەم بكەیته نائب فاعل،دەڵێی((أُعْطِيَ عمراً درهمٌ ،و كُسِيَ زيداً جُبَّةٌ)).

---

[١] كەواتا سێ بۆچوون هەیه دەربارەى ئەوەى كه ئایه دروسته جگه له مفعول به ببێته نائب فاعل .

[٢] پوختەى ماناى ئەم دێڕەى ئەلفیه:به یەكدەنگى زانایان دروسته مفعول به دووەم له بابى فعلى((كسا))_واتا:ئەو دوو مفعولەى له ئەصڵدا مبتداوخبر نین_ببێته نائب فاعل، بەمەرجێ دڵنیا بین له تێك گیران وتێكەڵ بوون .

[٣] جیاوازییان ئەوەیه بابى((أعطى))،دوو مفعولەكەى له بنەڕەتدا مبتداوخبر نین واتا ڕستەى تەواو نین، بەڵام دوو مفعولەكه له بابى((ظنّ)) له بنەڕەتدا مبتداوخبرن وڕستەى تەواون.

ئەمە بە مەرجێك لیّ تێکچوون((الالتباس)) دروست نەبیّ بە دانانی مفعولی دووەم،جا ئەگەر لیّ تێکچوون دروست بوو ئەوە پێویستە مفعولی یەکەم ببێتە نائب فاعل،ئەمەش وەکو((أعطیتُ زیداً عمراً))لێرەدا پێویستە مفعولی یەکەم ببێتە نائب فاعل ،کەوابوو دەڵێی((أُعطِيَ زيدٌ عمراً))،وەدروست نیە مفعولی دووەم ببێتە نائب فاعل،بۆ ئەوەی لیّ تێکچوون ڕوونەدات،چونکە هەریەك لە زید وعەمر دەگونجێن بۆ ئەوەی وەرگر((آخِذ))بن، بەپێچەوانەی مفعولی یەکەم.

جا دانەر یەکدەنگی زانایانی نەقل کرد لەسەر ئەوەی کەدروستە مفعولی دووەم ببێتە نائب فاعل ئەگەر ترسی لیّ تێکچوون نەبێت،جا ئەگەر مەبەستی یەکدەنگی هەموو زانایانی نحوبێت ئەوە جوان نیە،چونکە بۆچوونی کوفێکان وایە هەرکاتێك مفعولی یەکەم ناسراو((معرفە))بیّ،ومفعولی دووەم نەناسراو((نکرە))بیّ ئەوە پێویستە مفعولی یەکەم ببێتە نائب فاعل،کەوابوو دەڵێی((أُعْطِيَ زيدٌ درهماً))،وەدروست نیە لای کوفێکان دووەم ببێتە نائب فاعل،کەوابوو ناڵێیت((أُعْطِيَ درهمٌ زيداً)).

* * *

٢٥٣-فِی بَابِ ظَنَّ وَأَرَى الْمَنْعُ اشْتَهَرْ وَلاَ أَرَى مَنْعاً إِذَا الْقَصْدُ ظَهَرْ.[1]

واتا ئەگەر ئەو فعلەی کە پێویستی بە دوو مفعولە مفعولی دووەمی لەبنەڕەتدا خبر بیّ،وەکو فعلی((ظَنَّ))وهاوشێوەکانی،یان ئەگەر پێویستی

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:لەو فعلانەی کە دوو یان سیّ مفعولیان هەیەومفعولی دووەم یان سێیەم لە ئەصلدا خبرە ،ئەوانیش بریتین لە مفعولەکانی((ظَنَّ وَأَرَى))،وا باوە کەدروست نیە مفعولی دووەم یان سێیەم ببنە نائب فاعل،بەلاّم من_واتا ابن مالك_بە نادروست وناڕەوای نازانم ئەگەر ماناو مەبەست دیارو ئاشکرا بیّ.

بە سێ مفعول بوو وەکو فعلی((أرَی))وهاوشێوەکانی،ڕای زۆربەی لای نحوزانان ئەوەیە کە پێویستە مفعولی یەکەم ببێتە نائب فاعل،وە نابێت مفعولی دووەم لە بابی((ظَنَّ))و مفعولی دووەم یان سێیەم لە بابی((أعلمُ))،ببێتە نائب فاعل،کەوابوو دەڵێی((ظُنَّ زیدٌ قائماً))وەدروست نیە بڵێی((ظُنَّ زیداً قائمٌ))،هەروەها دەڵێی((أُعْلِمَ زیدٌ فرسَك مُسْرَجاً))[1]وە دروست نیە .مفعولی دووەم ببێتە نائب فاعل،کەواتا ناڵێی((أُعْلِمَ زیداً فرسُك مسرجاً))،هەروەها مفعولی سێیەمیش دروست نیە،کەواتا ناڵێی((أُعْلِمَ زیداً فرسَك مُسْرَجٌ))،وە پێشەوا((ابن ابي الربیع))یەکدەنگی زانایانی نەقڵ کردووە لە نادروستێتی دانانی مفعولی سێیەم لەجێی فاعل،هەروەها کوڕی دانەریش[2]،ئەم یەکدەنگییەی نەقڵکردووە.

بەڵام هەندێ لەزانایان_لەوانە دانەر_پێیان وایە مەرج نیە تەنها مفعولی یەکەم ببێتە نائب فاعل،نەلە بابی((ظَنَّ))ونەلە بابی((أعلمُ))،بەڵام بەمەرجی لێ تێکچوون ڕوونەدات،کەوابوو دەڵێی((ظُنَّ زیداً قائمٌ ،و أُعْلِمَ زیداً فرسُك مسرجاً)).

بەڵام دانیشتنی مفعولی سێیەم لە بابی((أعلمُ))ئەوە هەر یەك لە ابن أبی الربیع وکوڕی دانەر یەکدەنگی زانایانیان نەقڵ کردووە لەسەر نادروستێتی، بەڵام وا نیە،چونکە جگە لەوان ڕاجیایی((الخلاف))یان نەقڵ کردووە لەم بارەوە،کەوابوو((أُعْلِمَ زیداً فرسَك مُسْرَجٌ)).

جائەگەر لێ تێکچوون دروست بێت ئەوە پێویستە مفعولی یەکەم ببێتە نائب فاعل لە بابی((ظَنَّ ،واعلمُ))،کەوابوو دەڵێن دروست نیە بڵێی(( ظُنَّ

---

[1] واتا:بە زید ڕاگەیەندرا ئەسپەکەت زین کراوە.

[2] واتا:کوڕی ابن مالك،کە ناوی ((بدر الدین محمد بن محمد بن مالك))،وساڵی ٦٨٦ك کۆچی دوای کردووە،وئەلفیەکەی باوکی شەرح کردووە بەناوی((شرح ابن الناظم علی الفیة ابن مالك))،چاپ کراوە.

زيداً عمرٌو))ومەبەست ئەوە بێت کە((عمرٌو))مفعولی دووەم بێت،هەروەها دروست نیە((أُعلِمَ زيداً خالدٌ منطلقاً)).

* * *

٢٥٤- وَمَا سِوَى النَّائِبِ مِمَّا عُلِّقَا بِالرَّافِـعِ النَّصْبُ لَهُ مُحَقَّقَا.[1]

حوكمی ئەو مفعولەی لە جێی فاعل دادەنیشێ وەکو حوکمی فاعل وایە،جا هەروەکو چۆن فعل تەنها یەك فاعل مرفوع دەکات،بەهەمان شێوە فعلی بکەر نادیاریش یەك مفعول مرفوع دەکات،جا ئەگەر فعلێك دوو مفعولی هەبوو ئەوە یەکێکیان لە جێی فاعل دادەنیشێ،وئەوی تر بە منصوبی دەمێنێتەوە،کەوابوو دەڵێی(( أُعطيَ زيدٌ درهمًا ،وأُعْلمَ زيدٌ عمرًا قائمًا، وضُرِبَ زيدٌ ضرباً شديداً يومَ الجمعةِ أمامَ الأميرِ في دارِه)).

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەڵفیە:جگە لەو مفعولەی کە دەبێتە نائب فاعل ومرفوع دەبێ ،ئەوانی تر بە منصوبی دەمێننەوە.

## اشتغال العامل عن المعمول [1]

٢٥٥- إنْ مُضْمَرُ اسْمٍ سَابِقٍ فِعْلاً شَغَلْ عَنْهُ بِنَصْبِ لَفْظِهِ أَوِ الْمحَلّ

٢٥٦- فَالسَّابِقَ انْصِبْهُ بِفِعْلٍ أُضْمِرَا حَتْماً مُوَافِقٍ لِمَا قَدْ أُظْهِرَا. [2]

اشتغال:بریتیە لەوەی ناوێك پێشکەوێت ،وفعلەکەی دوا کەوێت،وئەو فعلە عەمەلی کردبێ لە جێناوی ئەو ناوە یان شتێك کە پەیوەندی بەو ناوەوە هەبێ_ئەویش بریتیە لە ناوێك کە إضافە کرابێ بۆ لای جێناوی ناوەکە_،جا نموونەی ئەو فعلەی عەمەلی کردبێ لە جێناوەکە((زیداً ضربْتُهُ، وزیداً مَرَرْتُ بِهِ))،وەنموونەی ئەو ناوەی پەیوەندی بە ناوە پێشکەوتووەکەوە هەبێ((زیداً ضَرَبْتُ غلامَهُ))،ئەمەیە مەبەست لەووتەی دانەر((إنْ مُضْمَرُ اسْمٍ-تاکۆتای دێرەکە))،تقدیری قسەکە: ئەگەر جێناوی ناوی پێش فعلەکە فعلەکەی سەرقاڵ کرد لە ئیش کردن لەو ناوەی پێش

---

[1] ووشەی اشتغال لە زمانی عەرەبیدا واتا:سەرقاڵ بوون وخۆخەریك کردن، وە لە زانستی نحودا_وەکو دواتر ڕوونیش دەبێتەوە_بریتیە لەوەی ناوێك پێشکەوێت وعاملەکەی واتا فعلەکەی دواکەوێت وئەو عامله سەرقاڵ بووبێ بە عەمەل کردن لە جێناوی ئەو ناوەی پێشکەوتووە،وەکو((محمّداً علّمتُه))،لێرەدا ((محمداً))ناوەکەیە وپێشکەوتووە وفعلی((علّمتُ))عاملەکەیەو عەمەلی لە جێناوی((هُ))کردووە. جاهەموو ڕستەیەك کە اشتغالی تێدا بێت سێ پایە((ارکان))ی هەیە:

١-مشغول عنهُ:کەبریتیە لەناوەکەی پێشکەوتووە،وەکو((محمداً))لەڕستەکەی پێشوودا.

٢-مشغول: کەبریتیە لە فعلەکە،وەکو فعلی((علّمتُ)).

٣-مشغول به: کەبریتیە لە جێناوەکەی لکاوە بە فعلەکەوە.

[2] کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە :٢٥٥-ئەگەر جێناوی ناوێك کە پێش عاملەکەی کەوتبێت عاملەکەی سەرقاڵ کرد بە خۆیەوە بە ((لفظ))ەکەی یان بە محلەکەی. ٢٥٦- ئەوە ناوی یەکەم((مشغول عنه))منصوب بکە بە فعلێکی شاراوەونادیار،کە هاوواتاو هاوشێوەی فعلە((مشغول))ەکە بێت.

خۆی وخەریکی کرد بەئیش کردن لە جێناوەکەی بەوەی لە لفظدا منصوبی کردبێ وەکو((زیداً ضربْتُهُ))یان لە محلدا منصوبی کردبێ ،وەکو((زیداً مَرَرْتُ بِهِ))[1]، لێرەدا هەر یەك لە((ضَرَبْتُ،و مَرَرْتُ))خەریك بوون بە جێناوی((زید))،بەڵام((ضَرَبْتُ))ڕاستەوخۆ لکاوە بە جێناوەکەوە وپێویست بە شتێك نیە کە بیگەیێنێتە جێناوەکە،وە((مَرَرْتُ))ڕاستەخۆ نەلکاوە بە جێناوەکەوە بەڵکو بەهۆی حرفی جەڕەوە گەشتووە پێی،کەواتا لە لفظدا مجرورە بەڵام لە محلدا منصوبە،هەروەها هەریەك لە((ضَرَبْتُ،و مَرَرْتُ)) ئەگەر عەمەلیان لەجێناوەکە نەکردایە ئەوە عەمەلیان لە ((زیداً))دەکرد،ئەو کات دەتوت ((زیداً ضربْتُ))و((زیداً))منصوب دەبێ بە فعلەکە هەروەکو چۆن جێناوەکەی منصوب دەکرد،هەروەها دەتوت((مَرَرْتُ بزیدٍ))،فعلەکە بەهۆی حەرفی جەری(بـ) گەشتۆتە زید،هەروەکو چۆن گەشتووە بەجێناوەکە،ولەم کاتەدا لە لفظدا مجرورە و لە محلدا منصوبە.

هەروەها وتەی دانەر((فَالسَّابِقَ انْصِبْهُ_تاکۆتای))واتا ئەگەر حاڵەتی وا هەبوو ناو وفعلێك بەو شێوە بوون کە باسکرا،ئەوە دەتوانی ناوەکەی پێشکەوتووە منصوبی بکەی، بەڵام نحوزانان ڕایان جیایە لەو شتەی منصوبی کردووە:

زۆربەی زانایان پێیان وایە کە عامل((ناصبە))کەی فعلێکی نادیارە بە واجبی[2]{چونکە دروست نیە کۆکردنەوەی ڕاڤەکراو((المُفَسَّر))، وڕاڤەکارەکە((المُفَسِّر))،وەدەبێ ئەو فعلە نادیارە هاوشێوەی فعلە دیارەکە بێ،چا

---

[1] مەبەست ئەوەیە فعل یان ڕاستەوخۆ مفعول بە هەیە،کەفعلی تێپەڕ((متعدی))ە، یان مفعول بە ناڕاستەوخۆ((غیر الصریح))ی هەیە کە جارومجرورە ولەمحلی نصبدا دەبێتە مفعول بە ((غیرالصریح))،ئەمەش بۆ ئەو فعلەیە کەلە بنەڕەتدا تێنەپەڕ ((لازم))ە.

[2] واتا:دروست نیە ئەو فعلە ئاشکرا بێ وباسکرێ.

ئـەم هاوشـێوە بوونـە هاوشـێوەبوونی لفـظ ومانـا دەگرێتـەوە،وەکو وتـەت((زیـداً ضـربْتُهُ)):تقدیرەکـەی((ضَـرَبْتُ زیـداً ضـربْتُهُ))،هـەروەها هاوشێوەبوونی مانـا بـەبێ لفظیش دەگرێتـەوە،وەکو وتـەت((زیـداً مَـرَرْتُ بِـهِ)):تقدیرەکـەی((جاوزتُ زیـداً مررتُ بِهِ))،ئەمە ئەوە بوو کە دانەرباسی کرد.

بۆچوونی دووەم:پێی وایە منصوبە [1] بەوفعلەی لەدوایەوە هاتووە،ئەمەش بۆچـوونی کوفێکانە،ئـەمانیش ڕایـان جیایە،هەنـدێکیان دەڵـێن:فعلەکـە عەمــەلی کــردووە لــە جێناوەکەولــە ناوەکــە،جاکاتێك دەڵێــی((زیــداً ضــربْتُهُ))،ئــەوە فعلــی((ضَــرَبْتُ)) عەمــەلی لــە ((زیــداً))ولــەجێناوەی ((هــا))کــردووەو هــەردووکیانی منــصوب کردووە،ئــەم بۆچــوونەش ڕەددراوەتــەوە بــەوەی یــەك عامـل نابێـت لەیـەك كاتـدا عەمـەل لـە ناوێـك وجێناوەکەی بکات ، وەهەندێکی تریان دەڵێن:فعلەکە عەمەلی لە ناوەکەی پــێش خــۆی کردووە،وجێناوەکــەش هەڵوەشاوەتەوەوپێویــستی بــەعامل نیە،ئەمیش ڕەددراوەتەوە بەوەی کە نـاو هەڵناوەشێتەوە کاتێك بلکێت بە عاملەکەی.

٢٥٧- وَالنَّصْبُ حَتْمٌ إنْ تَلاَ السَّابِقُ مَا   يَخْتَصُّ بِالْفِعْـــلِ كَإِنْ وَحَيْثُمَا.[2]

نحوزانــان باســی ئــەوەیان کــردووە کــە حــوکمی ئــەم بابەتــە[3] پێــنج جۆرە،یــەکێکیان:واجبــە منــصوب بێــت ،دووەمیــان:واجبــە مرفــوع بــێ ، وسێیەم:منصوب بوون ومرفوع بوونی دروستەو منصوب بوونی بەهێزترە،

---

[1] واتا:منصوبی ناوە پێشکەوتووەکە((مشغول عنه)).

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: پێویستە ناوە پێشکەوتووەکە((مشغول عنه))،منصوب بێت ئەگەر لەپێشیوە هات شتێك تایبەت بە فعل وەکو:إنْ وحیثما.

[3] واتا: ناوە پێشکەوتووەکە((مشغول عنه)).

چوارەم: منصوب بوون ومرفوع بوونی دروستەو ڕای هەڵبـژێراو ئەوەیە كە مرفوع بیٚ ، پێنجەم: منصوب بوون ومرفوع بوونی دروستە وەكو یەك.
جادانـەر ئامـاژەی كـرد بۆجـۆری یەكـەم بـە ووتـەی((وَالنَّـصْبُ حَـتْمٌ))كـە ماناكەی ئەوەیە واجبە ناوەكە منصوب كەیت ئەگەر ئەو ناوە كەوتە دوای ووشـەیەك كـە تـەنها فعـل بەدوایـدا دیٚ ،وەكـو ووشـەكانی مـەرج((ادوات الـشرط))،وەكـو: إنْ ، وحیثمـا،كـەوابوو دەڵێـی((إنْ زیـداً اكرمْتَـه اَكْرَمَـكَ ، وحیثمــا زیـــداً تَلْقَـــهُ فأكْرِمْـــهُ))لـــەم دوو نموونەوهاوشـــێوەكانیان پێویـستە((زیـداً))منـصوب بیٚ،ودروسـت نیـە مرفـوع بێـت بـەوەی مبتـدا بیٚ،چونكە ناكریٚ لەدوای ئەم ووشانەوە مبتدا بێت ،بەڵام هەنـدیٚ لـەزانایان بەدروستیان داناوە ناوی مرفوع لەدوای ئەم ووشانەوەبیٚ،كەواتا نادروست نیـە لای ئـەمان ناوەكـەی دوای ئـەم ووشـانە[1] مرفـوع بـیٚ بـەوەی ببێتـە مبتدا،وەكو ووتەی شاعر:

ش١٥٧/ لا تَجْـــزَعِي إنْ مُنْفِسٌ اَهْلَكْتُهُ    فَإذَا هَلَكْتُ فَعِنْدَ ذَلِكَ فَاجْزَعِي.[2]

تقديروڕاڤەكەی((إنْ هلكَ مُنْفِسٌ))،خوای گەورەزاناترە.

* * *

٢٥٨- وَإنْ تَلاَ السَّابِقُ مَا بِالابْتِـــدَا    يَخْتَصُّ فَالرَّفْـــعَ الْتَزِمْـــهُ أَبَـدَا
٢٥٩- كَذَا إذَا الْفِعْلُ تَلاَ مَا لَمْ يَرِدْ    مَا قَبْلُ مَعْمُولاً لِمَا بَعْـدُ وُجِدْ.[3]

---

[1] مەبەست :ووشەكانی مەرج((أدوات الشرط))ـە.

[2] ماناو بەڵگەی ئەم دێڕە: خەفەت مەخۆ ئەگەر ماڵێكی بەنرخم سەرف كردو لەناودا، ئەگەر مردم بۆ مردنم خەفەت بخۆ وغەمباربە . بەڵگەكەی: ((إنْ مُنْفِسٌ..))لێرەدا لە دوای ئەداتی شەرتەوە ناوێكی مرفوع هاتووە،ئەمەش كەمە لەزمانی عەرەبیدا.

[3] كورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٥٨-ئەگەر ناوەپێشكەوتووەكە((مشغول عنە))،كەوتە دوای ئەو شتانەی تایبەتن بە مبتدا،ئەوە پێویستە مرفوع كرێت. ٢٥٩-

ئامـاژه دهكـات دانـهر بـهم دوو دێـڕه بـۆ بهشـی دووهم،كهبریتیـه لـه مرفـوع بـوون[1] بـهواجبی،جا پێویـسته ناوهپێـشكهوتووهكه مرفـوع بێـت ئهگـهر كهوتـه دوای ئـهو شتانهی تایبـهتن بـه مبتـداوه،وهكو((إذا))ـی كتـوپڕ ((الفجائیـة))، دهڵێیـت((خرجْتُ فـإذا زیـدٌ یـضربُه عمـرٌو))بـهمرفوع كردنـی((زیـدٌ))،وه دروسـت نیـه منـصوب بیْ،چونكه((إذا))ی فجائی له دوایهوه فعل نایات نه بهئاشكرا ونه به((مقدّر))ی.

هـهروهها پێویـسته ناوهكـه مرفـوع كرێـت ئهگـهر فعلـه مـشغولهكه بكهوێتـه دوای ئـهو شـتانهی كـه دوای خۆیـان عهمـهل لهپێـشیان نهكـهن،وهكو ووشـهكانی مـهرج((أدوات الـشرط))،وپرسیاركردن((الاسـتفهام))،و((مـا))ی نافیـه،وهكو((زیـدٌ إن لقیتَـه فأكرمْه،وزیـدٌ هـل تـضربه ، وزیـدٌ مـا لقیتُـه))پێویـسته نـاوی((زیـدٌ))لـهم نموونانـهو هاوشـێوهكانیان مرفـوع بێت،وهدروست نیه منصوب كرێت،چونكه شتێك كه گونجاونـهبیْ عهمـهل لهپێش خۆی بكات ئهوه ناگونجیْ تهفسیری عاملێكی پێش خۆی بكات، بۆ ئهمـهش ئامـاژهی كـرد دانـهر بهووتـهی((كَـذَا إذَا الْفِعْـلُ تَـلاَ-تاكۆتـای دێڕهكـه)).واتـا:پێویـسته مرفـوع كرێـت نـاوه پێشكهوتووهكه ئهگـهر فعلهكـه هات بهدوای شتێكدا كه پێش خۆی نهبێته معمول بۆ دوای، جا ئهوانـهی بهدروستیان داناوه عهمهل كردنی ئهو شتهی لهدوای ئـهم ووشـانهوه[2] دێـن له پێش خۆیان،دهڵیْ((زیداً ما لقیتُ))[3]،بهدروستی دهزانـن منـصوب كرێـت لهگهڵ جێناویشدا به عاملێكی نادیار،دهڵیْ((زیداً ما لقیته)).

* * *

---

ههروهها پێویسته مرفوع كرێت ئهگهر فعلهكه_ واتا:مشغول_هات بهدوای ئهو شتانهی كه پێش خۆیان نابنه معمول بۆ دوایان.

[1] واتا:مرفوع بوونی ناوه پێشكهوتووه كه((مشغول عنه)).

[2] مهبهست له: ووشهكانی مهرج((أدوات الشرط))،وپرسیاركردن((الاستفهام))، و ((ما))ی نافیهیه.

[3] لهم نموونهیهدا ناوی((زیداً))منصوبه وعاملهكهی بریتیه له فعلی((لقیت))كه كهوتۆته دوای ((ما))ی نافیه،ئهمهش لای زۆربهی زانایان دروست نیه،بهڵام لای ههندیْ له زانایان دروسته.

٢٦٠-وَاخْتِيرَ نَصْبٌ قَبْلَ فِعْلٍ ذِي طَلَبْ          وَبَعْدَ مَا إِيلاَؤُهُ الفِعْلَ غَلَبْ
٢٦١-وَبَعْدَ عَاطِفٍ بِلا فَصْلٍ عَلَى          مَعْمُولِ فِعْــلٍ مُسْتَقِرٍّ أَوَّلاَ.[1]

ئەمە بریتیە لە بەشی سێیەم، کە ئەویش دروست بوونی مرفوع بوون ومنصوب بوونی ناوەپێشکەوتووەکەیەو منصوب بوونی هەڵبژێراوە وپەسەندە، ئەمەش ئەگەر لە دوای ناوەکەوە کردارێك هات بۆ داخوازی ((طلب))بێت_وەکو ئەمر،ونەهی،دوعا_،وەکو((زیداً اضربه ، وزیداًلا تضربه ، وزیداً رَحِمَه اللهُ))،لێرەدا دروستە ناوی((زید))مرفوع بێت ودروستیشە منصوب بێت،وقسەی هەڵبژێراوی زانایان منصوب بوونێتی.

هەروەهامنصوب کردنی هەڵبژێراوە ئەگەر ناوەکە کەوتە دوای ئەو شتانەی کە بەزۆری وان فعل بەدوایاندا بێت،وەکو هەمزەی پرسیارکردن، وەکو نموونەی((أزيداً ضرَبْتَهُ))بە منصوب کردنی ((زید))ومرفوع کردنی،وە ڕای هەڵبژاردەی زانایان منصوب کردنێتی.

هەروەهاهەڵبژێراوە منصوب کردنی ئەگەر ناوە((مشغول عنە))ـەکە کەوتە دوای حەرفە عطفێك ولە پێشیێوە جملەیەکی فعلی هاتبێ وهیچ بەینێك نەبێ لە نێوان جملەفعلیەکە_کە معطوف علیە_و اسمەکەی کە لەدوای حەرفە عطفەکەوە دێ ،وەکو((قام زیدٌ وعمراً اکرمْتُهُ))لێرەدا دروستە ناوی((عَمراً))مرفوع بێ ودروستیشە منصوب بێ،وە ڕای هەڵبژێراوئەوەیە منصوب بێ،بۆ ئەوەی جملەی فعلی عطف کرێتەوە بۆسەر جملەی فعلی، بەڵام ئەگەر بەین((فاصل))،کەوتە نێوان جملەفعلیەکە_کە معطوف علیە_و

---

[1] کورتەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٦٠-هەڵبژێراوە منصوب کردنی ناوە پێشکەوتووەکە((مشغول عنه))لەسێ کاتدا:١/ ئەگەر کەوتە پێش فعلێك کە بۆ داخوازی((الطلب))بێ،٢/هەروەها ئەگەر کەوتە دوای ئەو شتانەی بەزۆری وان لە دوایانەوە فعل دێت. ٢٦١-٣/هەروەها ئەگەر کەوتە دوای حەرفە عطفێك وبەین ((فاصل))یش نەبوو لەنێوان((معطوف علیه))_کەجملەیە_ولە نێوان اسمە معطوفەکە.

اسمەکەی کە لەدوای حەرفە عطفەکەوە،ئەوە لەم کاتەدا ناوەکە وەکو ئەوە وایە کە هیچی لە پێشەوە نەهاتبێ،وەکو((قامَ زیدٌ وأمَّا عَمرٌو فأكرمْتُهُ))لێرەدا دروستە ناوی((عمرٌو))مرفوع بێ ودروستیشە منصوب بێ،بەڵام ڕای هەڵبژاردە ئەوەیە مرفوع بێ وەکو لەمەو دوا باسی دێت، هەروەها دەڵێیت((قامَ زیدٌ وأمَّا عَمراً فأكْرِمْهُ))لێرەدا ڕای هەڵبژاردە منصوب بوونە،وەکو ڕابورد،چونکە کەوتۆتە پێش فعلێك کە بۆ داخوازیە.

* * *

٢٦٢- وَإنْ تَلاَ الْمَعْطُوفُ فِعْلاً مُخْبَرَا ‌ ‌ ‌ بِهِ عَنِ اسْــمٍ فَاعْطِفَنْ مُخَيَّرَا.[1]

ئاماژەی کرد دانەر بەووتەی((فَاعْطِفَنْ مُخَيَّرَا))،بۆ دروستێتی مرفوع کردن ومنصوب کردنی ناوەکو وەکو یەك،ئەمەش بریتیە لە بەشی پێنجەم کە پێشتر ڕابورد[2]،جا نحوزانان پێوەری ئەم جۆرەیان داناوە بەوەی کە ناوە پێشکەوتووەکە بکەوێتە دوای حەرفە عطفێك کە لەپێشێوە جملەیەك هاتبێ کە تێیدا دروست بێ مرفوع بوون ومنصوب بوون وەکو یەك،ئەم جملەیەشیان بەوە ڕاڤەکردووە:کە سەرەتاکەی ناوێك بێ،وبەشی دووەمی[3] فعل بێ،وەکو((زیدٌ قامَ وعَمراً اكرمْتُهُ))لێرەدا دروستە ناوی((عمرو))مرفوع کرێت بە ڕچاوکردن وعطف کردنەوەبۆ سەرەتای ڕستەکە((الصدر))[4]، وەدروستە منصوب کرێت بە ڕەچاوکردنی بەشی دووەمی ڕستەکە.

* * *

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە:ئەگەر ناوە عطف کراوەکە_کەمشغول عنە_کەوتە دوای فعلێك ئەو فعلە خبر بێ بۆ ناوێك ،ئەوە لەم کاتەدا مرفوع کردن ومنصوب کردنی ناوە پێشکەوتووەکە((مشغول عنە))وەکو یەکە.

[2] کە لە ڕاڤەی دێڕی(٢٥٧)ی ئەلفیە باسکرا.

[3] واتا:خبرەکەی.

[4] سەرەتای ڕستەکە بریتیە لە مبتدا کە((زیدٌ))لەو ڕستەیەدا.

٢٦٣- وَالرَّفْعُ فى غَيْرِ الَّذِى مَرَّ رَجَحْ     فَمَا أُبِيحَ افْعَلْ وَدَعْ مَـا لَمْ يُبَحْ.[١]

ئەمـە بريتيـە لـە بەشـى چـوارەم لـەوەى ڕابورد،كـە ئـەميش بريتيـە لـە دروستێتى مرفوع بوون ومنصوب بوون وڕاى هەڵبـژێراو ئەوەيە كە مرفوع كرێت،ئەمـەش:هـەموو ناوێكـە كـە شـتێك لـە وانـەى دەبنـە هـۆى منـصوب بوونى،يــان مرفــوع بوونى،يــان بــەهێزكردنى يــەكێكيانى لــە گەڵــدا نەبێ،هەروەها شتێك لەوانەى لە گەڵدا نەبێ كە دەبێتە هۆى منـصوب بوون ومرفـوع بـوونى بـە يەكـسانى،ئەمەش وەكـو((زيـدٌ ضـربْتُهُ))،لێـرەدا دروسـتە((زيـد))مرفـوع بێ،ودروستيـشە منـصوب بێ،بـەلام ڕاى هەڵبـژێراو ئەوەيــە مرفــوع بێ،لەبــەر ئــەوەى دانــەنانى شــتێكى ناديــار((عــدم الاضمار))بەهێزترە لە دانانى[٢]،وە هەنـدێ لـە زانايـان پێيان وايە دروسـت نيە منصوب بێ،چونكە منصوب كردنى دەبێتە هۆى هێنان وتقدير كردنـى شتێكى ناديار، بەلام ئەم بۆچوونە جێى بايەخ نيە، لەبەر ئەوەى پێشەوا سـيبويە وجگــە لــەويش گێڕاويانەتــەوە لــە پێــشەوايانى زمــانى عەرەبى،ئەمـەش زۆرە[٣]، ئـەوەتا پێـشەوا ئـەبو سـعادات ابـن الـشجرى لـە كتێبى((امالى))يـەكەيدا،ئەم دێڕەى هۆنيوەتەوە:

ش١٥٨/ فَارِساً ما غَادَرُوهُ مُلْحَماً     غَيْرَ زُمَّيْلٍ ولا نِكْسٍ وَكِلْ.[٤]

* * *

---

[١] پوختەى ماناى ئەم دێڕەى ئەلفيە:مرفوع كردنى ناوە پێشكەوتووەكە((مشغول عنه)) پەسەندە لە جگە لەو حاڵەتانەى باسكرا ،جا ئەوەى ڕەوايەودروستە مرفوعى بكە، وئەوەى ڕەوانيە مرفوع كرێت وازى لێ بێنە.

[٢] مەبەست ئەوەيە ئەگەر((زيد))منصوب كرێت،ئەو كات دەبێ،فعلێكى ناديار تقدير كەين بۆ ئەوەى ببێتە عاملى((زيداً)).

[٣] واتا:ئەوەى كە ناوەكە لەم حاڵەتەدا منصوب بێ.

[٤] ماناو بەڵگەى ئەم دێڕە: بەجێيان هێشت سوار چاكێك لە ناو گرمەى جەنگدا،بێ ئەوەى بترسێ ولاواز بێ وپێويستى بە كەسى تر بێ. بەڵگەكەى ((فَارِساً ما غَادَرُوهُ))لێرەدا ناوى((فارسا))منصوبە بە فعلێكى محذوف ،وهيچ بەڵگەيەكيش نيە بۆ منصوب كردنى ،ئەمەش بەڵگەى ئەوانەيە كە پێيان دروستە منصوب كردنى .

٢٦٤-وَفَصْلُ مَشْغُولٍ بِحَرْفِ جَرِّ أَوْ بِإِضَافَةٍ كَوَصْلٍ يَجْرِي.[١]

واتا هيچ جياوازييەك نيە لەو پێنچ حاڵەتەى ڕابورد[٢] لە وەى كە جێناوەكە لكابێ بە فعله((مشغول))كه،وەكو((زيدٌ ضربْتُهُ))،يان پێوەى نەلكابێ وبەين كرا بن بە هۆى حەرفى جەڕ،وەكو((زيدٌ مررتُ به))،يان بەهۆى إضافه، وەكو((زيدٌ ضربْتُ غلامَه))،يان ((غلامَ صاحبِه))،يان ((مررتُ بغلامِه))،يان ((بغلام صاحبه))،كە وابوو پێويستە منصوب بێ[٣] لە نموونەى((إنْ زيداً مررتَ به اكرمَكَ)) هەروەكو پێويست بوو منصوب بوونى لە((إنْ زيدا لقيتَه اكرمَكَ))،هەروەها پێويستە مرفوع بێ لە نموونەى((خرجْتُ فإذا زيدٌ مرَّ به عَمروٌ))،وە ڕاى هەڵبژێراو ئەوەيە منصوب بێ لە نموونەى((ازيداً مررتَ به؟))، وە ڕاى هەڵبژێراو ئەوەيەمرفوع بێ لە نموونەى((زيدٌ مررتُ به))،وە مرفوع بوون ومنصوب بوون چوون يەكن لە نموونەى((زيدٌ قامَ وعمروٌمررتُ به))،هەروەها بڕياريش وايە لە نموونەى((زيدٌ ضربْتُ غلامَه او مررتُ بغلامِه)).

* * *

٢٦٥-وَسَوِّ فِي ذَا البَابِ وَصْفاً ذَا عَمَلْ بِالْفِعْلِ إِنْ لَمْ يَكُ مَانِعٌ حَصَلْ.[٤]

واتا سيفەتى عامل لەم باسەدا وەكو فعل وايە لەو شتانەى ڕابورد،مەبەست لە سيفەتى عامل:اسمى فاعل ،واسمى مفعولە.خۆى پاراست بە سيفەتى

---

[١] پوختەى ماناى ئەم دێڕەى ئەلفيە :بەين كردنى جێناوەكە((مشغول به)) لە فعلەكە((مشغول))كە بە هۆى حەرفى جەڕ يان بە هۆى إضافه هيچ جياوازييەكى نيە لە گەڵ بەين نەكردنى نێوان جێناوەكەو فعلەكە.

[٢] لە شەرحى دێڕى(٢٥٧)ـى ئەلفيەدا باسكرا.

[٣] واتا:ناوە پێشكەوتووەكە((مشغول عنه)).

[٤] كورتەى ماناى ئەم دێڕەى ئەلفيە: يەكسانە لەم باسەدا_واتا لە بوون بە مشغول_ ناوى هاو شێوەى فعل _وەكو اسمى فاعل واسمى مفعول_ بە فعل ،واتا ئەوەى بە فعل دەكرێ بە وانيش دەكرێ،بەمەرجێ بەربەست نەبێ.

عامل لەو شتەی عەمەلی فعل دەكات وسیفەت نیە وەكو اسمی فعل،وەكو نموونەی((زیدٌ دَرَاكِه))لێرەدا دروست نیە((زید))منصوب كریٚ،چونكە اسمی فعل عەمەل ناكات لە وەی لە پێشێتی،كەواتا ناكریٚ ڕاڤەوتەفسیری عاملێك بكات.

هەروەها خۆی پاراست بەووتەی((ذا عَمَلْ))لەو سیفەتەی عەمەل ناكات،وەكو اسمی فاعل ئەگەر بۆ ڕابردوو((ماضی))بیٚ،وەكو((زیدٌ انا ضاربُه امسِ))لێرەدا دروست نیە((زید))منصوب كریٚ،چونكە شتێك عەمەل نەكات ناتوانیٚ ڕاڤەوتەفسیری عامل بكات.

نموونەی سیفەتی عامل(( زیدٌ أناضاربُه: الآن ،أو غداً، الدرهم انتَ مُعْطَاهُ))لێرەدا دروستە((زید،والدرهم))منصوب بیٚ،وەدروستە مرفوع بیٚ،هەروەكو چۆن لەگەڵ فعلدا دروست بوو.

هەروەها دانەر خۆی پاراست بەووتەی((إنْ لَمْ يَكُ مَانِعٌ حَصَلْ))، لەوەی ئەگەر بەربەست دروست بیٚ بۆ ئەو سیفەتەو نەهێلیٚ عەمەل بكات،وەكو ئەوەی ئەلیف ولام((ال)) بچێتە سەری،وەكو((زیدٌ انا الضاربُهُ))،لێرەدا دروست نیە((زید))منصوب كریٚ،چونكە ئەوەی دوای ئەلیف ولام ناتوانیٚ عەمەل لەپێش خۆی بكات،كەواتا ناتوانیٚ ڕاڤەوتەفسیری عامل بكات،واللهُ اعلمُ.

* * *

٢٦٦- وَعُلْقَــــةٌ حَاصِلَةٌ بِتَابِعِ     كَعُلْقَةٍ بِنَفْسِ الاسْمِ الْوَاقِعِ .[١]

پێشتر ڕابورد کە هیچ جیاوازییەك نیە لەم بابەتەدا لە نێوان ئەوەی ئەگەر جێناوەکە لکا بێ بە فعلەکەوە،وەکو((زيداً ضربتهُ))،یان ئەگەر بەین کرا بێ لە نێوان عاملەکەو جێناوەکە بە هۆی حەرفی جەڕ،وەکو((زيداًمررتُ به))،یان بە هۆی إضافە،وەکو((زيداً ضربتُ غلامَه)).

جا لەم دێڕەدا باسی ئەوە دەکات پەیوەندی نێوان عاملەکە وجێناوەکە ئەگەر بە هۆی تابعەوە[٢] بوو وەکو پەیوەندی ئەصلی نێوان عاملەکەو جێناوی ناوە پێشکەوتووەکەیە،مانای وایە ئەگەر فعلەکە عەمەلی کرد لە ناوێکی بێگانە[٣]،دواتر ئەو ناوە تابعی هەبو،وئەو تابعە جێناوێکی پێوە لکابوو کە دەگەڕایەوە بۆ ناوە پێشکەوتووەکە:جا تابعەکە صفە بێ،وەکو((زيداً ضربْتُ رجلاً يُحِبُّه))،یان عطف بیان[٤] بێ وەکو(( زيداً ضربت عمراً أباه))،یان عطف کراوبێ بە حەرفی واوی عطف بە تایبەت وەکو((زيداً ضربت عمراً وأخاه))،لەم نموونانەدا پەیوەندی وحاڵەتی اشتغال دروست دەبێ هەروەکو چۆن لە گەڵ خودی جێناوی ناوە پێشکەوتووەکە دروست دەبێ،کەوابوو ڕستەی((زيداً ضربْتُ رجلاً يُحِبُّه))،وەکو ڕستەی((زيداً ضربتُ غلامَه))وایە، هەروەها ئەوانی تریش.

---

[١] کورتەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەو پەیوەندییەی کە دروست دەبێ لە نێوان عاملەکە_((مشغول))کە_ و ناوە پێشکەوتووەکە((مشغول عنه))و ئەو پەیوەندیەش کە دروست دەبێ لە نێوان عاملەکە وتابعی_جا تابعەکە صفە بێ یان عطف بێ_ ناوە پێشکەوتووە کە وەکو یەك وان.

[٢] مەبەست لە تابع لە زمانی عەرەبیدا ئەو ناوانەن کە دوای ناوەکەی پێش خۆیان ئەکەون لە إعرابدا،کە بریتین لە{ النعت ((صفة))، العطف ،البدل ،التوكيد }.

[٣] مەبەست لەناوی بێگانە واتا ناوێکی تر جگە لە ناوە پێشکەوتووەکە.

[٤] مەبەست لە عطف بيان ئەوەیە ناوێك بێ بە دوای ناوێکی تردا بەبێ حەرفی عطف بۆ ڕوون کردنەوەی ناوی یەکەم.

پوختەکەی ئەوەیە کە ناوێکی تر جگە لەناوە پێشکەوتووەکە لە ڕستەکەدا ئەگەر تابعی هەبوو وە ئەو تابعەش جێناوی پێوە بوو ئەوە هەر وەکو حاڵەتی تر وایە و اشتغال دروست دەبێ.

* * *

# باسی کرداری تێپەڕو تێنەپەڕ[1]

# تعدّي الفعلِ، ولزومُهُ

٢٦٧- عَلاَمَةُ الفِعْلِ الْمُعَدَّى اَنْ تَصِلْ هَا غَيْرِ مَصْـــدَرٍ بِهِ نَحْوُ عَمِــــلْ.[2]

دابەش دەبێ فعل بۆ تێپەڕ،وتێنەپەڕ،جا تێپەڕ:ئەوەیە کە ماناکەی بگاتە مفعول به بەبێ حەرفی جەڕ،وەکو((ضربتُ زیداً))،وە فعلی تێنەپەڕ:ئەوەیە کە وا نەبێ،واتا:نەگاتە (مفعول به) مەگەر بە هۆی حەرفی جەڕ،وەکو((مررتُ بزیدٍ))[3]،یان مفعولی نیە،وەکو((قام زیدٌ))،جائەوەی بە خودی خۆی بگاتە مفعول بە ئەوە پێی دەوترێ:فعلی متعدی ،وەپێی دەوترێ((واقع))[4] ،وەدەوترێ((مُجاوز))[5]، ئەوەشی بۆ خۆی نەگاتە مفعول بە پێی دەوترێ:لازم ،قاصر[6]،وە تێنەپەڕ،وەپێی دەوترێ تێپەڕ بەهۆی حەرفی جەڕ.

جا نیشانەی فعل متعدی ئەوەیە پێوەی بلکێ جێناوی((ها))کە دەگەڕێتەوە بۆ جگە لە مصدر،کە بریتیە لە((ها))ی مفعول به ،وەکو((البابُ اغلقْتُهُ)).

---

[1] پێشتر باسمان کرد کە لە زمانی عەرەبیدا فعل چەند دابەش بوونێکی هەیە بە چەند ماناو اعتبارێك،یەکێك لەو دابەش بوونانە ئەوەیە کە فعل یان تەواو((التام))ە،وە یان ناتەواو((الناقص))ە، جا فعلی تام دوو جۆرە: ١-(متعدی)،کە لە ڕێزمانی کوردیدا پێی دەوترێ تێپەڕ .٢-(لازم) پێی دەوترێ تێنەپەڕ.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: نیشانەی فعلی متعدی ئەوەیە پێوەی بلکێ جێناوی(ها) کە ئەو جێناوە نەگەڕێتەوە بۆ مصدرەکە،وەکو فعلی عَمِلَ کە فعلێکی متعدیە.

[3] کەواتا لەم ڕستەیەدا ((بزیدٍ))دەبێتە مفعول به غیر الصریح.

[4] واتا:مانای فعلەکە لە فاعلەوە دەکەوێتە سەر مفعولەکە.

[5] واتا:تێپەڕ.

[6] واتا:ماناکەی کورت دەکرێتەوە لەسەر فاعلەکەو ناکەوێتە سەر مفعولەکە.

خۆی پاراست بەم جۆرە((ها))یە لە ((ها))ـی مصدر،کە دەلکیٚ بە فعلی متعدی وفعلی لازم ،کە نیشانەی تێپەڕبوون نیە،نموونەی((ها))ـی مصدری لکاو بە فعلی متعدی((الضربُ ضربتُهُ زیداً))واتا: ضربتُ الضربَ زیدا[1]،وەنموونەی لکاو بە فعلی لازم(( القیامُ قمتُهُ))واتا: قمتُ القیام.

*فعلی متعدی پێویستی بە (( مفعول به ))یە.

٢٦٨- فَانْصِبْ بِهِ مَفْعُولَهُ إِنْ لَمْ يَنُبْ عَنْ فَاعِلٍ نَحْوُ تَدَبَّرْتُ الكُتُبْ.[2]

فعلی متعدی حاڵی وایە مفعول بە منصوب دەکات ئەگەر ئەو مفعولە بە بێتە نائب فاعل ،وەکو((تَدَبَّرْتُ الکُتُبَ))، جا ئەگەر مفعولەکە بوو بە نائب فاعل ئەوە پێویستە مرفوع بیٚ وەکو ڕابورد،وەکو نموونەی ((تُدُبِّرَتِ الکتبُ)).

بەکەمی دەکریٚ مفعول مرفوع بیٚ وفاعل منصوب بیٚ لە کاتی دڵنیا بوون لە تێک نەچوون ،وەکو وتەیان[3](( خرقَ الثوبُ المسمارَ))[4]،جا ئەمەش قیاسی نیە ،بەڵکو تەنها ئەوەی بیستراو((سماعی))ـە بەکار دیٚ.

فعلی متعدی سیٚ جۆرە:

یەکەمیان: تێپەڕ دەکات بۆ دوو مفعول ،ئەمیش دوو جۆرە:یەکێکیان: دوو مفعولەکەی لە بنەڕەتدا مبتداوخبرن ،وەکو((ظنّ))وهاوشێوەکانی، دوومیان: دوو مفعولەکەی لە بنەڕەتدا مبتداو خبر نین ،وەکو فعلی((أعطی وکسا)).

---

[1] واتا: های((ضربتُهُ)) دەگەڕێتەوە بۆ مصدرەکە ونابێتە مفعول بە.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: منصوب بکە بە فعلی متعدی مفعول بە،بەمەرجیٚ ئەو مفعولە نەبووبێتە نائب فاعل ،وەکو((تَدَبَّرْتُ الکُتُبَ))واتا: بەوردی کتێبەکانم خوێندەوە.

[3] واتا:ووتەی عەرەب.

[4] واتا: بزمارەکە پۆشاکەکەی دڕاند،لێرەد دڵنیایین کە پۆشاك بزمار نادڕیٚ .

جۆری دووەم: تێپەڕ دەکات بۆ سێ مفعول ،وەکو أعلم وأری.

جـۆری سـێیەم: تێپـەر دەکـات بـۆ یـەك مفعـول ،وەکـو فعلـی ضـربَ ، وهاوشێوەی.

*  *  *

## *باسی فعلی لازم و نیشانەکانی

٢٦٩– وَلاَزِمٌ غَيْرُ الْمُعَـدَّى وَحُتِـمْ  لُزُومُ أَفْعَالِ السَّجَايَـا كَنَهِمْ

٢٧– كَذَا افْعَلَلَّ وَالْمُضَاهِي اقْعَنْسَسَا  وَمَا اقْتَضَى نَظَافَـةً أَوْ دَنَسَا

٢٧١– أَوْ عَرَضاً أَوْ طَاوَعَ الْمُعَـدَّى  لِوَاحِـدٍ كَمَدَّهُ فَـامْتَدَّا.[1]

فعلی لازم:ئەوەیە تێپـەڕ نـەبێ،وە پێوەی نالکێ((هـا))ـی جێناو کە مصدر نەبێ، جا فعلی لازم پێویستە بۆ هەموو فعلێ کە مانای خوو_واتا سروشت وتەبیعەت_بێ،وەکو((شَرُفَ ، وکَرُم ، وظرفَ، ونَهِمَ))[2]،هەروەها هەر فعلێ لەسـەر وزنـی((افْعَلَـلَّ))بێ،وەکـو((اقْـشَعَرَّ[3] ، واطْمَـأَنَّ ))، یـان لەسـەر وزنی((افْعَلَلَّ))بێ، وەکو((اقْعَنْسَسَ ، واحْرَنْجَمَ))[4]،هەروەها هەر فعلێ بۆ خـاوێنی بێ،وەکـو(( طَهُـر الثـوبُ ، ونَظُـفَ))،یـان بـۆ پیـسی وچـەپەڵی

---

[1] پوختەی مانای ئەم سێ دێڕەی ئەلفیە:٢٦٩– فعلی لازم پێچەوانەی متعدیە، ئەم فعلانەش هەموو کات لازمن:١–ئەو فعلانەی بۆ سروشت وخووی مرۆڤن ،وەکو فعلی((نَهِمَ))واتا: حەزبوون ٢٧٠–٢–ئەو فعلەی لەسەر وزنی((افْعَلَلَّ))بێ، ٣– ئەوەی لەسەر وزنی((افْعَنْلَلَ))بێ ،٤– ئەو فعلەی بۆ مانای پاك وخاوێنی ،یان پیس وچەپەڵی بێ.٢٧١– ٥–ئەو فعل ونیشەی کاتی بێ وبەردەوام نەبێ ،٦– ئەو فعلەی مطاوعەی فعلی متعدی یەك مفعول بێ،وەکو فعلی((امتدَّ))،کە مطاوعەی فعلي((مدَّ))یە.

[2] مانای ئەم فعلانە: شَرُفَ ، وکَرُم واتا:بەڕێز بوو، وظَرُفَ:زیرەك ونەجیب زادە بوو، نَهِمَ :حەزی لێ بوو ئالوودەی بوو.

[3] اقْشَعَرَّ:واتا تەزوو بە پێستی دا هات.

[4] اقْعَنْسَسَ:سنگ دەرپەڕیوو بوو، احْرَنْجَمَ:کۆبۆیەوە.

بیّ،وەکو(( دَنِسَ الثوبُ، ووَسِخ ))،یان فعلیّ بۆ شتێکی کاتی بیّ،وەکو((مَرِضَ زیدٌ،و احْمَرَّ))،یان فعلیّ مطاوەعەی[1] فعلێکی متعدی یەك مفعولی بیّ،وەکو((مَدَدْتُ الحدیدَ فامْتَدَّ،ودحرجتُ الکرةَ فَتَدَحْرَجَ))،جا خۆی پاراست بە ووتەی((مطاوەعەی فعلێکی متعدی یەك مفعولی)) لە مطاوەعەی فعلێکی متعدی دوو مفعولی،ئەمەیان مەرج نیە لازم بیّ،بەڵکو دەکریّ متعدی بیّ بۆ لای یەك مفعول،وەکو((فَهَّمْتُ زیداً المسألةَ فَفَهِمَهَا ، وعلَّمتُه النَّحو فتعلَّمَهُ)).

* * *

*فعلی لازم چۆن دەکرێتە متعدی

٢٧٢- وَعَدِّ لاَزِماً بِحَرْفِ جَرِّ وَإِنْ حذف فَالنَّصْبُ لِلْمُنْجَرّ

٢٧٣-نَقْلاً وَفی أَنَّ وَأَنْ یَطَّرِدُ مَعْ أَمْنِ لَبْسٍ کَعَجِبْتُ أَنْ یَدُوا.[2]

پێشتر ڕابورد کە فعلی متعدی دەگاتە مفعولەکەی بە خودی خۆی،لێردا باسی ئەوە دەکات کە فعلی لازم دەگاتە مفعولەکەی بە هۆی حەرفی جەڕەوە،وەکو((مررْتُ بزیدٍ))،وە هەندیّ جار حەرفە جەڕەکە حذف دەکریّ وفعلە لازمەکە بۆ خۆی دەگاتە مفعولەکە، وەکو ((مررتُ زیداً))،شاعیریش دەڵیّ:

---

[1] مطاوەعە بریتیە لە دەرکەوتن وشوێنەواری ئەو فعلە، پێشتر باسمان کرد.

[2] پوختەی ماناى ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٧٢-فعلی لازم بکە بە متعدی بەهۆی حەرفی جەڕ، جا ئەگەر ئەم حەرفە جەڕە حذف کرا ئەوە دەبێت اسمەکە_کەپێش حذف کردنی حەرفە جەڕەکە مجرور بووە_منصوب بیّ. ٢٧٣_ حذف کردنی ئەم حەرفە جەڕەکە سماعیەو قیاسی نیە،بەڵام حذف کردنی حەرفی جەڕلەگەڵ ((أَنَّ وأَنْ)) قیاسیە،بەمەرجی دڵنیابوون لە تێك نەچوون،وەکو نموونەی((عَجِبْتُ أَنْ یَدُوا))واتا: سەرسام بووم لە خوێن((الدیه)) دانی ئەوان .

ش١٥٩/ تَمُرُّونَ الدِّيَارَ وَلَمْ تَعُوجُوا كَلاَمُكُمْ عَلَيَّ إذاً حَــــرَامُ.[(١)]

واتـا: تَمُرُّونَ بالـدِّيَارِ. جـا بۆچـوونی زۆرینـەی زانایـان وایـە کـە حـذف کردنـی حـەرفی جـەڕ قیاسـی نیـە مەگـەر لەگـەڵ((أنَّ)) وَ((أنْ))،تـەنها ئـەوەی لەعەرەبـەوە بیـستراوە دەکرێ،بـەڵام پێـشەوا(ابوالحـسن علـیّ ابـن سـلیمان البغـدادي)کـە ناسـراوە بـە ئەخفەشـی بچووك پێـی وایـە حـذف کردنـی حـەرفی جـەڕ لەگـەڵ غـەیری((أنَّ)) وَ((أنْ)) قیاسـیە بـە مـەرجی دیـاربوونی حەرفـە جەڕەکـەو شـوێنی حـذف کردنی،وەکـو(( بریـتُ القلـمَ بالْـسكينِ))[(٢)]،دروسـتە لای ئـەبو حەسـەن حـەرفی((بـ))حـذف کریّ،کـەوابوو دەڵێـی((بریـتُ القلـمَ الْـسكينَ))،بـەڵام ئەگـەر حەرفــە جەڕەکــە دیــارو تایبــەت نــەبوو ئــەوە دروســت نیــە حــذف کرێ،وەکو((رغبتُ في زيدٍ ))لێرەدا دروست نیە حەرفی((في))حذف کرێ،چونکە لەحذف کردنیدا نازانرێ:ئایە تقدیروراڤەکەی(رغبتُ عنْ زيدٍ) دەبێ یان(في زيدٍ) دەبێ[(٣)]،هـەروەها دروسـت نیـە حەرفـە جەڕەکـە حـذف کـرێ ئەگـەر شـوێنەکەی دیارنەبێ ،وەکو((اخترتُ القومَ من بني تَميمٍ))لێرەدا دروست نیە حذف کرێ وبڵێی((اخترتُ القومَ بني تَميمٍ))چونکە نازانرێ:ئایە ئەصـڵەکەی((اخـترتُ القومَ من بني تَميمٍ))بووە یان ((اخترتُ من القومَ بني تَميمٍ))بووە.

---

(١) ماناو بەڵگەی ئەم دێرە : تێپەڕ دەبن بەلای ماڵەکانمانداو لانادەن ،کەوابێ قسەکردن لەگەڵ تان یاساغ بێ لە سەرم. بەڵگەکەی:(( تَمُرُّونَ الدِّيَارَ)) لێرەدا فعلی((تَمُرُّ))فعلێکی لازمەو بەبێ حەرفی جەڕ گەشتۆتە مفعولەکەی ،واتا حەرفە جەڕەکەی حذف کراوە وئەصڵەکەی((تَمُرُّونَ بالدِّيَارِ))بووە.

(٢) واتا: پێنوسەکەم تاشی ودادا بە چەقۆکە.

(٣) فعلی لازم کاتێ بەهۆی حەرفی جەڕەوە دەکرێتە متعدی بەپێی حەرفە جەڕەکە مانای دەگۆڕێ ،بۆ نموونە فعلی((رَغِبَ)) ئەگەر لەدویەوە حەرفی ((في))بێ ئەوە بەمانای حەزلێ بوون دێ ،بەڵام ئەگەر لەدوایەوە حەرفی ((عن))بێ ئەوە بەمانای پشت تێکردن ورِق لێ بوون دێ.

بەلأم حذف كردنی حەرفی جەڕ لەگەڵ ((أَنَّ،وأَنْ))ئەوە دروستە بە قیاسی وبەبێ خیلاف،بەمەرجی دڵنیابوون لە تێك نەچوون،وەكو ((عَجِبْتُ أَنْ يَدُوا))واتا:خوێن بدەن،هەروەها نموونە لەگەڵ ((أَنَّ))_كە قورسەو شەددەی هەیە_((عجبتُ مِنْ أنَّكَ قائمٌ))لەم ڕستەیەدا دروستە حەرفی((مِنْ))حذف كرێ ودەڵێی((عجبتُ أنَّكَ قائمٌ))،بەلأم ئەگەر لێ تێكچوون ڕوویدەدا ئەوە دروست نیە حذف كرێ،وەكو((رَغِبتُ في أنْ تقومَ))یان (( رغبتُ في أنَّك قائم))لێرەدا دروست نیە حەرفی((في)) حذف كرێ چونكە دەكرێ حذف كراو حەرفی((عن))بێ ئەو كات لێ تێكچوون دروست دەبێ.

جا زانایان ڕایان جیایە دەربارەی محلّی((أَنَّ،وأَنْ))_كاتێ حەرفە جەڕەكە حذف كرێ_،پێشەوا ئەخفەش پێی وایە لە محلی جەڕدان ،وە پێشەوا كسائی پێی وایە لە محلّی نصبدان،وە پێشەوا سیبویە ڕای وایە هەردووكیان دروستە.

پوختەی ئەوەی ڕابورد:ئەوەیە فعلی لازم دەگاتە مفعول بەهۆی حەرفی جەڕەوە،جا ئەگەر مجرورەكە((أَنَّ،وأَنْ))نەبوو ئەوە دروست نیە حەرفە جەڕەكە حذف كرێ مەگەر حاڵەتێكی بیستراو لە عەرەب،بەلاّم ئەگەر مجرورەكە (((أَنَّ،وأَنْ)) بوو[1]،ئەوە دروستە حەرفە جەڕەكە حذف كرێ لەكاتی دڵنیابوون لە تێك نەچوون،ئەمەش بۆچوونی ڕاستە.

* * *

[1] حەرفی((أَنَّ،وأَنْ)) هەردووكیان پێیان دەوترێ مصدری ،واتا لەگەڵ دوای خۆیان تأویل دەكرێن بە مصدرو لە محلدا دەبنە اسمی مجرور.

***ڕیزکردنی دوو مفعول وزیاتر ((ترتیب المفاعیل))**

٢٧٤- وَالأَصْلُ سَبْقُ فَاعِلٍ مَعْنىً كَمَنْ  مِنْ ((أَلْبِسَنْ مَنْ زَارَكُمْ نَسْجَ اليَمَنْ)).[1]

ئەگەر فعلی متعدی دوو مفعولی هەبوو وە مفعولی دووەمی لە بنەڕەتدا خبر نەبوو،ئـەوە ئەصـلْ ویاسـا وایـە ئـەو مفعولـەیان کـە لـەماناادا فاعلـە پێشخریْ،وەکو((أعطیتُ زیداً درهما))لێرەدا ئەصلْ وایە ((زیداً))پێشخریْ بەسـەر ((درهمـا))،چـونکە زیـد لـەماناادا فاعلە،لەبـەر ئـەوەی وەرگـری درهمەکەیە،هەروەها وەکو((کسوتُ زیداً جُبَّةً))،وە وەکو((أَلْبِسَنْ مَنْ زَارَكُمْ نَسْجَ اليَمَنْ))لێرەدا((مَنْ)):مفعولی یەکەمە،و((نَسْجَ))مفعولی دووەمە،جا ئەصـلْ ئەوەیـە ((مَـنْ))پێـشخریْ بەسـەر((نَـسْجَ الـیَمَنْ))دا چـونکە ((مَـنْ))پۆشـەر((لابـس))ە،دروستیـشە ئـەوەی کـە لـەماناادا فاعـل نیـە پێشخریْ،بەلاَم پێچەوانەی یاسایە.

* * *

٢٧٥- وَيَلْزَمُ الأَصْـلُ لِمُوجِبٍ عَرَى  وَتَرْكُ ذَاكَ الأَصْلِ حَتْماً قَدْ يُرَى.[2]

واتا:هەندیْ جارئەم ئەصلْە_کەبریتی بوولە پێشخستنی ئەو مفعولەی لە مانـادا فاعلـە_پێویـستە ئەگـەر شـتێك پەیـدا بـیْ و ببێتـە هـۆی ئـەم پێشخـستنە،کە ئـەویش بریتیـە لـە ترسـی لـیْ تێـك چـوون وتێکەلاْوبوون،وەکو((أعطیْتُ زیداً عمراً))لێرەدا پێویستە وەرگر((الآخذ))

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: ئەصلْ وبنچینە وایە_لە ڕیزکردنی دوو مفعولی ئەو فعلەی دوو مفعولی هەیە_ئەو مفعولەی لەماناادا فاعلە پێشخریْ،وەکو ناوی((مَنْ))لە نموونەی((أَلْبِسَنْ مَنْ زَارَكُمْ نَسْجَ اليَمَنْ)).واتا:بپۆشن ئەو کەسەی سەردانتان دەکات پۆشاکی یەمەنی.

[2] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: هەندیْ جار ئەم ئەصلْە_کەبریتی بوو لە پێشخستنی مفعولیْ کە لەماناادا فاعلە_ پێویستە ئەگەر داخوازی هەبوو،وە هەندیْ جاریش لادان ووازهێنان لەم ئەصلْە دەکریْ ودروستە.

پێـشكەوێ،ودروست نيـە جگـە لـەوەرگر پـێش كەوێ،لەترسـى لـێ تێـك چوون،چونكە دەكرێ ئەويان فاعل بێ.

هەروەها هەندێ جار پێويستە ئەوەى لەمانادا فاعل نيە پێشكەوێ،وئەوەى لـەمانادا فاعلـە دوا كـەوێ،وەكو((أعطيـتُ الـدرهمَ صـاحبَهُ))لێرەدا دروسـت نيە((صاحبَهُ))پێشكەوێ هەرچەندە لەمانادا فاعلە،كەوابوو نالێيت((أعطيتُ صاحبَهُ الدرهمَ)) بۆ ئەوەى جێناو[1] نەگەڕێتەوە بۆ شتێك كە لە دواوەيە لـە پلەولفظدا،كە ئەمەش دروست نيە[2]، واللهُ أعلم.

* * *

[1] واتا: جێناوە لكاوەكەى بە((صاحبَهُ)).

[2] لەباسەكانى پێشوودا باسمان كرد كە جێناو((الضمير))لە زمانى عەرەبيدا دەبێ بگەڕێتەوە بۆ ناوێك كە لەپێشێوە باسكراوەو هاتووە.

## حذف کردنی مفعول به..

٢٧٦ـ وَحذف فَضْلَةٍ أَجِزْ إِنْ لَمْ يَضِرْ كَحذف مَا سِيقَ جَوَاباً أَوْ حُصِرْ.[1]

ووشەی زیادە لەڕستەدا:پێچەوانەی کۆڵەکەیە[2]، مەبەست لە کۆڵەکە ئەوەیە ڕستەکە بێنیاز نیە لێی وەکو فاعل،وەمەبەست لە زیادەوناکۆڵەکە:ئەوەیە دەکرێ لێی بێنیاز بی وەکو مفعول به،جا دروستە ناکۆڵکە حذف کرێ ئەگەر زیانی نەبێ ،وەکو ووتەت لە ڕستەی((ضربتُ زیداً)) :((ضربتُ ))بە حذف کردنی مفعولەکە، هەروەها وەکو ووتەت لە((أعطیتُ زیداً درهما)):(( أعطیتُ))،وە وەکو فەرموودەی خوای گەروە﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى﴾[3]،هەروەها دەڵێی((أعطیتُ زیداً))[4]،وە وەکو

---

[1] پوختەی مانای ئەم دێڕەی ئەلفیە: دروستە حذف کردنی ووشەی نا کۆڵەکە_واتا ووشەیەك کە ڕستەکە بەبێ بوونی ئەویش دروست دەبێ_ بەمەرجێ زیانی نەبێ بۆ مانای ڕستەکە، وەکو ئەوەی وەڵامی پرسیار بێ یان حەصرکراو بێ _واتا:لەم دوو کاتەدا دروست نیە حذف کرێ.

[2] ئەو ووشانەی ڕستە((الجملە))پێك دێنن لە زمانی عەرەبیدا دوو بەشن: بەشی سەرەکی وبنەڕەتی ڕستەکە کە زانایانی نحو بە((عُمدة))ناوی دەبەن ،ئەویش بریتیە لە فعل وفاعل لە جملەی فعلی ،وە مبتداو خبر لە جملەی اسمی، بەشی ناسەرەکی وزیادە :ئەم بەشە مانای ڕسەتەکە تەواو دەکەن بەڵام نەشبن ڕستەکە دروست دەبێ،وەکو{مفعولەکان ،جارومجرور ،حال، تمییز ،ظرفەکان ...هتد} ،نحو زانان ئەم بەشە بە((فُضلة))ناو دەبەن.

[3] ئایەتی ژمارە(٥)ـی سورەتی((اللّیل))یە،و کورتەی ماناکەی {جا ئەو کەسەی (ماڵ) ببەخشێ ولەخوا بترسێ و پارێزکار بێ..}، إعرابەکەی : فأمّا/ ف:حسب ماقبلها .امّا: حرف شرط وتفصيل مبني على السكون . منْ/ اسم موصول مبني على السكون في محل رفع مبتدا .أعطى/ فعل ماضٍ مبني على الفتح المقدر على الالف للتعذر ،وفاعله ضمير مستتر فيه جوازاً تقديره (هو)، وجملة((أعطى))لامحل لها من الاعراب لانّها صلة الموصول .واتّقى/ و:حرف عطف .اتّقى: جملة معطوفة على جملة((أعطى))،وإعرابها مثل إعرابها. الشاهد في هذه الآية: حذف الفُضلة(مفعول به) للفعل اعطى واتقى،وذلك جائز .

[4] واتا:مفعولی دووەم حذف دەکرێ.

فـەرموودەی خـوای گـەورە﴿وَلَـسَوْفَ يُعْطِيـكَ رَبُّـكَ فَتَرْضَـى﴾[(١)]، هـەروەها دەڵێی((أعطيتُ درهما))[(٢)]، وە وەکو فەرموودەی خوای گەورە﴿حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ﴾[(٣)]، تقدیری ئەم ئایەتە_والله اعلم_حتى يعطوكم الجزية، جا ئەگەر حذف کردنی فُضلەکە زیانی هەبوو بۆ مانای ڕستەکە ئەوە دروست نیە، وەکو ئەوەی مفعول بە ببێتە وەڵامی پرسیارێك، وەکو ئەوەی بوترێ((مَنْ ضربتَ ؟)) تۆش دەڵێی((ضربتُ زيداً))، یان ئەگەر مفعول بە حصرکراو بێ، وەکو((ما ضربْتُ إلا زيداً))لەم دوو جێگەیەدا دروست نیە((زیداً))حذف

---

(١) ئایەتی ژمارە(٥)ی سورەتی ((الضحی))یە، کورتەی ماناکەی {سوێند بە خوا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ کە ڕازی بیت.}، إعرابەکەی : و/حسب ماقبلها . لسوف/لـ:لام القسم .سوف/ حرف استقبال. يعطيك/ فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة على الياء للثقل. ك/ ضمير متصل مبني على الفتح في محل نصب مفعول به ليعطى الذي يتعدى إلى مفعولين،وحذف أحدهما والتقدير (ولسوف يعطيك ربّك ما تريده). ربُّك/ ربُّ: فاعل مرفوع ،وهو مضاف ،ك/ ضمير متصل مبني على الفتح في محل جر مضاف إليه. فترضى/ فـ:حرف عطف .ترضى: فعل مضارع مرفوع وعلامة رفعه الضمة المقدرة على الالف للتعذر ،وفاعله ضمير مستتر تقديره(انت)،وجملة ((ترضى))معطوفة على (يعطيك). الشاهد في هذه الآية: حذف المفعول الثاني لـ(يعطي)،وذلك سائغ جائز في اللغة العربية.

(٢) واتا:مفعولی یەکەمحذف دەکرێ.

(٣) ئەم ڕستە قورئانیە بەشێکە لە ئایەتی ژمارە((٢٩))ی سورەتی((التوبة))، پوختەی ماناکەی :{هەتا باج وسەرانە دەدەن ،_سەرانە(الجزية):بریتیە لەو ماڵەی کەسی بێ باوەڕ ساڵانە دەیداتە دەوڵەت ودەسەڵاتی ئیسلامی لەبەرامبەر پاراستنی سەروماڵی}. إعرابەکەی :حتى/ حرف جرّ وغاية مبني على السكون . يعطوا/ فعل مضارع منصوب بـ(أنْ)المضمرة بعد(حتى)،وعلامة نصبه حذف النون لأنه من الأفعال الخمسة، والواو/ ضمير متصل مبني في محل رفع فاعل . الجزية/مفعول به ثانٍ لـ(يعطوا). الشاهد فيها: حذف المفعول الأول لـ(يعطوا)،وإبقاء المفعول الثاني،وقد جاز حذف ه لأنه فُضلة.

کریٚ،چـونکه لەیەکەمیانـدا[1] وەلاٚمـی پرسـیارەکه دەسـت ناکـەویٚ،وە لـە دووەمیشدا[2] قسەکە دەبیٚتە نەفی کردنی ڕەها((النفي المطلق))لە کاتیٚکدا مەبەسـت ئەوەیـە نـەفی لیٚـدان لـە جگـە لـە((زیـد))بکریٚ،کـەواتا ئەگەر((زیدا))حذف کریٚ مەبەستەکە نایاتەدی.

* * *

## * حذف کردنی عاملی مفعول..

٢٧٧ـ وَيُحذف النَّاصِبُهَا إِنْ عُلِمَا وَقَدْ يَكُونُ حذفـهُ مُلْتَزَمَا.[3]

دروسـتە حـذف کردنـی ناصـب((عامـل))ـی فُضله ئەگـەر بەڵگـە هـەبیٚ لەسـەری، وەکـو ئـەوەی بـوتریٚ((مَـنْ ضـربتَ ؟))تـۆش بڵیٚـی((زیـداً))لیٚـرەدا ((ضـربتَ))حـزف دەکـریٚ ،لەبەرئـەوەی پیٚـشتر باسـکراوە،جا ئـەم حـذف کردنە دروست((جائز))ـە،وە دەکریٚ هەندیٚ جار پیٚویست((واجب))بیٚ وەکو ڕابـورد لـە باسـی((الاشـتغال))دا،نموونـەی((زیـداً ضـربتُهُ))تقدیرەکـەی ((ضربتُ زیداً ضربتُهُ))لیٚرەدا((ضربتُ))حذف کراوە بە واجبی وەکو پیٚشتر باسکرا، والله اعلم.

---

[1] واتا:لەنموونەی ((مَنْ ضربتَ ؟)) و وەلاٚمەکەی ((ضربتُ زیداً)).

[2] واتا:لەنموونەی: ((ما ضربْتُ إلا زیداً)).

[3] پوختەی مانای ئەم دیٚڕەی ئەلفیە:هەندیٚ جار ناصب((عامل))ـی مفعول بە_کەبریتیە لە فعل یان هاوشیٚوەی فعل_ باس ناکریٚ و حذف دەکریٚ ئەگەر ماناو مەبەستی دیارو زانراوبیٚ ،وە هەندیٚ جاریش حذف کردنی پیٚویست و واجبە.

## التنـازع فى العمل[1]

٢٧٨ - إنْ عَامِلاَنِ اقْتَضَيَا فى اسْمٍ عَمَلْ قَبْــلُ فَلِلْوَاحِـدِ مِنْهُمَا العَمَــلْ

٢٧٩- وَالثَّانِ أَوْلَى عِنْدَ أَهْلِ البَصْرَهْ وَاخْتَارَ عَكْساً غَيْرُهُمْ ذَا أَسْرَهْ.[2]

تنـازع بريتيـه لـه وەی دوو عامـل ڕوودەكەنـه يـەك معمول،وەكـو((ضـربْتُ واكرمــتُ زيــداً))لێـرەدا هەريـەك لـه فعلـی((ضـربْتُ)) و((اكرمـتُ))داوای ((زيداً))دەكـەن بۆ مفعول به بۆيـان ئەمه بـوو مانـای ووتـەی:((إنْ عَـامِلاَنِ- تاكۆتای)).

وه ووتەی((قَبْـلُ))مانای وايه كـه دوو عاملەكه دەبیٚ لـه پـێش معمولەكـەوه بـن وەكـو نموونـەمان هێنايەوه،كـەواتا ئەگـەر عاملـەكان دوا كـەوتن لـه معمولەكـه ئـەوه بابـەتی تنـازع نيـه . هـەروەها ووتـەی((فَلِلْوَاحِـدِ مِنْهُمَـا العَمَلْ))مانای ئەوەيه كه يەكێك لەودوو عامله عەمەل لەو ناوه ئاشكرايه دەكات،وئـەوی تريــان عەمــەل لــەم نــاوه ناكــات بــەڵكو عەمــەل لــه جێناو((ضمير))ـەكەی دەكات،وەكو لەمەو دوا باسی دەكات.

---

[1] ووشەی((التنازع)) لەڕووی زمانەوانيەوه: جاوگ(مصدر)ـه وبه واتای ململانیٚ وكێشمەكێشم دیٚ ،وه لەزانستی نحودا وەكو ابن عقيل پێناسەی دەكات:بريتيه له ململانێی دوو عامل له يەك معمول ،واتا:دوو فعل يان هاوشێوەی فعل به هەردووكيان ڕوو له يەك معمول بكەن،به چەند مەرجێكی تايبەت كه باس دەكریٚ،جا ئێمه له شەرحەكەدا هەر ووشەی تنازع بەكاردێنين.

[2] پوختەی مانای ئەم دوو ديٚرەی ئەلفيه:٢٧٨-ئەگەر دوو عامل_كه فعلن يان هاوشێوەی فعلن_داخوازی عەمەل كردنيان كرد له ناوێكی دوای خۆيان،واتا:دوو عامل ويەك معمول هەيه، ئەوه تەنها يەكێكيان عەمەل دەكات. ٢٧٩-لای بەصرێكان عاملی دووەم له پێشتره بۆعەمەلەكه،بەلاٚم لای دەستەيەك_كه كوفێكانن_ پێچەوانەيان هەڵبژاردووه واتا عاملی يەكەم له پێشتره بۆ عەمەل كردن.

جا هیچ ڕاجیاییەك نیە لەنێوان بەصریکان وکوفیکان لەوەی کە دروستە هەرکام لەو دوو عاملە عەمەل لە ناوەکەدا بکەن ،بەلاّم ڕایان جیایە لەوەی کامیان لەپێشترە،بەصریکان پێیان وایە دووەم لەپێشرە،لەبەر ئەوەی نزیکترە لە ناوەکەوە[1]،وەکو فیکان پێیان وایە یەکەم لەپێشترە لەبەر ئەوەی لەپێشەوەیە.

* * *

٢٨٠- وَأَعْمِلِ الْمُهْمَلَ فِی ضَمِیرِ مَا تَنَازَعَاهُ وَالْتَزِمْ مَا الْتُزِمَا

٢٨١-كَيُحْسِنَانِ وَيُسِيءُ ابْنَاكَا وَقَدْ بَغَى وَاعْتَدَيَا عَبْدَاكَا.[2]

واتا:ئەگەر عەمەلت دا بەیەکێ لەدوو عاملەکە لە ناوئاشکرا((الظاهر))ەکە ویەکێکیانت لە کارخست لەو ناوە ،ئەوە ئەو لەکارخراوە عەمەل پێ بکە لەجێناوی ئەو ناوە ئاشکرایە،وە پێویستە پەیوەست بی بەدانای ئەو جێناوە لە کاتێکدا کە عاملەکە پێویستی پێیەتی ونابێ حذف کرێ،وەکو فاعل،ئەمەش وەکو نموونەی((یُحْسِنُ ویسیءُ ابناك))لێرەدا هەریەك لەفعلی((یُحْسِنُ)) و((یُسیءُ)) داخوازی ناوی((ابناك))بۆ فاعل بووندەکەن، جا ئەگەرعەمەل بەی بە فعلی دووەم ئەوە پێویستە فعلی یەکەم عەمەل لە جێناوەکەیدا[3] بکات وبیکاتە

---

[1] واتا:معمولەکە.

[2] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٨٠-عەمەلی عاملە لەکارخراوەکە بدە بە جێناوی ئەو ناوەی لەسەری مشت ومڕیانە،وەپەیوەست بە بەوەی بۆیان پێویستە-لەوەی ئەگەر ناوەکە چۆن بێ جێناوەکەشی وا دەبێ-.٢٨١-وەکو نموونەی((یُحْسِنَانِ وَیُسِیءُ ابْنَاکَا))واتا:چاکە وخراپە دەکەن دوو کوڕەکەی تۆ_لەم نموونەیەدا فعلی((یُسِیءُ))عەمەلی لە ناوی((ابْنَاکَا))کردووە، وفعلی((یُحْسِنُ))عەمەلی لەجێناوی((ابْنَاکَا))کردووە_هەروەها وەکو نموونەی((وَقَدْ بَغَى وَاعْتَدَيَا عَبْدَاكَا)) واتا:دەست درێژیان کرد دوو بەندەکەی تۆ.

[3] واتا:جێناوی ((ابناك))ە.

فاعل،کەوابوو دەڵێی((یُحْسِنَانِ وَیُسِیءُ ابْنَاکَـا))،هەروەها ئەگەر عەمەل بەی بە فعلی یەکەم ئەوە پێویستە فعلی دووەمیش عەمەل بکات لە جێناوەکەی،ئەو کات دەڵێی((یُحْسِنُ ویسیئانِ ابناك))،هەروەها نموونەی((بَغَى وَاعْتَدَيَا عَبْدَاكَا))وایە،ئەگەر لەم نموونەیەدا عەمەل بەی بە فعلی دووەم دەڵێی((بَغَيا وَاعْتَدَى عَبْدَاكَا))،وە بە هیچ شێوەیەك دروست نیە واز لە دانانی جێناوەکە بهێنرێ،کەواتا دروست نیە بڵێی((یُحْسِنُ ویسیءُ ابناك))،وە ناوترێ((بَغَى وَاعْتَدَى عَبْدَاكَا))،چونکە وازهێنان ودانەنانی جێناو دەبێتە هۆی حذف کردنی فاعل،فاعلیش دەبێ هەمیشە باسکرێ ونابێ حذف کرێ ، وە پێشەوا کسائی بەدروستی دەزانێ حذف کردنی،چونکە کسائی بۆچوونی وایە دروستە فاعل حذف کرێ،هەروەها پێشەوا فەڕا بەدروستی دەزانێ لەبەر ئەوەی فەڕا بۆچوونی وایە دروستە هەردوو عاملەکە یەك معمولیان هەبێ کە بریتیە لەناوە ئاشکراکە،ئەمەش لەسەر بۆچوونی هەردوو پێشەوا کە پێیان وایە کاتێ فعلی دوەم عەمەلی کرد ئەوە دروست نیە یەکەم جێناوی بۆ دانرێ،کەوابوو نوترێ:((یُحْسِنَانِ وَیُسِیءُ ابْنَاکَـا))، ئەمەی باسمان کرد لە بۆچوونی ئەو دوو پێشەوایە باووبڵاوە لێیانەوە لەم بابەتەدا.

* * *

٢٨٢–وَلاَ تَجِئْ مَـعْ أَوَّلٍ قَدْ أُهْمِلاَ بِمُضْمَرٍ لِغَيْرِ رَفْـعٍ أُوهِـلاَ

٢٨٣–بَلْ حذفهُ الْزَمْ إِنْ يَكُنْ غَيْرَخَبَرْ وَأَخِّرَنْهُ إِنْ يَكُـنْ هُوَ الْخَبَرْ.[1]

---

[1] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیە:٢٨٢–مەمێنە لەگەڵ عاملی یەکەم کە لەکار خراوە جێناوی حاڵەتی جگە لە رفع_واتا نصب وجر_،واتا:ئەگەر عەمەل درا بە دووەم ئەوە یەکەم پێویستی بە جێناو نیە مادام ئەو جێناوە بۆ حاڵەتی رفع نیە.

پێشتر ڕابورد کە ئەگەر یەکێك لە دوو عاملەکە عەمەلی کرد لە ناوە ئاشکراکە وئەوی تریان لە کارخرا لێی ئەوە دەبێ عەمەل لەجێناوەکەی بکات،جا دانانی جێناو پێویستە ئەگەر داخوازی ئەو عاملە پێویست بێ باسکرێ:وەکو ئەوەی فاعل ،یان نائب فاعل بێ،جا جیاوازی نیە دانانی ئەم جێناوە بۆ عاملی یەکەم بێ یان دووەم،دەڵێی((یُحْسِنَانِ وَیُسِیءُ ابْنَاكَ، یُحْسِنُ ویسیئانِ ابناك)).

لێرەشدا باسی ئەوە دەکات کە ئەگەر داخوازی فعلە لەکارخراو ((المهمل))ەکە حاڵەتی رفع نەبوو،ئەوە بەدەر نیە لەوەی:یان کۆڵەکە ((عمدە))یە لە بنەڕەتدا-کەئەویش مفعولی((ظنّ)) وهاوشێوەکانێتی، چونکە لە بنەڕەتدا مبتدا یان خبرە،ئەمەیە مەبەست لە ووتەی((إِنْ یکنْ هُوَ الْخَبَرْ)) -،یان کۆڵەکە نیە،جا ئەگەر کۆڵەکە نەبوو:ئەوە یان عاملی یەکەم داخوازی دەکات ،یان دووەم،جا ئەگەر عاملی یەکەم داخوازی کرد ئەوە دروست نیە جێناو بێنی،کەوابوو دەڵێی((ضربتُ وضربني زیدٌ[1]،و مررتُ وَمَرَّ بي زیدٌ[2]))،وە هەندێ جار لەهۆنراوەدا هاتووە،وەکو ووتەی:

---

٢٨٣-بەڵکوپێویستە ئەو جێناوە حذف کرێ بەمەرجێ خبر نەبێ ،جا ئەگەر خبر بوو ئەوە نابێ حذف کرێ بەڵکو پێویستە باسکرێ لە دواوە ،واتا نابێ پێش کەوێ.

[1] لەم ڕستەیەدا هەر دوو فعلی((ضربتُ ))و((ضربني))داخوازی ناوی ((زید))،دەکەن ، یەکەمیان داوای دەکات بۆ مفعولی چونکە خۆی فعل وفاعلە،دووەمیش داوای دەکات بۆ فاعلی ،جا دراوە بە دووەم ویەکەمیش عەمەلی لە جێناوەکەی نەکردووە چونکە جێناوەکە دەبێتە مفعول بۆ یەکەم ومفعولیش لەڕستەدا کۆڵەکە نیە.

[2] لەم ڕستەیەشدا هەردوو فعلی ((مررتُ)) و((مرّ))،داوای ناوی ((زید))دەکەن یەکەمیان داوای دەکات بۆ اسمی مجرور،ودووەمیش داوای دەکات بۆ فاعلی،دیارە دراوە بە دووەم،ویەکەمیشعەمەلی نەکردووە لە جێناوی((زید))،چونکە جێناوەکە بۆ حاڵەتی((جرّ))ە ولەڕستەدا کۆڵەکە نیە.

ش١٦٠/ إذَا كُنْتَ تُرْضِيهِ ويُرْضِيكَ صَاحِبٌ جِهَاراً فَكُنْ في الغَيْبِ أَحْفَظَ لِلْعَهْدِ
والـغِ أحاديث الوشاة فقلّمـا يُحاولُ واشٍ غيـرَ هجرانِ ذي ودّ.[1]

وەئەگـەر عـاملی دووەم داخـوازی دەكـرد ئـەوە دانـانی جێنـاو پێویستە،كەوابوو دەڵێی((ضـربني وضـربتهُ زيـدٌ " ومَـرَّ بـي ومـررتُ بـه زيـدٌ))وە دروست نیـە جێناوەكـە حـذف كرێ،كـەوابوو نـاڵێی((ضـربني وضربتُ زيدٌ " ومَرَّ بي ومررتُ زيدٌ))،بەڵام لە شعردا هاتووە،وەكو ووتەی:

ش١٦١/ بِعُكَاظَ يُعْشِي النَّاظرِينَ إذَا هُمُ لَمَحُوا شُعَاعَهُ.[2]

وە ئەصڵەكەی((لَمَحُـوهُ))ـەوجێناوەكەی لەبەر زەرورەتـی شـعری[3] حـذف بووە، ئەمەش پێچەوانەی یاسایە،هەروەكو چۆن پێچەوانەی یاسایە عەمـەل كردنی عاملی یەكەم لە جێناوی مفعولێك كە كۆڵەكە نەبێ لە ڕستەدا.

---

[1] ماناوبەڵگەی ئەم دوو دێڕە: ئەگەر تۆ لەهاوڕێكەت ڕازیت وئەویش لە تۆ ڕازییە بەئاشكرا هەوڵدە لە پەنهان ونهێنیشدا ئەم پەیمان وخۆشەویستیە بپارێزە، وە هیچ كات گوێ لە ووتەی دووزمانان مەگرە چونكە دوو زمان تەنها تێكدانی خۆشەویستی وهاوڕێیەتی دەوێ. بەڵگەكەی:(( تُرْضِيهِ ويُرْضِيكَ صَاحِبٌ))لێرەدا هەردوو فعلی ((تُرْضِيهِ)) و((يُرْضِيكَ))داوای ناوي((صاحبٌ)) دەكەن یەكەمیان داوای دەكات بۆ مفعولی،ودووەمیش داوای دەكات بۆ فاعلی،ودراوە بەدووەم ویەكەمیش عەمەلی لە جێناوەكەی كردووە،زۆربەی زانایان پێیان وایە پێویست بە جێناو ناكا بۆ فعلی یەكەم چونكە ئەو جێناوە لەڕستەكەدا كۆڵكە(عمدە)نیە.

[2] ماناوبەڵگەی ئەم دێڕە: لە بازاڕی (عُكَاظَ)دا–تیشكی شمشێرەكانمان–كز دەكات چاوی بینەرانی،كاتێك بڕوانن بۆی. بەڵگەكەی:(( يُعْشِي ... لَمَحُوا شُعَاعَهُ))لێرەدا هەروو فعلی((يُعْشِي)) و((لَمَحُوا))داوای ناوی((شُعَاعَهُ))دەكەن یەكەمیان بۆ فاعلی، ودووەمیش بۆ مفعولی،ودراوە بە یەكەم ودووەمیش عەمەلی لەجێناوەكەیدا كردووە ودواتر جێناوەكەش حذف كراوە لەبەر زەرورەتی شعری، واتا ئەصڵەكە ((لَمَحُوهُ)) بووە، ئەمەش بەلای زۆرینەی زانایانەوە دروست نیە مەگەر بۆ زەرورەتی شعری.

[3] مەبەست لە زەرورەتی شعری:ئەوەیە كە هەموو شعرێك كێش((وزن))ی تایبەتی خۆی هەیە، جا بۆ ئەوەی ئەو كێشە تێك نەچێ دەبێت حرفێك یان زیاتر حذف كرێ.

ئەمەی باسکرا هەمووی بۆ ئەوەیە کە جێناوەکەی حاڵەتی رفع کۆڵەکە((عمدە))نەبێ لە بنەڕەتدا، جا ئەگەر جێناوەکە کۆڵەکەبوو لە بنەڕەتدا ئەوە بەدەرنیە لەوەی:یان عاملی یەکەم داخوازی دەکات،یان عاملی دووەم،جا ئەگەر عاملی یەکەم داخوازی بکات ئەوە دانانی جێناو پێویستە[1]،دەڵێی((ظَنَّنِي وظننتُ زيداً قائماً إيَّاه))[2]،وەئەگەر عاملی دووەم داخوازی بکات ئەوە جێناوی بۆ دادەنرێ:جێناوەکە لکاو بێ،یان سەربەخۆ،کەوابوو دەڵێی((ظننتُ وظَنَّنِيه زيداً قائماً ، وظننتُ وظَنَّني إياه زيداً قائماً)).

وەمانای دوو دێڕەکە[3]،ئەگەر عاملی یەکەمت لەکارخست ئەوە جێناوی_حاڵەتی نصب وجەڕی_بۆ ناهێنی،دروست نیە بڵێی((ضربتُهُ وضربني زيدٌ، ولا مررتُ بە ومرَّ بي زيد))بەڵکو پێویستە حذف کرێ،کەوابوو دەڵێی((ضربتُ وضربني زيدٌ، و مررتُ ومرَّ بي زيد))،مەگەر مفعولەکە لەبنەڕەتدا خبر بێ،ئەوە لەو کاتەدا دروست نیە حذف کرێ،بەڵکو پێویستە باسکرێ لە کۆتای ڕستەکەوە،کەوابوو دەڵێی((ظَنَّنِي وظننتُ زيداً قائماً إيَّاه)).

هەروەها ناوەڕۆکی قسەکەی ئەوەی لی دەفامرێتەوە کە عاملی دووەم جێناوی بۆ دەهێنری بە ڕەهای:لە حاڵەتی رفع ،ونصب ،وجرّ، کۆڵکە بێ لەبنەڕەتدا،یان کۆڵەکە نەبێ.

* * *

[1] واتا:دانانی جێناو بۆ عاملە لەکارخراوەکە.

[2] لەم ڕستەیەدا فعلی یەکەم((ظَنَّنِي))لەکارخراوە لە هەردوو مفعولی((زيداً قائماً))، وعەمەلی کردووە لە جێناوەکە،کەجێناوی سەربەخۆی((إيَّاه))

[3] واتا:دێڕی ٢٨٢و٢٨٣ی ئەلفیە،کە ڕابورد.

٢٨٤ – وَأَظْهِرِ إِنْ يَكُنْ ضَمِيرٌ خَبَرَا لِغَيْــــرِ مَـــا يُطَابِقُ الْمُفَسِّرَا
٢٨٥ –نَحْوُ أَظُنُّ ويُظُنَّانِي أَخَـا زَيْداً وَعَمْراً أَخَوَيْنِ فِى الرَّخَـا.[٤]

واتا:پێویسته مفعولی فعله لەکارخراوەکە بهێنرێ به ناوی ئاشکرا((ظاهر)) ئەگـەر دروسـت دەبـوو لـەجێناوبوونی نـەگونجان وهاوتـا نـەبوونی لەگـەڵ ئـەوناوەی تەفـسیری دەکات،لەبـەر ئـەوەی لەبنەڕەتـدا خـبره بـۆ شـتێك کـه گونجاوهاوتـا نیـه لەگـەڵ تەفسیرکار((مُفسر))ـەکە،وەکو ئـەوەی ئـەو نـاوه لەبنەڕەتــدا خــبر بــێ بــۆ نــاوێکی تــاك(مفــرد)وتەفــسیرکارەکەی دووان (مثنّــی)بێ،وەکــو نموونــەی((أَظُــنُّ ويَظُنُّــانِي أَخَــا زَيْــداً وَعَمْــراً أَخَوَيْنِ))لێرەدا((زيداً)):مفعول به یەکەمه بۆ فعلی(أَظُنُّ)،وە(عَمْراً):معطوفه بۆ ســەر نــاوی(زیــد)،وە(أَخَــوَيْنِ):مفعــول بــه دووەمــه بــۆ فعلــی(أَظُــنُّ)،وە جێناوی(ی)[٢]:مفعول به یەکەمه بۆ فعلی(يَظُنَّانِي)،وە ئەم فعله پێویستی به مفعــول بــه دووەمــه،جا ئەگــەر مفعــولی دووەمــی بــه جێنــاوی بــۆ بــێنی وبڵێــی((أظـنّ ويظنــاني إيــاه زيــداً وعمــراً أخــوين))لــەم کاتــەدا جێنــاوی ((إياه))هاوتای جێناوی((ی))،لەو ڕوووەوەی هەردووکیان تاك(مفرد)ن،بەڵام هاوتای ئەو ناوه نین که بۆی دەگەڕێتەوه که بریتیه لـەناوی(اخوين)،لەبـەر ئـەوەی جێناوەکـه تاکـه،و(اخـوين)دووانه،لـەم کاتـەدا هاوتـای نیـه لـەنێوان تەفسیرکاروتەفسیرکراو،ئەمەش دروست نیه،وەئەگـەر بڵێی((اظنّ ويظنـاني إياهمــا زيــداً وعمــراً اخــوين))لــەم کاتـــەدا تەفسیرکاروتەفــسیرکراو

---

[١] پوختەی مانای ئەم دوو دێڕەی ئەلفیه:٢٨٤–جێناوەکه بکه به ناوی ئاشکرا ئەگەر ئەو جێناوه له بنەڕەتدا خبر بوو بۆ ناوێك که هاوتای یەکتر نەبوون_وەکو ئەوەی یەکێکیان مفرد بێ وئەوی تریان مثنّی بێ_٢٨٥–وەکو نموونەی((أَظُنُّ ويُظُنَّانِي أَخَـا زَيْداً وَعَمْراً أَخَوَيْنِ فِى الرَّخَـا))واتا:من گومانم وایه وئەو دووانەش گومانیان وایه که زید وعەمر بران له خۆشیدا.

[٢] واتا:جێناوی (ی)لکاو به فعلی((يَظُنَّانِي)).

هاوتان،چونکە جێناوی(إیاهما)دووانە،وناوی(أخوین)یش دووانە،بەڵام لێرەدا هاوتای مفعولی دووەم_کە لەبنەڕەتدا خبرە_لەگەڵ مفعولی یەکەم_کەلەبنەڕەتدا مبتدایە_نامێنێ،چونکە مفعولی یەکەم مفردە،کەبریتیە لەجێناوی یا،وەمفعولی دووەم مفرد نیە،کە بریتیە لە((إیاهما))،بێگومان دەبێ مبتداوخبر هاوتای یەك بن،جا کاتێ هاوتابوون لەگەڵ جێناودا نیە پێویستە ناوەکە بە ئاشکرای بێ،کەوابوو دەڵێی((أَظُنُّ ویَظُنَّانِی أَخَـا زَیْداً وَعَمْراً أَخَوَیْنِ))،لێرەدا((زَیْداً وَعَمْراً أَخَوَیْنِ)):دەبنە دوو مفعولی فعلی((أَظُنُّ))،وە جێناوی(یا)مفعولی یەکەمی((یَظُنَّانِی))یە، وەناوی((أَخَـا))دەبێتە مفعولی دووەمی،لێرەشدا ئەم بابەتە[1]،نابێتە باسی تنازع،چونکە هەردوو عاملەکە عەمەلیان لە ناوی ئاشکرا((ظاهر)) کردووە،ئەمەش بۆچوونی بەصرێکانە.

بەڵام کوفێکان بەدروستی دەزانن هێنانی بە جێناو بەڕەچاوکردنی لایەنی خبر لێدراو،کەوابوو دەڵێی((أظنّ ویظنانی إیاه زیداً وعمراً أخوین))،هەروەها بەدروستی دەزانن حذف کردنی،کەوابوو دەڵێی((أظنّ ویظنانی زیداً وعمراً أخوین)).

* * *

**لێرەدا کۆتای بە بابەتی((التنازع))هات ،وبەکۆتای هێنانی،کۆتای بە بەرگی دووەمی کتێبە دێنین،وبەرگی سێیەمان بریتیە لە((المنصوبات)) ویەکەم باسی بریتیەلە((المفعول المطلق)).إنشاء الله.**

---

[1] واتا:بابەتی((أَظُنُّ ویَظُنَّانِی أَخَـا زَیْداً وَعَمْراً أَخَوَیْنِ)).

خوێنەری بەڕێز:

ئەم کتێبە یەکێکە لەمەوسوعە گەورەکانی زانستی ڕێزمانی عەرەبی، و لەجیهانی ئیسلامیدا بە ناوبانگەو وەرگێڕاوتە سەر زۆرێک لەزمانەکان، بۆیە بەندەش بە پێویستم زانی دەقی کتێبەکە دوو بەشەو ئەلفیەی ابن مالك، شەرح و ڕاڤەکەی ((ابن عقیل)) وەکو خۆی وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، لەگەڵ دانانی پەراوێزو ڕوونکردنەوەی زیاتر لەکات و شوێنی پێویست لە پەراوێزی هەموو لاپەڕەکاندا، تۆی بەڕێزیش پێویستە بەوردی بیخوێنێتەوەو هەوڵ دەی لێی حاڵی بی، بۆ سوودمەنبوون لێی.

خوای گەورە بەختەوەرو سەرفرازی دونیاو دواڕۆژمان بکات

## ئامادەیە بۆ چاپ




